# جەنگی بێدەنگ

## (هەواڵگری و نهێنییەکانی)

نووسەران: ئەبراهام شەلسکی و گاری شمیت

لە ئینگلیزییەوە: سیروان حسێن بیەبی

تیراژ (١٠٠٠) دانە

شوێنی چاپ: چاپخانەی هێڤی - هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان/هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٦٨)ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە

## سوپاس و پێزانین

دەزگای فەرهەنگی هونەری ڕێژیار
مامۆستا نیعمەت شەهاب لە کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، بەشی مێژوو

## ناوەڕۆک

# بەرکوڵ

پاراستنی ئاساییشی نیشتیمانیی هەر وڵاتێک لە سەرووی هەر دەسەڵاتێکی حکومیی ئەو وڵاتەوەیە. لەسەردەمی هاوچەرخ و مۆدێرنەدا، جیهان لە هەموو رووێکەوە پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە دیووە، هەواڵگرییش بێبەش نییە لەم رەوتە. جیهانی هەواڵگریی بەشێوەیەک فراوانە کە دەتوانین بڵێین خۆی لە هەموو کون و کەلەبەری سەر ئەم زەمینەدا دەبینێتەوە. ئەگەر پێناسەیەکی سادەی ئەم چەمکە بکەین دەتوانین بڵێین کە هەواڵگریی "توانایەکە بۆ بەرەوپێشبردنی ئامانجێک یان بەدەستهێنانی ئامانجێک لە ژینگەیەکی ئاڵۆزی چاوەڕواننەکراودا؛ پێکهاتەی هاوبەشی هەموو ئەو دەزگایانەی ئەم کارە دەکەن لە یەک شتدا خۆیان دەبیننەوە، ئەویش نهێنیکارییە."[i] بنچینەی خودی وشەکەش (*Intelligence*) دەگەڕێتەوە بۆسەر زمانی لاتینی؛ بەواتای، "تێگەیشتن لە ڕووداوێکی ئاڵۆز." هەروەها *لاو تزی*(٦٠٤-٥٣١ پ.ز)، فەیلەسوفی چینی، بەم شێوەیە پێناسەی هەواڵگریی دەکات، "ئەو توانایەیە کە مرۆڤ بەهۆیەوە لەیەکتر تێدەگات." و زیاتر دەڵێت، "هەواڵگریی تێگەیشتنە لە ژیریی کەسێک." ئەوەی ناوبراو لێیەوە ئاگادار نەبووە، ئەوە پێشکەوتنە بەرفراوانەیە کە لەم بوارەدا هاتۆتە کایەوە؛ گەشەکردنی ئەقڵیی بەجۆرێک پێشکەوتووە بەقەوڵی کوردا وتەنی، "مێروولە ناتوانێ سەر لە کون دەربێنی بەبێ ئاگاداری دەزگا

---

[i] بڕوانە:

Jeffery, K. (٢٠١٠). *MI٦: the history of the Secret Intelligence Service ١٩٠٩-١٩٤٩*. A&C Black.

هەواڵگرییەکان." بێگومان، تێگەیشتن لە ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراوی داهاتوو وە نهێنییەکانی پشت ڕووداوەکان، بەشێکی هەرە گرنگی کاری هەواڵگرییە. وە، تا زیاتر جیهانی هاوچەرخ بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێت، ئەوەندە زیاتر کاری هەواڵگری پێشدەکەوێت، وە لە بەرامبەریشدا، تووشی بەربەستی فراوانتر دەبێت.

تا سەرەتای سەدەی بیستەم، مرۆڤایەتی لەڕووی زانست و هونەری هەواڵگرییەوە وابەستەبوو بە کۆکردنەوەی زانیاری مرۆیی (بەزۆری سیخوڕیی) و پشت بەستن بە تواناکانی مرۆڤ بۆ بەئەنجامگەیاندن و مەیسەرکردنی ئامانجەکانی (بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا). لە ئێستادا، ئەم کارە خۆی خزاندۆتە نێو چەمکێک کە پێی دەوترێت "هەواڵگری دەستکرد،" واتە؛ هەواڵگرییەک کە سەرچاوەی کۆکردنەوەی زانیارییەکانی بەزۆری بەهۆی شەپۆلی کارۆموگناتیسی، ئامێری مۆبایل، ئینتەرنێت، تەلەفزیۆن، وە ڕادیۆوە بێت. ئەمە، کە جێگای سەرسوڕمان نییە، خۆی لە ماڵ و گیرفانی تاڕاددەیەک هەموو تاکێکی سەر ئەم زەمینە مەڵاس داوە. لە داهاتوودا، دوورنییە کە بایەخی هەواڵگریی لە ڕێگای مرۆڤەوە بەیەکجاری بەرەو پووکانەوە بچێت (سەرەڕای ئەو ڕاستییەی کە تا هەنووکەش- بەتایبەتی لە وڵاتانی جیهانی سێیەم، وەک کوردستان- بایەخێکی سەرەکی پێ دەدرێت. بەڵام کەی؟ تەنیا کات وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە.

ئێمە، لەئێستادا، لە جیهانێکدا دەژین ئیتر مرۆڤ چیتر خاوەنی خۆی نییە! بەو واتایەی کە چیتر شاردنەوەی نهێنییەکان وە ئەنجامدانی چالاکیگەلێک دژبە سیستەمێکی دیاریکراو وەک ئەوپەڕی نهێنیگەرا

دانانرێت. بەهۆی پێشکەوتنە تەکنۆلۆژیەکان، دەزگا هەواڵگرییەکان بە ئاستێک گەیشتوون کە تیایدا دەتوانن چاوەدێری بچووکترین ماددەی سەر گۆی ئەم زەمینە بکەن.

ئاشکرایە، هەواڵگریی لە بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندییەکانی هەر نەتەوەیەکدا ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێت. واتە، مەیدانی جەنگ چەندە گرنگە بۆ بردنەوەی جەنگێک، کۆکردنەوەی زانیاری لەمەڕ ستراتیژیەتەکانی دوژمن بۆ هەمان جەنگ، ئەوەندەی تر سەرکەوتن مسۆگەر دەکات. سیخوڕیی (سیخوڕی مرۆیی، ئەلیکترۆنیی، وە شەپۆلی کارۆموگناتیسی، و پاراسایکۆلۆژیی)[i] یەکێکە لە گرنگترین ئەو چەکانەی بەدرێژایی مێژوو بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمندا بەکارهاتووە. بایەخی سیخوڕ لە پێکهاتەی هەر دەوڵەتێکدا یەکسانە بە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەو وڵاتە، تەنانەت هەندێ جار کەوتنی دەوڵەتێک. سەرەڕای گرنگیی کاری سیخوڕیی، دژەسیخوڕیش لە گرنگیدا دەکەوێتە هەمان خانەوە، واتە، سەرکەوتن لە سیخوڕیدا بەتەنیا دروست نییە بەبێ هەبوونی میکانیزمێکی بەهێزی دژەسیخوڕیی (دژەهەواڵگریی بەشێوەیەکی فراوانتر).[ii]

جۆرەکانی هەواڵگریی، تەنیا خۆیان لە سروشتی پاراستنی وڵات لەهەمبەر هێرشێکی دەرەکیدا وێنا ناکەن، بەڵکو پێویستە هەموو پێکهاتەکانی تری کۆمەڵگاش وەک بەشێک لە پاراستنی ئەو وڵاتە بهێنە هەژمار وە بەوپەڕی وریاییەوە وەک بەشێک لە چوارچێوەی پاراستنی ئاسایشی نیشتیمانیی

---

[i] بڕوانە پەرتووکی (سیخوڕیی بەئامێری سیخوڕیی و لێکۆڵینەوە لە مێشک و پاراسایکۆلۆژی)، نووسینی: ئاماژ جاف، بەرگی سێیەم ٢٠٠٧.

[ii] Bird, K. (٢٠١٤). *The Good Spy: The Life and Death of Robert Ames*. Crown.

لێیان بڕوانین. ئاسایشی کۆمەڵایەتیی، زانستیی، ئابووریی، تەندروستیی، ئەکادیمیی، مێژوویی، سەربازیی، پەروەردەی منداڵان، بازاڕ، ئینتەرنێت، قۆرخکاریی، خۆراک هەموویان بەیەکسانی بۆ هێشتنەوەی وڵاتێک بە بەهێزیی و پاراستنی ئاسایشی نیشتیمانیی زەرورەتی هەر دەزگایەکە لەم بوارەدا کاردەکات. زۆرجار دوژمن ئەو توانایەی نییە لەڕووی سەربازییەوە تواناکانی وڵاتێک پەکبخات، بۆیە پەنا دەباتە بەر میکانیزمی جیاواز کە لێیانەوە دەتوانێت شکست بەسەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگایەک بهێنێت. با کوردستان وەک نموونە وەرگرین، لەم ڕوودلوانەی دواییدا (١٦ی ئۆکتۆبەر)، دوژمن سوودی لە پەرتەوازەیی کورد وەرگرت بۆ سەرکەوتن بەسەر خواستەکانی کورددا ئەو نەتەوەیەدا، ئەوان، بەدڵنیاییەوە، نەیاندەتوانی لەڕووی سەربازییەوە شکست بە کورد بهێنن، هەربۆیە هەڵسان بە بەکارهێنانی لایەنێکی پەرتەوازەی چەکدار، کە چاوساغییان بۆ هاتنەناوەوەی دوژمن بۆناو خاکی کوردستان کرد. نکۆڵی ناکرێت کە ئەمە لە مێژووی کورددا بە ناپاکیەکەی مەزن دێتە هەژمار و شەرمەزاریش بەشێک دەبێت لە مێژووی چەند کەسایەتیەک کە ئەم تاوانە نیشتیمانیەیان ئەنجامداوە. لاوازیی لە بونیادنانی پێکهاتەیەکی پتەو لە بواری سەربازیی، کۆمەڵایەتیی، ئابووریی، کشتوکاڵیی، پیشەسازیی لەماوەی حوکمڕانی ڕابردوودا هۆکارگەلێکی گرنگ بوون لەم شکستە مەزنە (تائێستا شکستە، دەکرێت هاوسەنگیەکان لەماوەی داهاتوودا بگۆڕێن)، گەرچی ئەنجامەکانی ریفراندۆم دەسکەوتی مێژوویی بوون.

لە کۆتاییدا، دەمەوێت بڵێم کە هۆکاری هەرە گرنگی وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە لە سۆنگەی بەرپرسیارەتی نیشتیمانیەوە هەڵقوڵاوە؛ وەک

ئەرکێک بۆ تێگەیشتن لە جیهانی شاراوەی هەواڵگریی کە جیهانی ئەمڕۆی لەسەر بنیاد دەنرێت. کوردستانیش، وەک نیشتیمانی دایک، دەبێت خۆی لەم چوارچێوەیەدا بەهێزبکات بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی وە دەوڵەتی داهاتووی کوردستان. ئەم پەرتووکەی بەردەستی ئێوەی هێژایان، شیکردنەوەیەکی کورتە لە جیهانی بەرفراوانی هەواڵگرییدا. هەروەها، ڕێنیشاندەرێکی شایستە دەبێت لە قوڵبوونەوەی زیاتری دەزگاکانی پەیوەستدار بەم بوارە لە ئاشنابوونیان لە هونەرەکانی ئەم جەنگە شاراوەیە، بەتایبەتی لە مەودای دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکادا.
نامەوێت زیاتر لەمە باس لە پەرتووکەکە بکەم، بۆیە فەرموون ئێوە و جیهانی نهێنی هەواڵگریی.

سیروان حسێن بیەیی

کانوونی دووەمی ٢٠١٨/گوندی بین، دەڤەری بارزان

## دەروازە: نووسینی نهێنییەکان

لەماوەی دوا چارەگی سەدەی بیستەمدا، هەواڵگری- سەرەڕای ئەو ڕاستیەی کە نهێنیگەریی وەک یەکێک لە تایبەتمەندییە هەرە گرنگەکانی دەمێنێتەوە- بەشێوەیەکی ئاسایی لە هەواڵەکانی ڕاگەیاندن باس دەکرێت و بۆتە بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی بەرچاوی ئەکادیمی و نووسین. گفتوگۆی کراوە دەربارەی پرسە هەواڵگرییەکان چیتر بابەتی ئابڕووبەر نین؛ بەڵکو وەک بەشێکی ئاسایی دیبەیتی کراوە دەربارەی چالاکیەکانی حکومەت، بەشێوەیەکی گشتی، پەسەندکراوە.

هەرچەندە گفتوگۆی گشتی ڕووداوە هەنووکەییەکان لە جیهانی هەواڵگرییدا بەشێوەیەکی فراوان لەسەر دزەکردنی زانیاری نهێنی دەزگایەکی هەواڵگریی ڕۆدەنرێت، بابەتی ئەکادیمی دەربارەی هەواڵگریی لە پەرەسەندن و زیادبوونی خێرادایە. تەنیا تێپەڕبوونی کات بۆتەهۆی ئەوەی ئاشکرابوونی چەندین بەڵگەنامەی نهێنی مێژوویی دەربارەی جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم. سەرەڕای ئەمەش، کەوتنی شوعیەت لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران و ئەورووپای ڕۆژهەلات بووەهۆی ئەوەی توێژەران دەستیان بە ئەرشیفەکانیان بگات، بەتایبەتی لە ئەڵمانیای ڕۆژهەلاتی جاران وە، بەشێوەیەکی کەمتر، ڕووسیا.

زیادبوونی گفتوگۆی کراوەی پرسە هەواڵگرییەکان بەشێوەیەکی گشتی، نەبۆتە هۆی تێگەشتنێکی باشتری هەواڵگریی. لەڕاستیدا، گفتوگۆی ئەم دواییانەی هەواڵگریی پرسێکی هەرە گرنگی فەرامۆشکردووە دەربارەی ڕۆڵی گونجاوی هەواڵگریی و نهێنیگەریی لە سیستەمی دیموکراسیدا. بەشێوەیەکی گشتیتر، جگە لەو بەڵگەنامانەی ئاشکرابوون، کە هاوشان

بوون لەگەڵ دوا هەوڵی گرنگ لەلایەن کۆنگرێسی ئەمریکا بۆ "چاکسازی" هەواڵگریی (لە سەرەتای ساڵانی نەوەدەکاندا)، بەشێکی زۆری مامەڵەی گشتی پرسە هەواڵگرییەکان، کە لە سروشتدا مێژوویی نەبوون، باسی کەیسی تایبەتی سیخوڕیی بوون.

ئەمە پێچەوانەی نووسینەکانی پێشووترە دەربارەی هەواڵگریی کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکان. لەوکاتەدا، گفتوگۆیەکی زۆر هەبوو دەربارەی هەواڵگریی، بەتایبەتی لە ئەمریکا، وە پەیوەندی بە دیموکراسیەت و ڕۆڵی ئەو دەزگایانە لە ئاراستەکردنی پرسە نیشتیمانیەکان لە حکومەتی دیموکراسیدا کە دەبوایە نهێنیگەریی بەشێوەیەک لە شێوەکان بەڕووی خەڵکدا ئاواڵا، بەشێوەیەکی گشتی نا، بکرێت. لەم سەینوبەینەشدا، دوو بۆچوون هەبوو لەنێو ئەکادیمیست و نووسەرانی ئەم بوارەدا.

بۆچونێک دەڵێت، هەواڵگریی بوو، یان هیچ نەبێت دەبوایە ببێت، بە پرسێکی کەمتر لە فرۆفێڵ و تەڵەکەبازیی و سیخوڕیی، وە زیاتر وەک لقێکی زانستە کۆمەڵایەتیەکان بوو، کە ئامانجی ئەوەیە پرسە سیاسیی، ئابووریی، وە سەربازیی شیبکاتەوە وە لەکۆتاییشدا، لەسەر بنەمای ئەو شیکردنەوەیە، پێشبینی داهاتوو بکات. بەم پێیەش، پێویستی نەدەکرد هەوڵ و تەقەلایەکی ئاوا نهێنیی بێت. لەکاتێکدا هەندێ نهێنیگەریی پێویستە بۆ پاراستنی سەرچاوەکانی زانیاری هەستیاری گرنگ سەبارەت بە بابەتی سیاسیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، تەکنەلۆژی و دیموگرافی کە

دەبنە هۆی ئاراستەکردنی ڕەفتاری وڵات، نەدەبوایە نهێنیی بن.[i] بەم شێوەیەش، نەک تەنیا پرسە هەواڵگریەکان دەبوایە بەشێوەیەکی ئاشکرا و بەبێ بەربەست باسبکرێن بەڵکو گفتوگۆی ئاشکرای هەواڵگریی دەکرێت هۆکارێکیش بێت، بەهۆی لابردنی پەردەی ناڕوونی هەواڵگریی وە هاندانی شەپۆلی بۆچوونەکان لە نێوان کۆمەڵگای هەواڵگریی و ئەکادیمیی، بۆ یارمەتیدانی پێشکەوتنی بواری هەواڵگریی بەرەو ئامانجە گونجاوەکەی بەبوونی بە زانستێکی زیاتر کۆمەڵایەتیی.

بەپێی بۆچوونەکەی تر، ئامانجی نووسینی گشتی دەربارەی هەواڵگریی بریتیی بووە لەوەی کارە خەراپ و نادروستەکان ئاشکرا بکات بۆ ئەوەی هاوکار بێت لە دروستکردنی گۆڕان بەرەو باشتر، بەو ڕێگایەی دەزگاکانی هەواڵگریی کاردەکەن.[ii] لەم بۆچوونەوە بۆمان دەردەکەوێت، نهێنیگەریی کە دەزگاکان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن یان هۆکاری ئەو بەدکاریە بووە یانیش پێشمەرجێکی پێویستیان بووە؛ هەربۆیە، خودی باسکردنی ئاشکرای هەواڵگریی بەشێک بووە لە چارەسەر. هەر ج زیانێک لە لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی نهێنی یاسایی بە زیانی بچووک لەقەڵەم دەدرا بە بەراورد لەگەڵ ئەو زیانەی کە خودی دەزگا هەواڵگرییەکان، بە کارکردن لە پشت پەردەوە، بە وڵاتی دەگەیەنن. هەر بۆیە، ئاشکراکردنی نهێنی

---

[i] شێرمان کێنت لە پەرتووکە بەناوبانگەکەیدا بە تێروتەسەلی باسی ئەم بابەتەی کردووە، وە دەکرێت بڵێین کە ڕەگی ئەم بیرۆکە دەگەڕێتەوە بۆ کارەکانی ئەم بیرمەندە لە کۆتایی ساڵانی چلاکاندا. بڕوانە:

Kent, S. (٢٠١٥). *Strategic intelligence for American world policy.* Princeton University Press.

[ii] Victor Marchetti and John D. Marks, *the CIA and the Cult of Intelligence* (New York: Knopf, ١٩٧٤), ٤, ١٢.

دەربارەی دەزگایەکی هەواڵگری "دواکەوتوو" کێشەدار نەبوو؛ ڕوون نییە کە نووسەرانی ئەم بۆچوونە چیان وتووە دەربارەی گفتوگۆی ئاشکرای دەزگایەکی هەواڵگریی "پێشکەوتوو." لەم دواییانەدا، سەرنجی سەرەکی هەرەمەزنی توێژینەوەی ئەکادیمیی و نووسین خرایەسەر نموونەی مێژوویی چالاکیە هەواڵگرییەکان. گفتوگۆی پرسی نوێتر زیاتر جەخت لەسەر گێڕانەوەی بەسەرهاتی سیخوڕیی دەکاتەوە.

پەرتووکی جەنگی بێدەنگ باس لە پرسگەلی جیاوازی دەکات. ئەم پەرتووکە هەوڵدەدات باس لە بیرۆکەی بنچینەیی تێگەیشتن لە جیهانی هەواڵگریی بکات. ئامانجەکە بریتییە لەوەی کە وا لە خوێنەر بکات بیربکاتەوە دەربارەی پرسە گشتیەکانی سیاسەتی هەواڵگریی بەشێوەیەک کە دادپەروەرانە مامەڵە لەگەڵ ئاڵۆزیی و نادیاریی بابەتەکە بکات. بەم پێیەش، بابەتەکان بەشێوەیەکی تیۆری خراونەتە ژێر تەلەسکۆپی لێکۆڵینەوە؛ واتە ئەو بەڵگەنامانەی بەردەستن دەربارەی چالاکیە هەواڵگرییەکان بۆ شیکردنەوەی خاڵە گشتییەکان بەکارهاتوون؛ هیچ هەوڵێک نەدراوە بۆ ئەوەی تەواوی نموونە مێژووییەکانی هەواڵگریی یان دۆخی هەنووکەیی ئەو بوارە باس بکرێت.

هەر لەبەر ئەم هۆکارەشە کە هەموو ئەو بابەتانەی لەم پەرتووکەدا پشتیان پێبەستراوە سەرچاوەکەیان لەو زانیاریانەوە ڕۆنراوە کە باس لە چالاکیە هەواڵگرییەکان دەکەن. هیچ هەوڵێک نەدراوە ئەو داتایانە بخرێنە بەرباس کە پێشتر بۆ خەڵکی ئاسایی بەردەست نەبووبن. بەشێکی هۆکارەکە لەبەر ئەوەیە کە ئێمە ڕێگامان پێدرابوو بۆ دەستگەیشتن بە زانیاری هەواڵگری نهێنیی بە پەیوەندی لەگەڵ چەندین پێگە لەناو حکومەتی ئەمریکیدا (هیچ

پەیوەندیمان لەگەڵ هیچ دەزگایەکی هەواڵگریی نەبووە). وەک مەرجی پێشوەختەی دەستگەیشتن بەو زانیاریانە، ئێمە بەڵێنماندا هیچ لەم زانیارییە نهێنیان نەدرکێنین لەم پەرتووکەدا.[أ]

گرنگتر لەمەش، ئێمە "نهێنپارێزیی" وەک بەشێکی گرنگی ئۆپەراسیۆنی هەواڵگریی دەبینین وە بڕوامان وانیە کە بڵاوکردنەوەی ناوەڕۆکی ئەم چالاکیانە سوود بە دەزگاکانی هەواڵگری ئەمریکا دەگەیەنێت. بڕێکی زۆری ئەم زانیاریانەی کە باسکراون لەم پەرتووکەدا جێگای مەترسی نین بۆسەر سیاسەتی گشتی یان پێویست بن بۆ تێگەیشتنی بیرۆکەی گرنگی هەواڵگیی، کە ئامانجی ئەم پەرتووکەیە.

ئەگەر هەواڵگریی ببێتە بوارێکی دیاری توێژینەوەی ئەکادیمیی، چارەسەرە تیۆرییەکەی هەر بەبێ ئەنجام دەمێنێتەوە. لەم پەرتووکەدا، ئێمە هەوڵدەدەین ئەو کەموکورتییە کەم بکەینەوە. لەهەمانکاتدا، ئێمە درک بەوە دەکەین کە ئەو پشتبەستنە سەرەکیەی ئەم پەرتووکە بە ئەزموونی ئەنگلۆ ئەمریکی وادەکات ئامانجی گشتی "تیۆری هەواڵگریی" نەپێکێت. ئەم پشتبەستنە ئەستوورە بە سەرچاوەی ئەمریکی، کە جێگای سەرسوڕمان نییە، بێگومان هۆکارەکەی ئەوەیە ئەمریکا وڵاتێکی کراوەیە لە ڕووی دیموکراسیی و ئاشکراکردنی بەڵگەنامە بۆ ڕای گشتی،

---

[أ] ئەم پەرتووکە، بەرلەوەی بیردرێتە چاپخانە، بۆ ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندی (سی ئای ئەی) وە کۆمیتەی هەڵبژێردراوی هەواڵگریی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا نێردراوە بۆ ئەوەی لایەنی پاراستنی ئاسایشی ئەمریکا لەبەرچاو بگیرێت وە هەر مەترسیەک بۆ سەر ئاسایشی ئەم وڵاتە هەستی پێ بکرێت، بەخێرایی نووسەران ئاگادار بکرێنەوە.

بەپێچەوانەی وڵاتانی ترەوە کە کەم تا زۆر ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی ئەم زانیاریانە دەکەن. سەرەڕای ئەمەش، لە هەر شوێنێک باس لە هەواڵگری کۆمەڵگاکانی تر کرابێت، ئێمە هەڵساوین بە ئاماژەدان بە وڵاتە و باسکردن لە سروشتی حوکمڕانیی و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ نهێنیەکانیدا.

لەکۆتاییدا، دەمانەوێت بەڕوونی بڵێین کە ئەم پەرتووکە بە هیچ شێوەیەک زانیاری نهێنی یان "زانیاری ناو دەزگایەک" بەخوێنەر نابەخشێت، نە لەڕووی شکاندنی لایەنێک کە شکستی هێناوە، وە نە بۆ بەرزکردنەوەی دەزگایەکی تر کە لە چالاکیەکانی خۆیاندا سەرکەوتوو بوون. ئێمە هیواخوازین لەجیاتی ئەمە چوارچێوەیەکی تێگەیشتن لە خودی هەواڵگریی بکاتە بەرچاو ڕوونیەک بۆ ئەو کەسانەی لە بواری هەواڵگرییدا کاردەکەن وە دەروازەیەک بێت بۆ زیاتر ئاشناکردنی توێژەرە ئەکادیمیەکان لە بواری ئاسایشی نیشتیمانیی و هەواڵگرییدا.

لە بیدگا و خەیاڵی ئاسایی خەڵکەوە، هەواڵگریی هەمیشە هاووتایە لەگەڵ سیخوڕیی و تەڵەکەبازیی، بە بەکارهێنانی سێکس وەک ئامرازێکی وەرگرتنی زانیاریی و لەکۆتاییشدا چاوسورکرنەوە لە ئەنجامدەرانی ئەم کارە وەک هەڕەشە بەکاردەهێنرێت ئەگەر هاتوو زانیاری پێویست نەبەخشن. بێگومان، هەرچەندە ئەم جۆرە چالاکیانە خاوەنی جێگەوپێگەی خۆیانن لەناو جیهانی هەواڵگرییدا، بەڵام تێگەیشتن لە چەمک و واتای هەواڵگریی زۆر لەمە فراوانتر و دەوڵەمەندترە. بۆ ئەوەی لە گرنگی ئەم چەمکە دەوڵەمەندە تێبگەین، دەتوانین بە لێکدانەوە و تێڕامانی پێکهاتە جیاوازەکانی ئەم دیاردەیە دەستپێبکەین کە چەمکی "هەواڵگریی" تیادا بەکارهاتووە؛ ئەمەش لە چەند جۆرێکی تایبەتی زانیاریی، چالاکی وە ڕێکخستنەکان پێکدێت.[أ]

---

[أ] پێویستە کارمەندی هەواڵگری بە پلەی یەکەم دڵسۆزی وڵاتەکەی بێت و ویژدانی زیندوو بێت، ڕاستگۆو داوێنپاک بێت لەوانەیە ڕووبەڕووی جۆرەها کارلێک کردن بێتەوە لەکاتی کارکردنیدا وەک: پارەی زۆر و ئافرەتی جوان و بەڵێن و پەیمان، ئەگەر بەرگری سروشتی نەبێت دژی ئەم جۆرە شتانە و خەریکی ڕابواردن بوو کارەکەی پشتگوێخست دەوڵەتەکەی سوودی لێنابینێت، بۆیە زۆر گرنگە بایەخ بەم لایەنە بدرێت لەکاتی هەڵبژاردنی کەسێک بۆ کارکردن لە هەواڵگریدا.

هەواڵگری بریتییە لە زانستی دەستخستنی زانیاری بۆ دەزگا و پێکهاتەیەکی حکومەتێک بۆ پێشخستن و پاراستنی بەرژەوەندییە نیشتیمانیەکانی و ئاگاداربوون و لەکۆتاییشدا لەناوبردنی ئەو هەڕەشانەی لەلایەن دوژمنانەوە دەکرێنە سەر وڵاتێکی دیاریکراو. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، ئەم زانیاریانە پێویستە پەیوەندی و سەروکاریان هەبێت بە

---

هەروەها پێویستە لەسەر دەوڵەتەکەی موچەی هەواڵگوی بەشێوەیەک دیاری بکات تابتوانێ لە ئاستێکدا بژی کە تووشی قەرزاریی و کارلێکردنی دوژمن نەبێتەوە، هەروەها پێویستە لەسەر بەرپرسەکانی هەواڵگریی گرنگی تایبەتی بدەن بە کارمەندەکانیان هەریەک بە جیا، گرنگیدان بە کێشەکانیان و یارمەتیدانیان بۆ چارەسەرکردنی تا هەموو تواناکانیان بۆ کارەکانیان بخەنەگەڕ، پاشان لەسەر دەوڵەتە کە پاداشت بدات بە هەر کارمەندێکی هەواڵگریی کە هەڵدەستێ بە ئاشکرا کردنی مەترسییەک کە هەڕەشە لەسەر ئاسایشی وڵات دەکات جا سیخوڕی بێت یان کاری تێکدەرانە یان پڕوپاگەندەی نادروست بۆ تێکدانی ڕیزەکانی گەل وەک هاندانێک بۆ خۆی و بۆ هاوڕێکانی بۆ بەرزکردنەوەی وورەیان.
هەروەها هەندێک ئەرک و سیفەت هەیە کە پێویستە کارمەندی هەواڵگری پابەندی بێت بێنەوەی داوای لێبکرێت وەک ئەوەی ببێت بە نموونەی ڕەوشت بەرزی لە هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ هاوڵاتیاندا تا ڕەزامەندی هاوڵاتیان بەدی بێت دەربارەی هەواڵگری وڵاتەکەی. هەروەها پێویستە نهێنی کارەکەی بپارێزێت و بە هیچ شێوەیەک لای خزم و کەس وکارەکەی باسی ئەو ئەرکانە نەکات کە پێی دەسپێردرێت، پێویستە لەسەری کە بەپێی توانا نەهێڵێت کە خەڵک بزانن کە لە هەواڵگریی کاردەکات تا ئەو دەرفەتەی لە کیس نەچێت لە ئاگاداربوونی لەو مەترسیانەی کە هەڕەشە لە وڵاتەکەی دەکەن، لە کۆتاییدا نابێت بەو دەمانچە تایبەتییەی کە پێیەتی خۆی دەربخات چونکە ئاشکرا بوونی جۆری ئەو چەکە بەسە بۆ ئەوەی کە بزانرێت کە خاوەنەکەی کارمەندی هەواڵگرییە.

بابەتە سەربازییەکان، وەک توانای دوژمن و پلانی چالاکیيە سەربازییەکانی. نەیاری شاراوە یان ئاشکرا ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان بەگەڕ دەخەن بۆ ئەوەی ئەم جۆرە زانیارییە بە نهێنی و شاراوەیی بمێننەوە. بێگومان، دەکرێت جۆرەکانی تری زانیاری نهێنیش بەهەمان پێودانگ گرنگ بن؛ بۆ نموونە زانیاری دەربارەی چالاکیيە دبلۆماسییەکان یان مەبەست و پلانەکانی وڵاتێکی تر، و چالاکیيە هەواڵگرییەکانی.

سەرەڕای کۆکردنەوەی ئەم زانیاریانە، ژمارەیەکی بەرچاوی جۆری تری زانیاریی دەربارەی چالاکییەکانی دوژمنێک سوودی دەبێت ئەگەر دەستمان پێیان بگات، تەنانەت ئەگەر بێتوو ئەو نەیارە هەوڵیش نەدات ئەم زانیاریانە بە نهێنی بهێڵێتەوە. ئەو زانیاریانە لە کاروباری سیاسەتی ناوەخۆ و پێشکەوتنی کۆمەڵگا و ئابووریی و ئامارەکانی بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی ڕێژەی دانیشتوان پێکدێن. تا چ ئەندازەیەک ئەم زانیارییانە بڵاوکراوەنەتەوە، ئەوە دەگەڕێتەوە سەر سروشتی ڕژێمە سیاسییەکە. لە کۆمەڵگایەکی دیموکراسیدا، ئەم زانیاریانە نزیکەی هەموو کاتێک بەردەستن بۆ ڕای گشتی جەماوەر. لەلایەکی ترەوە، سیستەمێکی خۆسەپێنی و دیکتاتۆریی هەوڵی زۆر دەدات بۆ ئەوەی هەر زانیارییەکی دەربارەی سیاسەتی ناوەخۆیی، پێشکەوتنە ئابوورییەکان، یان هەر زانیاریی و سەرەداوێک کە دوژمن سوودی لێوەرگرێت دزەبکەن. بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئەگەر هاتوو ئەم زانیارییە بەردەستانە وەک زانیاری "هەواڵگریی" لە قەڵەم بدرێن یان نا، بێگومان دەبێت پرۆسەیەک هەبێت کە بەشێوەیەکی سیستەماتیک لەلایەن دەسەڵاتدارانی حکومەتەوە

دروستکراوە بە شێوازێک کە سوود و مفای هەبێت. کار و ئەرکی دەزگا هەواڵگرییەکانە بەزۆری ئەمەیە.
لە کۆتاییدا، زانیاری هەواڵگریی تەنیا لە زانیاری گرنگ و سەرەکی پێک نایەت کە بەهۆی کاری سیخوڕیی یان شێوازەکانی کۆکراونەتەوە بەڵکو لەو شیکردنەوە و خەمڵاندنانەش پێکدێت کە لەسەری ڕۆنراوە. لەم بەرهەمە هەواڵگرییەدا، کە زۆربەی جار بە هەواڵگری "ئەنجام" ناودەبرێت، بەهایەکی ڕاستەوخۆی بۆ داڕێژەرانی سیاسەت هەیە. مەودای ئەم جۆرە بەرهەمە هەواڵگرییانە، بەهەردوو زانیاری ئاشکرا و نهێنیی، لە دەزگایەکی هەواڵگریی بۆ یەکێکی تر جیاوازە.
وەک چالاکیەک، هەواڵگریی لە کۆکردنەوە و لێکدانەوەی زانیاری هەواڵگریی پێکدێت. هەروەها لەو چالاکیانەش پێکدێت کە ئەنجام دەدرێن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی چالاکیە هەواڵگرییەکانی دوژمن، جا چ بە ڕێگرتنیان بێت لەوەی دەستیان بە زانیارییەکان بگات یانیش هەڵیان بخەڵەتێنێت دەربارەی ڕاستیەکان و گرنگی ئەم زانیاریانە.
بەم شێوەیە، هەواڵگریی چالاکی زۆرروزەوەند لەخۆ دەگرێت. بۆ نموونە، چەندین ڕێگا هەن بۆ کۆکردنەوە و بەدەستهێنانی زانیاریی، وەک سیخوڕیی، وێنەگرتنی سەتەلایت، بڕین و چوونە ناو سیستەمی گەیاندن، لێکۆڵینەوە لەو بەڵگەنامانەی لەژێر دەستی ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، و ئینتەرنێت. هەروەها تەکنیک و هونەری جیاواز هەن بۆ شیکردنەوەی ئەو زانیاریانەی کە کۆکراونەتەوە: ڕەنگە هەندێک لەم زانیاریانە یەکسان بن بەو میتۆدانەی زانستی کۆمەڵایەتی بەکاریان دەهێنێت، لەکاتێکدا ئەوانی تر، وەک کردنەوەی کۆدی زانیاریی نامەیەک کە تێگەیشتنی بۆ کەسانی

ئاسایی ئەستەمە، ئەم جۆرە کارانە تایبەتن بە کەسانی دیاریکراوی جیهانی هەواڵگرییەوە. بەهەمان شێوە، ڕێگرتن لە دزەکردنی زانیاری بۆ لایەنی بەرامبەریش لە چەندین چالاکی جۆراوجۆر پێکدێت، هەندێکیان وەک کاری سەپاندنی یاسا وان، وەک لێکۆڵینەوە و شوێنپێ هەڵگرتنی کەسێکی گومانلێکراوی هەواڵگری بیانیی بۆ ئەوەی زانیاریان دەست بکەوێت دەربارەی چالاکیەکانیان. هەندێکیان شاراوە و نادیارن، وە چەند کەسێکی کەم لێیان تێدەگات، وەک بەکارهێنانی کۆد بۆ پاراستنی زانیاری گەیاندن (هەرچەندە پێشکەوتنەکانی هاوچەرخ لە تەکنەلۆژیای زانیاری لە ئێستادا توانیویانە ڕێگاکانی شکاندنی ئەم کۆدانە بەرامبەر بڕە پارەیەکی دیاریکراو بشکێنن و بەئاشکرا کاری خۆیان بکەن). لەکۆتاییشدا، جێگای ئامەژەپێدانە کە چەندین ئامرازی پێشکەوتوو لە ئێستادا بەردەستن بۆ ئەوەی فێڵ لە دوژمن بکەین، وەک ئۆپەراسیۆنی سیخوڕی دووسەرە[i] و بلاوکردنەوەی زانیاری هەڵە و ساختە (بەواتایەکی تر، بەڕێلابردنی ئەو پەیامانەی کە کەسێ دەیاننێرێت، بەو ئامانجەی کە دوژمنەکەی دەتوانێت دەستی پێ بگات و لەئەنجامدا بڕوای پێ بهێنێت).

بەلەبەرچاوگرتنی ئەم هەموو چالاکیانە، کارێکی قورسە ڕێگایەکی هاوبەش بدۆزینەوە بۆ ئەوەی بەیەکەوە بیانبەستینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، هەموویان سەروکاریان بە بەدەستهێنان و ڕێگاگرتن لە دزەکردنی زانیارییەوە هەیە. هەربۆیە، دەتوانین ئاماژە بەوە بدەین کە هەواڵگریی وەک چالاکیەک

---

[i] ئەو سیخوڕەیە کە لە یەک کاتتدا بەنهێنی کار بۆ دوو دەزگای هەواڵگریی دەکات، بەڵام لە بنچینەدا تەنیا مەبەستی ئەوەیە سوود بە یەکیان بگەیەنێت کە لەگەڵیدا هاوسۆزە یانیش لە بەرامبەر بڕە پارەیەکی بەرچاو بۆ ئەو کارە وەردەگرێت یاخود لە ئایدۆلۆژیەتدا یەکناگرنەوە. (وەرگێڕ)

دەتوانرێت بە پێکهاتەکانی خەبات و تێکۆشان لە نێوان نەیاران کە بەشێوەیەکی سەرەکی سەروکاری لەگەڵ وەرگرتنی زانیاریدا هەیە، پێناسە بکرێت (بۆ نموونە، دەکرێت ئەو هەوڵانە خۆیان لە ڕکابەری ئابووریی، مانۆڕی دبلۆماسی یان گفتوگۆ، یانیش هەڕەشە یان بەکارهێنانی هێزی سەربازییدا ببیننەوە).

هەروەها چەمکی "هەواڵگریی" بریتیشە لە ڕێکخستنێک کە ئەم چالاکیانەی سەرەوە ئەنجام دەدات. یەکێک لە دیارترین تایبەتمەندیەکانی ئەم جۆرە ڕێکخستنانە بریتییە لە "نهێنیگەریی" کە دەبێت بپارێزرێت لەو کاتەی دەزگایەکی هەواڵگریی خەریکی بەجێگەیاندنی ئەم جۆرە چالاکیانەیە. ژمارەیەکی زۆر ڕێگای ئەم جۆرە ئۆپەراسیۆنانە، وەک بەکارهێنانی سیخوڕی پەنهانی[i] یان یاسای توند سەبارەت بە چوونەناو زانیاریەکانەوە لەم پێویستیەوە داڕێژراون. لەبەر ئەوەی دەزگاکانی هەواڵگریی ڕێکخراون بۆ ئەوەی تواناکانی خۆیان بەرەوەپێشەوە بەرن بۆ بەدەستهێنان و پاراستنی نهێنیی، ئەوان سەرباری کاری زانیاری بەرپرسیاریەتی ئەوەشیان پێدراوە بۆ ئەوەی کار بکەن بۆ ئەنجامدانی چالاکی نهێنیی بۆ بەرەو پێشبردنی ئەجێندا و ئامانجی سیاسەتی دەرەوەی حکومەتەکانیان بەشێوەیەکی زیاتر ڕاستەوخۆ.

---

[i] ئەو سیخوڕەیە کە بۆ حکومەتێکی دیاریکراو کار دەکات بۆ بەدەستهێنانی زانیاری دەربارەی دوژمنەکانی، بەزۆری خۆی دەخزێنێتە نێو ڕیزەکانی دووژمن (وە جاروباریش هاوکاریان دەکات) بۆ ئەوەی متمانە بەدەست بهێنێت و دواتر زانیاریەکان دەگوازێتەوە بۆ لایەنی یەکەم. (وەرگێڕ)

ئەم جۆرە چالاکیانە لە وشەسازیی هەواڵگریی ئەمریکیدا پێیان دەوترێت "چالاکی پەنهانی"، وەک بەخشینی هاریکاری شاراوە بە حکومەتێکی بیانی دۆست و هاوپەیمان بۆ ئەوەی وانیشانی بدەن ئەو حکومەتە (بێگومان بۆ بەرژەوەندی خۆی) بەهێزە، وە لەکۆتاییشدا دانانی پیلانی لەناوبردنی حکومەتێکی نەیار. هیچ جیاوازیەکی نییە ئەگەر ئەم جۆرە کارە بدرێتەپاڵ هەمان ئەو رێکخستنەی کە زانیاری هەواڵگریی کۆدەکاتەوە و دواتر شیان دەکاتەوە. تەنانەت ئەگەر دەزگا هەواڵگرییەکان بەرپرسیاریەتی چالاکی پەنهانییان پێ بدرێت، پرسیاری گەورەتر لە رووی کرداریی و تیۆرییەوە کە ئایا چالاکی پەنهانی وەک بەشێکی هەواڵگری دابنرێت یاخود نا، هەر بەجێگای مشتومڕ دەمێنێتەوە.

## چوارچێوە و مەودای هەواڵگریی

لەبەر ئەوەی نەک تەنیا حکومەت بەڵکو ژمارەیەکی زۆری جۆری تری رێکخستنەکان لە ژینگەیەکدا کاردەکەن کە رکابەریی و خۆسەپێنی بەشێکی دانەبراویەتی، چەمکی هەواڵگریی دەکرێت لەسەر ئەمانەش جێبەجی ببێت. بۆ نموونە، هەندێ توێژەر ئەو چەمکە زیاتر فراوان دەکەن بۆ بوارەکانی کۆمپانیا بازرگانیەکان، وە وەک "زانیاری رێکخراو... دیزاینکراو بۆ ئەوەی وەڵامێکی جددی و گونجاو بێت بۆ داڕشتنی سیاسەتی کۆمپانیا و پرۆژەیەکی دیاریکراو مامەڵە لەگەڵ هەواڵگرییدا دەکەن."[i] بەهەمانشێوە، دەکرێت کاری هەواڵگریی پارتێکی سیاسیی یان

---

[i] Loch K. Johnson, "Smart Intelligence," *Foreign Policy,* no. ٨٩ (Winter ١٩٩٢–٩٣): ٦٠–٦١.

هەڵمەتێک بۆ زانینی ئەوەی کە لایەنی ئۆپۆزسیۆن خەریکی چییە، لەم چوارچێوەیەدا لەقەڵەم بدرێت.

ئەم جۆرە فراوانکردنەی چەمکی "هەواڵگریی" لەم پەرتووکەدا باسیان لێوە نەکراوە، کە بەشێوەیەکی ئاسایی تەنیا باسی هەواڵگریی ئاسایی دەکات و لەم چوارچێوەیە تێناپەڕێت- ئەمە بەو واتایە دێت کە تەنیا ئەو زانیاریی و چالاکیانەی تایبەتن بە ئاسایشی نیشتیمانی حکومەتەکان سەرنجیان خراوەتەسەر.

بەڵام تەنانەت بە پەسەندکردنی ئەم سنووردارییەی چەمکی هەواڵگریی، چوارچێوەکەی بە جۆرێک لە جۆرەکان هەر بە ناڕوونی دەمێنێتەوە، چونکە خودی چەمکی "ئاسایشی نیشتیمانی" پێناسەنەکراوە. مانای سەرەکیەکەی دەبێت سەروکاری هەبێت بە پاراستنی نیشتیمان لەدژی هەر هەڕەشەیەک کە مەترسی بێت بۆسەر وڵاتێک، بەشێوەیەکی سەرەکی هەڕەشەی سەربازیی لەلایەن وڵاتە بیانییەکانەوە. کاتێک نەتەوەیەک داگیردەکرێت یان خەریکە داگیر بکرێت، کێشەکانی ئاسایشی نیشتیمانی ئەو وڵاتە دەکرێنە چەقی ئامانجی ئەو وڵاتە بۆئەوەی خۆی لە شکست بپارێزێت یان ڕێگا لەو داگیرکردنە بگرێت وە ئاسایشی خۆی بەرقەرار بکات لە دژی حاڵەتی هاوشێوە کە دەکرێت لە داهاتوودا ڕووبدەن. لەکاتە کەمتر مەترسیدارەکاندا، ڕەنگە کەمتر ڕوون بێت کامە نەتەوەی بیانی، ڕووداو، یان بارودۆخ دەبنە هەڕەشە لەسەر ئاسایشی نیشتیمانی وە بەم پێیەش پێویست بە وشیاریی و ئاگاداری دەزگاکانی هەواڵگریی ئەو نەتەوەیە دەکات.

گرفتەکە زیاتر قوڵ دەبێتەوە بەهۆی ئەو ڕاستیەی کە بەرژەوەندی ئاسایشی نیشتیمانی، وە بەم پێیەش هەڕەشەکانی سەری، ناکرێت بەشێوەیەکی سەربەخۆییانەی جۆری نەتەوەی حکومەت (یان ڕژێم) وە ڕوانینی ئایدۆلۆژیاکەی لەقەڵەم بدرێت. هەرچەندە بینینی واقیعبینانە وادەردەکەوێت کە بەرژەوەندیە نیشتیمانیەکان بەهۆی فاکتەری سیستەمی نێونەتەوەیی، ڕامانی ئایدۆلۆژی، وە زیاتر کولتوری سیاسی وڵاتێک دیاریدەکرێت، وە ئەمەش لەوە ڕەنگ دەداتەوە کە چۆن حکومەتێک تێیان دەگات.[i] بۆ نموونە، دەکرێت کارەکتەری ڕژێمێکی ئایدۆلۆژی ئەوە دیاربکات کە ئایا وڵاتێکی بیانی وەک هەڕەشەیەک دەبینێت یان نا. دەبێت لەم سەردەمەدا ئەوە لەبەرچاوبگیرێت کە دۆخی هەنووکەیی و هێزە شۆڕشگێڕەکان بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی ئەوەی چ شتێک بۆسەر ئاسایشی نیشتیمانی هەڕەشەیە.

## هەواڵگری خۆجێیی

تەنانەت ڕووبەرێکی فراوانتر، کە تیایدا سروشتی ڕژێمەکە کاریگەری دەبێت لەسەر چوارچێوەی هەواڵگری، ئەوەیە کە پێی دەوترێت "هەواڵگری خۆجێیی." هەر حکومەتێک دەبێت نەک تەنیا مشوری هەڕەشەکانی دەرەوە بخوات (وەک داگیرکاریەک لەڕێی سوپاوە) بەڵکو دەبێت نیگەرانی هەڕەشەکانیش بێت لە دژی تواناکەشی بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتەکەی، یان خودی وجودی حکومەتەکەی، ئەو هەڕەشانەی کە لەلایەن تاک یان

[i] Adda Bozeman, *Strategic Intelligence and Statecraft: Selected Essays* (Washington, D.C.: Brassey's [U.S.], ١٩٩٢).

گروپێکەوە لەناو سنوورەکانی ئەو وڵاتەوە سەر هەڵدەدەن. دەکرێت ئەم جۆرە هەڕەشانە لەلایەن چەند گروپێکەوە بن کە نیازیان وایە لەڕێگای ئامرازی نایاساییەوە حکومەت بڕوخێنن، بەتایبەتی بەبەکارهێنانی توندوتیژیی بۆ گۆڕینی سیاسەتەکانی ئەو حکومەتە، یاخود دەرکردنی ئەندامە سەرەکییەکانی سیاسەتڤانانی گروپێکی دیاریکراوی ئەتنی، نەتەوەیی، یان ئایینیی. بەڵام چۆن حکومەتێک ئەم جۆرە هەڕەشانە دیار و پێناسەیان دەکات، ئەمە بەتووندی پشت بەجۆری ئەو حکومەتە و شێوازی پێکهاتەکەی دەبەستێت.

ڕژێمێک کە تیایدا بنەماڵەیەک یان پارتێکی سیاسیی مۆنۆپۆلی دەسەڵاتیان کردووە، بۆ نموونە، بەڕێژەیەکی زۆر زۆربەی جووڵانەوەی سیاسیی ناوخۆ بە هەڕەشەی ئەمنی لەقەڵەم دەدات، وە دەزگا هەواڵگرییەکەی بەڕێژەیەکی زۆر سەرنج دەخاتە سەر دیاریکردن و لەکۆتاییشدا لەناوبردنی ئەو هەڕەشەیە. لە توندئاژۆترین حاڵەتدا، حکومەتێکی وڵاتێکی تۆتالیتاری ڕەنگە هەموو ئەو کەسانەی ئەندامی پارتە دەسەڵاتدارەکە نین وەک دوژمنی ڕاستەقینە یان شاراوە لەقەڵەم بدات.[1] بەپێچەوانەوە، بیرۆکەی "ئۆپۆزسیۆنی ڕاستگۆ" هەروەک لە سیستەمی پەرلەمانی و دیموکراسیدا دەبینرێت، ئەوە دەگەیەنێت کە

[1] لەکاتی کەوتنی ڕژێمی شیوعی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات، دەردەکەوێت کە ئەمە لە پراکتیکدا چۆن بووە. لەکاتی لەنێوچوونیدا، دەزگای هەواڵگری کۆماری دیموکراتی ئەڵمانی زیاتر لە هەشتاوحەوت هەزار سەربازی بڵاوەپێکرد، سوودی لە پێنج سەد هەزار هەواڵدەر و هەواڵدەری پارت تایم وەرگرت، وە دەستی بەسەر فایلی شەش ملیۆن هاوڵاتی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتدا گرت.

ڕکابەرە سیاسییە ناوخۆییەکانی حکومەت نابنە هەڕەشە بۆ سەر ئاسایش و بەمشێوەیەش ئامانجی گونجاو نین بۆ دەزگاکانی هەواڵگری.[1]

هەروەها، ئەو گروپە خۆجێییانەی کە نەک تەنیا نەیاری حکومەتی ئەو کاتن بەڵکو نەیاری سیستەمی حکومەتی گەلێکن (یان ڕژێمێک)، دەکرێت بەچەندین ڕێگا وەک هێزێکی دەرەکی دیاری بکرێن. شتێکی کردەییشە کە ڕەنگە ئەو گروپە یان لایەنە لەجیاتی هێزێکی بیانی لەم وڵاتەدا کاربکات بۆ بەرژەوەندی ئەو هێزە بیانییە کە لە ئەساسدا نەیاری حکومەتەکەیە. هەروەها دەکرێت گروپ و کەسایەتی وامەبن کە هەمان ئامانجیان هەبێت لەگەڵ هێزێکی دەرەکی وە لە ئەنجامیشدا کار بکەن بۆ ئەوەی بەو ئامانجانە بگەن. لە کۆتاییدا، دەکرێت گروپگەلی واش هەبن کە لە ئایدۆلۆژیەت و باوەڕدا لەگەڵ نەیارێکی بیانیدا هاویەش بن بەڵام پەیوەندی ڕاستەقینە و ئاشکراشیان لەگەڵیدا نەبێت. ڕژێمە جیاوازەکان دەکرێت بۆچوون و ڕامانیان هەمەجۆر بێت لە دیاریکردنی ئەو جۆرە گروپانە وەک هەڕەشەیەکی نیشتیمانیی، لە دژی ئەو لایەنەدا کە دەبێت زانیاری هەواڵگری لەدژی کۆبکرێتەوە.

## هەواڵگری و جێبەجێکردنی یاسا

پرسێکی پەیوەندیدار بەوەی پێی دەوترێت هەڕەشەی "نێونەتەوەیی"، کە لە حکومەتێکی بیانییەوە هەڵناقوڵێت- بۆ نموونە، بازرگانیکردن بە ماددەی هۆشبەر و سرکەر، تیرۆریزمی نێودەوڵەتی، یاخود چەند جۆرێکی

[1] Richard E. Morgan, *Domestic Intelligence: Monitoring Dissent in America* (Austin: University of Texas Press, ١٩٨٠), ١٥–٨٧.

تایبەتی تاوانی ڕێکخراو، خۆی لەم بوارەدا دەبینێتەوە. دەکرێت ئەمانە هەڕەشەی جددی بن بۆ کامەرانی نەتەوەیەک، بەڵام ئەم هەڕەشانە دەکەونە ناو سنووری جێبەجێکردنی یاساوە نەوەک کاری هەواڵگری. سەرەڕای ئەمەش، زۆرجاری هەواڵگریی خۆی هەڵئەقورتێنێتە ناو ئەم مەسەلانەوە بۆ ئەوەی لە دژیان بجەنگێت، جا ئەمەش هۆکارگەلێکی زۆری لە پشتەوەیە. یەکەم، ئەم جۆرە هەڕەشانە لە چالاکی دەرەکی پێک دێن، کە دەبێتە هۆی سنووردارکردنی جێبەجێکردنی یاسای ئەو وڵاتە، بە زۆرجار ئەو هەڕەشەیە لە وڵاتی بنچینەوە بەهۆی لاوازی دەزگای هەواڵگریی و یاساوە بەرپەرچ نادرێتەوە، بۆیە بەناچاری دەبێت لە چوارچێوەی هەواڵگرییدا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. لەم دۆخەدا، دەبێت داوا لە هەواڵگریی بکرێت بۆ ئەوەی زانیاری کۆبکاتەوە دەربارەی پێگەی دەرەکی ئەم چالاکیانە، زانیاریگەلێک کە ئەگەر هەواڵگریی کاری لەسەر نەکات ئەوا ناتوانرێت بەدەست بهێنرێن.

دووەم، کە خاڵێکی زۆر گرنگە، جێبەجێکردنی یاسا هەمیشە کاتێکی زۆری دەوێت، وە دەبێت پرۆسەکە بوەستێت تاوەکە تاوانەکە ئەنجامدەدرێت، یان خەریکە ڕوودەدات، وە دواتر یاسا بۆی هەیە هەوڵبدات چارەسەری ئەو تاوانە دیاریکراوە بکات و ئەنجامدەرانیشی بە سزای خۆیان بگەیەنێت. ئەمە جێگای قبوڵکرن نییە لە هەمبەر چەند پرسێکی هەڕەشەی نێونەتەوەییدا. ڕووداوێک، وەک تەقاندنەوەی فڕۆکەیەکی گەشتیاریی، زیانێکی زۆر دەگەیەنێت کە حکومەتێک هەوڵبدات ڕێگریی لەو جۆرە تاوانانە بکات نەوەک تەنیا لەدوای ڕوودانی چارەسەری بکات. هەروەها، تاوانێکی دیاریکراو، وەک قاچاغچییەتی ماددەی هۆشبەر، ڕێگە

بەشێک بێت لە ئۆپەراسیۆنێکی ڕێکخراو لەلایەن باندێکی تاوانبارەوە؛ ئەگەر ئەو باندە گەورە بێت وە بەشێوەیەکی باش ڕێکخراو بێت، دەستگیرکردنی ئەنجامدەرانی یەک تاوان ڕەنگە کاریگەرییەکی ئاوا زۆری نەبێت. ئەم جۆرە دەستگیرکردنە ناوبەناوانە وادەردەخات، بەبۆچوونی ئەو گروپە مافیایە، کە دەکرێت ڕووبدەن لەکارێکی ئاوا مەترسیدار و گەورەدا.
لە کۆتاییدا، تەنانەت ئەگەر دەزگاکان قابیل بن بەوەی چاوەڕێ بکەن تا تاوانێکی دیاریکراو ڕوودەدات، دەرفەتەکانی چارەسەرکردنی زۆر بە توندی پەیوەستە بەوەی کە پاشخانی زانیارییەکی باشیان لەژێر دەسا بێت دەربارەی ئەو ڕێکخراوانە لەو تاوانەدا تێوەگلاون.
بەهۆی ئەم هۆکارانەوە، زۆربەی جار حکومەتەکان بۆ چارەسەرکردنی گرفتی لەم جۆرە پەنا دەبەنە ڕێگای بەکارهێنانی دەزگا هەواڵگرییەکان بۆ ئەم جۆرە چالاکیانە. لەجیاتی ئەوەی بوەستن بۆ کردەیەکی تایبەتی تاوان کە سەرنجی بخەنەسەر، دەزگا هەواڵگرییەکان لەماوەیەکی درێژدا زانیاری پێویست کۆدەکەنەوە دەربارەی ئەو گروپ و کەسایەتیانە-هاندەرەکانیان، سەرچاوەکانیان، پەیوەندییەکانیان، نیازەکانیان، وە هەموو ئەو سەرچاوانەی پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەیە. زۆرجار پێویستە سیخوڕێک بەکاربهێنین، کە زانیاری لەو گروپ و لایەنانە بگوازێتەوە بۆ دەزگا هەواڵگرییەکان. هەروەها دەکرێت چاوەدێری بخرێتەسەر دەزگاکانی گەیاندنیان یاخود بەکارهێنانی تەکنیکی تری کۆکردنەوەی زانیاری لەسەریان. بەم شێوەیە، دەزگاکانی هەواڵگری زۆربەی جار لە بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشەی گروپە نێونەتەوەییەکان تێوەدەگلێن. بەپشتبەستن بە چۆنیەتی حوکمی ڕژێمەکە، تێوەگلانی

دەزگاکانی هەواڵگریی دەکرێت سنووردارییێت لە هەمبەر چوارچێوەی بیانی چالاکیەکانیان، لەکاتێکدا لایەنە ناوخۆییەکان لەناو مەودای دەزگاکانی جێبەجێکردنی یاسادا دەمێننیتەوە.

تەنانەت لە مامەڵەکردنی لەگەڵ تاوانی تەواوی گروپە خۆجێییە رێکخراوەکاندا، دەزگاکانی جێبەجێکردنی یاسا زۆرجار تەکنیکەکانی هەواڵگریی بەکار دەهێنن. بۆ نموونە، سەبارەت بە جێبەجێکردنی یاسای خۆجێیدا، ئێف بی ئای جیاوازی دەکات لەنێوان لێکۆڵینەوەی هەواڵگریی تاوانباریی و لیکۆڵینەوەی تاوانە ئاساییەکان. لە هەردووکیاندا، جۆری پێشووی لیکۆڵینەوە بە "فراوانتر وە کەمتر جیاواز لە ئاسایی" وەسف دەکرا: سەرنج نەخراوەتە سەر کارێکی تەواوکراوی تاوانکاریی بەڵکو سەرنج خراوەتە سەر رێکخراوێکی تاوانکار کە قەبارە، پێکهاتە، کارەکانی رابردوو، ئامانجەکانی تاوانکاریی نیازمەند، وە توانای زیانگەیاندنی دیاریبکرێت. هێڵی جیاکراوەی نێوان جێبەجێکردنی یاسا و رێگاکانی هەواڵگریی ئەوەیە کە ئایا سەرنجەکە لەسەر سزادانی کارێکی تاوانکارییە یان بەرەنگاربوونەوەی رێکخراوێکە کە لەم جۆرە چالاکیانەدا تێوەدەگلێت.

## ئابووریی و هەواڵگریی

چەند پرسێکی گرنگ هەن کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان هەیە لەگەڵ دەزگا هەواڵگرییەکان کە خۆیان لە پرسە ئابووریەکاندا دەبیننەوە. دووبارە، ئەمەش پشت بە سروشتی رژێمەکە و سیستەمی ئابووریی ئەو وڵاتە دەبەستێت. لە سیستەمی حکومەتێکی پشتبەستراو بە ئابووریی، ئیتر هەواڵگریی ناچار دەبێت خۆی بخزێنێتە ناو کایەکانی کەرتی ئابووریی

وڵاتەکەیدا بەتایبەتی کاتێک وڵاتەکە پەیوەندی ئابووریی لەگەڵ وڵاتانی بیانیدا دەبەستێت (وەک بازرگانی نێودەوڵەتی)، هەروەک چۆن سەروکاری هەیە لەگەڵ ئەو پەیوەندییە نێودەوڵەتیانەی کە لەگەڵ وڵاتانی تردا دەیبەستن. سەرەڕای ئەم کارەشی، دەکرێت هەواڵگریی بەکاربهێنرێت بۆ بەرەوپێشبردنی خۆشگوزەرانی ئابووری وڵات. بەدەستهێنانی تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی خۆرئاوایی، بۆ نموونە، کارێکی گرنگی دەزگاکانی هەواڵگریی یەکێتی سۆڤیەتی جاران بوو(وە وەک ئامانجێکی گرنگی هەواڵگری ڕوسیا و چین دەمێنێتەوە). ئەم چالاکییە نەک تەنیا پەرەی بە ئاستی تەکنۆلۆژی سەربازیی ڕوسیا وچیندا بەڵکو هەردوو وڵاتی پاراست لە خەرجێکی زۆر و بارقورسی پێشخستنی تەکنۆلۆژی خۆشیان، چ لە ڕووی بەکارهێنانی بۆ هێزی سەربازیی یان مەدەنی.

لە ئابووری بازاڕدا کەمتر ڕوونە کامە پرسی ئابووریی ڕووکاری ئاسایشی نیشتیمانی پۆشیوە کە پۆزش بهێنێتەوە یان پێویست بکات بە تێوەگلانی دەزگا هەواڵگرییەکان. چەند مەودایەکی تایبەت هەن، وەک خەمڵاندنی توانای ئابووریی هێزی شاراوەی نەیارێک یان چاوەدێری کردنی گەشەسەندنەکانی دوژمن کە کاریگەریی ستراتیژییان هەیە لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی، دەزگاکانی هەواڵگریی بەزۆری ڕێڵی دەستخستنی زانیاری قوڵ و تێروتەسەلن لەم بارەیەوە. ئەو پرسەی کە پەیوەندی هەیە بەوەی ئایا دەزگا هەواڵگرییەکان و تەکنیکەکان بەکارهێنراون بۆ بەدەستهێنانی زانیاری پشت بەوە دەبەستێت کە تا چ ئەندازەیەک ئەو وڵاتانە هەوڵدەدەن بە نهێنیی بیشارنەوە. بەگشتی، پرسی ئابووری کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر بواری سیاسەتی سەربازیی یان

سیاسەتی دەرەوە، لێرەشدا ئەرکە قورسەکە دەکەوێتە سەر دەزگا هەواڵگرییەکان. بۆ نموونە، لەکاتی جەنگدا، دەکرێت ئامرازە هەواڵگرییەکان بەکاربهێنرێن بۆئەوەی بتوانن بچنەناو بابەتە ستراتیژییەکانی دوژمن (یان ڕێگاگرتن لە دوژمن بۆئەوەی دەستی بە زانیاریەکان نەگات)، ئەمە بێگومان ئامانجی سەرەکی پاراستنی ئاسایشی نیشتیمانییە. بەهەمان شێوە، لەکاتی گفتوگۆ لەگەڵ وڵاتێکی بیانیی لەمەڕ پرسە ئابوورییەکان، دەکرێت وڵاتێک تواناکانی هەواڵگریی بەکاربهێنێت بۆئەوەی زانیاری دەربارەی پێگەکانی گفتوگۆی وڵاتی بەرامبەر بزانێت.
بەشێوەیەکی گشتیتر، ویستی وڵاتێک بۆ هەواڵگریی ئابووریی لەسەر پیشەسازیی، بازرگانی، وەک چالاکی ئابووریی لەناو وڵاتانی تردا ڕەنگە زیاتر پشت بەوە ببەستێت کە ئایا حکومەتەکەی "سیاسەتی پیشەسازیی" هەیە کە سوودی لێ ببینێت یان نا. بەم شێوەیەش، پرسی بەکارهێنانی دەزگا هەواڵگرییەکان بۆ بەدەستهێنانی زانیاری ئابووریی بەشێوەیەکی فراوان پەیوەستە بە گفتوگۆی گەورەریی لەسەر ڕۆڵی حکومەت لە ئاراستەکردنی داهاتووی ئابووری وڵاتێک.
وە دەبێت ئەوەندە بوێریین کە بپرسین لەوەی کە ئایا هەر بەڕاست هەواڵگریی پێویستە بۆ بەرەوپێشبردنی دۆخی ئابووری نەتەوەیەک یان نا.[أ] هەروەک کۆتایی هاتنی جەنگی سارد هەڕەشەی بەرەنگاری سەربازیی

---

[أ] دیاردەیەکی تری جیا، کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە پشتیوانی هەواڵگریی بۆ داڕشتنی سیاسەت نییە، بریتییە لەوەی کە حکومەتێک دەزگا هەواڵگرییەکانی بەکاربهێنێت بۆ دەستکەوتنی پارە. دەزگای هەواڵگریی چەندین دەرفەتی لەبەردەستن بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، جا چ بۆ پارەدارکردنی

لە نێوان زلهێزەکانی جیهان لەناوبرد؛ لە ئەنجامدا، ئیتر ڕۆڵی هەواڵگرییش لە بواری ئابووریدا زیاتر بوو بە سەنگی مەحەک لەناو وڵاتاندا.[i] پێشکەوتنی ئابووریی بەهۆی ئەم جۆرە فاکتەرانەوە وەک سەرمایەی وەبەرهێنراو، بەرهەمی کرێکاران، کارامەیی بەڕێوەبردن، بە ئاستی پەروەردەی هێزی مرۆیی بەتێپەڕبوونی کات بەرزی و نزمی تێ دەکەوێت.

---

تۆپەراسیۆنەکانی خۆی یانیش سوککردنی باری حکومەت لەڕێی تەرخانکردنی پارەی بۆی. ئەم جۆرە تۆپەراسیۆنە نهێنیانە دەکرێت بەکاربهێنرین بۆ ئەنجامدانی چالاکی سوودبەخش لە ڕووی پارەوە وەک مامەڵەی تلیاک و بەنگ بە جۆرەکانی تری بەقاچاخ بردنی شتگەلی لەم بابەتانە. دیار نییە کە تا چ ئەندازەیەک حکومەتەکان دەزگا هەواڵگرییەکانیان بەکارهێناوە لەم بوارەدا، چونکە، وەک ئاشکرایە، سەرجەم چالاکیەکانیان بە نهێنی و لەژێر پەردە ئەنجام دەدەن. یەکێک لەو نموونەی لەم ڕووەوە ئاشکرا بوو پەیوەندی بە وڵاتی فەرەنساوە هەیە. بەگوێرەی وتەی بەڕێوەبەری پێشووی هەواڵگری دەرەکی فەرەنسا، کە دەزگاکە لە نۆڤەمبەری ۱۹۷۱ زانیویەتی کە ئەمریکا بڕیاری لە مانگی ئایندەدا ستانداردی زێڕ بەرزبکاتەوە، بەم پێیەش بەشێوەیەکی کاریگەر بەهای دۆلاری نزم دەکردەوە. ئەمریکا "بە نهێنی هەڵسا بە فرۆشتنی دۆلار وە کڕینی فرانکی فەرەنسی لە ژمارەیەکی بازاڕی جیهاندا، بانکی ناوەندی فەرەنسا توانی پارەیەکی بەرچاو کەڵەکە بکات کە بەشی پێداویستی تۆپەراسیۆنەکانی دەزگاکە بکات" بۆ ماوەیەکی باش.

[i] بەلەبەرچاوگرتنی توانای تەکنەلۆژی و ئابووریی، ئەمریکا سەرنج دەداتە سەر پاراستنی نهێنی بازرگانی وە تەکنەلۆژیی. لەوەتەی ساڵی ۱۹۹۵ەوە، سەرۆکی ئەو وڵاتە ساڵانە ڕاپۆرتی خۆی دەنێرێتە کۆنگرێس لەمەڕ سیخوڕیی دەرەکی کە پیشەسازیی ئەمریکایان بە ئامانج گرتووە. تۆی خوێنەر، دەتوانی ئەم ڕاپۆرتانە و ماددەی یاسایی سیخوڕی ئابووریی لە پێگەی ناوەندی دژەهەواڵگریی نیشتیمانی ببینی: www.nacic.gov.

هەروەها، لەوکاتەی ڕەنگە برێکی زۆر لە پێشکەوتنەکان لە بواری ئابووری نێودەوڵەتی پەلوپۆ بهاوێژێتە ناو ئاسایشی نیشتیمانی، ڕوون نییە کە حکومەتی پێویستە، یان تەنانەت دەتوانێت، کارێکی شایستە بکات دەربارەی ئەم جۆرە پێشکەوتنانە. سەرەڕای ئەمەش، لە کۆمەڵگایەکی دیموکراسیدا، سیاسەتی ئابووریی زیاتر بەهۆی بەرژەوەندییە ناوخۆیەکاندا بڕیاری لەسەر دەدرێت وەک لە ڕامانێکی یەکگرتوو(جا لەسەر بنەمای زانیاری هەواڵگریی بێ یاخود نا)ی ژینگەی ئابووری داهاتووی جیهان. بەهۆی ئەم هۆکارانەوە، ڕوون نییە کە ئایا حکومەتێکی وەک ئەمریکا بەکارهێنەرێکی سەرەکی ئەم جۆرە هەواڵگرییە ئەبێت یاخود نا. بەرژەوەندی ئابووری تایبەت ڕەنگە زیاتر گرنگ و چالاک بێت لەو وڵاتەدا، بەڵام ڕوون نیە کە ئەو زانیاریانەی کۆکراونەتەوە بەهۆی چالاکی هەواڵگریی نهێنییەوە لەسەر حیسابی حکومەت دەکرێت بە هاوسەنگی بەسەر دەزگا و هاوڵاتیاندا دابەش بکرێت بۆ بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندی ئابووری تایبەت.[أ]

---

[أ] ئەو ڕێوشوێنە یاساییانەی ئەمریکا لە سەر بەکارهێنانی هەواڵگری ئابووری خۆی دایناوە نەبۆتە هۆی وەستاندنی ئەو وڵاتە لە تاوانبارکدنی وڵاتانی تر کە دەست لە کاروباری ئابووری ئەو وڵاتە وەردەدەن. لەهەمبەردا، وڵاتانی تریش لە پەرلەمانی ئەورووپیدا لە شوباتی ۲۰۰۰دا ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی تاوانبارکرد بە بەکارهێنانی زانیاری دەستکەوتوو لەڕێگای ئەو سیستەمەی کە پێی دەوترێت (Echelon)-کە سیستەمێکی نێودەوڵەتی ئابوورییە- بۆ هاوکاریکردنی کۆمپانیاکانیان لە بەدەستهێنانی قازانجی بازرگانیدا. بەڵام بەگشتی ئەم تۆمەتبارکردنانە لەلایەن بەڕێوەبەری پێشووی سی ئای ئەی، جەیمس وسلی، لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەڤانیدا

## پرسە "نائاساییەکان"ی تر

هەندێ لە فێرخواز و قوتابیانی هەواڵگریی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە سەرەڕای ئابووریی، گرفتە "نائاساییەکانی"ی تریش دەبێت بخرێنەناو چوارچێوەی هەواڵگرییەوە- بۆ نموونە، پرسەکانی ژینگە. لەکاتێکدا کە ئارگومێنتەکە لەسەر ئەو بنەمایە دارێژراوە کە کێشە ژینگەییەکان کاریگەرییان هەیە بۆسەر ئاسایشی نیشتیمانیی، هاندەری سەرەکی بریتییە لەوەی کە سیستەمەکانی کۆی هەواڵگریی تەکنیکی گەشەسەندوو بۆ مەبەستەکانی تر دەکرێت بەتێپەڕبوونی کات هاوکار بن لە گۆڕانکاری ژینگە بەسەر ڕووبەرێکی زۆری خاک، بە دەکرێت ئەم کارە بە تێچوونێکی کەم ئەنجام بدرێت.

## هەواڵگریی و سەردەمی زانیاریی

بەلەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییەی کە هەواڵگریی مامەڵەیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ زانیاریدا دەکات، شتێکی ئاساییە وا لێکبدێتەوە کە ئەم کارە بەچەندین ڕێگاوە کاریگەر دەبێت، ئەمەش بەهۆی لەدایکبوونی چەرخێکی نوێ کە پێی دەوترێت "سەردەمی زانیاریی." بیرۆکەی سەردەمی زانیاری

---

لە ئازاری ٢٠٠ ڕەتکرانەوە. وسلی ڕاپۆرتەکەیاند ئەو هەواڵگرییەی کە لەدژی دامەزراوە بیانییەکاندا بەکاردێت خۆی لە سێ بواردا دەبینێتەوە: جێبەجێکردنی ئابڵۆقەی دارایی بۆسەر ئەو وڵاتانە، فرۆشتنی کەلوپەل و بەرهەمێک کە بەکاردێن بۆ بەرهەمهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ، وە لێکۆڵینەوە لە دەرفەتی بەرتیلدان لەلایەن دامەزراوە نائەمریکیەکانەوە بۆ ڕکابەریکردن لەگەڵ کۆمپانیا ئەمریکیەکان. بۆ خوێندنەوەی تەواوی بابەتەکە، سەردانی ئەم پێگەیە بکە:
www.iptvreports.mcmail.com/ic٢kreport.htm#Report

بێگومان زیاتر نادیارە. کەچی ئاشکرایە ئەم ڕەوتە زۆر گرنگە چونکە توانیویەتی ڕێڕەوی چەندین دامەزراوە بەچەندین ڕێگا بگۆڕێت بەتایبەتی دامەزراوە بازرگانیەکان وەک دیاریشە کاریگەرییەکی گرنگیشی هەیە لەسەر خودی دامەزراوەکانی حکومەتیش.

لە ڕووی تەکنیکیەوە، هۆکاری سەرەکی لەپشت ئەمە بریتییە لەو پێشکەوتنە بەرچاوانەی بواری تەکنەلۆژیا کە لە بوارەکانی پرۆسە و گەیاندنی زانیاری بەدەست هاتوون. هەرچەندە، گۆڕانی تەکنۆلۆی تەنیا بەشێکی بچوکی وێنە گەورەکەیە: گۆڕانەکان لە بواری ئەخلاقی و دامەزراوەیی کاریگەریەکی زیاتری هەیە کە لە ئەنجامی سەرنجدان لەسەر زانیاری وەک هۆکاری سەرەکی چالاکی دامەزراوەیی بەدەست هاتووە.(لە بواری سەربازییدا، زۆریەی جار وەک "شۆڕش لە کاروباری سەربازیی" لەقەڵەم دەدرێت، ئەمە زیاتر پشت دەبەستێت بە ڕاددەی سوودی ئەو زانیارییە بۆ بەئامانج گرتنی جۆرە نوێکانی چەکی پێشکەوتوو، وە توانای پێشکەوتوو بۆ کۆکردنەوە و لێکدانەوە، وە پوچەڵکردنەوەی زانیاریەک لە ئانوساتی گونجاودا بۆ مەبەستی ئەنجامدانی چالاکییەک).

کاریگەریی ئەم گۆڕانانە لە چەندین بواردا خۆیان دەنوێنن. ئەو گۆڕانکاریانە پێشنیازی چەندین ڕێگای جۆراوجۆر دەخەنەڕوو کە تیایاندا زانیاریەکان بە خێراتر بکەونە دەستی حکومەت و ئەوانیش بەکاریان بهێنن بۆ ئەوەی دارشتنی سیاسەتی وڵاتەکانیان لەسەری دابڕێژن. سەرەڕای ئەمە، ئەم گۆڕانکاریانە سەرنج دەخەنە سەر بڕی ئەو زانیاریە بەردەستانە لە سەرتاسەری کۆمەڵگادا، لەناو بەشە ناهەواڵگرییەکانی حکومەت و دەرەوەی حکومەتیش. بە واتایەکی تر، دەزگا هەواڵگرییەکان کارکردنیان

لە دەزگاکانی تریشدا بۆ ئاسان دەبێت وە دەبن بەبەشێک لە پرۆسەی کۆکردنەوە، شیکردنەوە، وە لەکۆتاییدا بڵاوکردنەوەی زانیاریەکان- واتە، دەزگا هەواڵگرییەکان، سەبارەت بە هەندێ لایەنی جۆری زانیاریی، زیاتر بەهێز دەبن لە رووی "رکابەریکردن" لە پێدانی داتای گرنگ بە دارێژەرانی سیاسەتی وڵات. بە تێڕامانی لە حکومەت وەک دامەزراوەیەکی گشتی، پرسەکە لێرەدا دەبێت ئەوە بێت کە تا چ ئەندازەیەک دەتوانرێت ئەو زانیاریانە لە بەرژەوەندی وڵاتدا بەکاربێن، وە لە شوێنەکانی تری وڵاتدا پوچەڵ بکرێنەوە، وە چۆن دڵنیایی ئەوە بدەن کە بەرهەمی گرنگی دەزگا هەواڵگرییەکان تێکەڵ دەبێت لەگەڵ سەرچاوەکانی تری زانیاری بە شێوەیەک کە بتوانێت بە باشترین شێوە خزمەت بە زانیاری پێویستی حکومەت بکات.[i]

## پێکهاتەکانی هەواڵگریی

هەواڵگریی بۆسەر چوار بەشی سەرەکی دابەش دەبێت کە بەشێوەیەکی گشتی پێی دەوترێت "پێکهاتەکانی هەواڵگریی"؛

- کۆکردنەوەی زانیاریی (Collection)
- شیکردنەوەی زانیاریی (Analysis)
- چالاکی پەنهان (Covert action)
- دژە هەواڵگریی (Counterintelligence)

[i] Bruce D. Berkowitz and Allan E. Goodman, *Best Truth: Intelligence in the Information Age* (New Haven, Conn.: Yale University Press, ٢٠٠٠).

لەبەر ئەوەی ئەم پێکهاتانە بە تێروتەسەلی لە بەشەکانی داهاتوودا باسکراو، باسکردنیان لێرەدا تەنیا بۆ ئەوەیە تیشکێک بخەینە سەر سروشتی هەرچوار جۆری چالاکی هەواڵگریی وە پەیوەندیەکەیان بە یەکەوە بخەینەڕوو.

کۆکردنەوەی زانیاریی بریتییە لەکۆکردنەوەی داتای سەرەتایی و پوخت لە ڕێگای سیخوڕیی؛ ئامرازی تەکنیکی (وێنەگرتن، دزەکردن بۆناو ئامێری ئەلیکترۆنی گەیاندن، وە ڕێگای تری بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا)؛ گەڕان بەدوای "سەرچاوەی کراوە" (بۆ نموونە، نووسراوی چاپکراو، وە پەخشی رادیۆیی و تەلەفزیۆن)؛ یان بە هەر شێوازێکی تر. لەکاتێکدا کۆکردنەوەی زانیاریی بایەخی تایبەتی خۆی هەیە لە کاری هەواڵگرییدا، بۆچوونەکان جیاوازن لەمەڕ گرنگی ڕێژەیی میتۆدی بەکارهێنانی ڕێگاکانی. بۆ نموونە، فێرخوازانی هەواڵگریی دیبەیتیان ئەنجامداوە دەربارەی ڕێژەی گرنگی "سەرچاوەی کراوە" و ئەو ڕێگایانەی تایبەتن بە دەزگا هەواڵگرییەکان، وە ڕێژەی گرنگی سیخوڕیی و کۆکردنەوەی زانیاری لە ڕێگای تەکنیکەوە. زانیارییە کۆکراوەکە هەرچەندە باش بێت، نزیکەی هەرگیز شتێکی ڕوون نادات بەدەستەوە. بە واتایەکی تر، ئەم زانیارییە کۆکراوانە پێویستیان بەوە هەیە شیبکرێتەوە، ئەگەر مەبەست لێیان بەکارهێنانیان بێت لەلایەن داڕێژەرانی سیاسەت و فەرماندە سەربازییەکانەوە. لە زۆربەی هەرە زۆری کەیسەکاندا، زانیارییە کۆکراوەکان ناتەواو، ناڕوون، یە جێگای گومانن وە بێگومان ئەمەش سەردەکێشێت بۆ ئەوەی دەکرێت چەندین لێکدانەوەیان بۆ بکرێت، بەمەش کارێکی ئاسان نابێت هەروا بە سادەیی متمانە بە

ڕووکەشی ئەو زانیاریانە بکەین. هەربۆیە، پرۆسەی شیکردنەوە و لێکدانەوەی زانیارییە بەردەستەکان بۆ ئەوەی بڕیاریان لەسەر بدەین دەربارەی توانا، نیاز، کردەکانی لایەنێکی تر لە ئەرکە هەر گرنگەکانی پرۆسەی هەواڵگریی دادەنرێت. تەنانەت کاری قورستر بریتییە لە پرۆسەی پێشبینیکردنی توانا، نیاز وە کردەوەکانی داهاتووی حکومەتێکی بیانی یان دامەزراوەیەکی سیاسیی.

*چالاکی پەنهانی* لە پێکهاتەکانی تری هەواڵگریی جیاوازە لەوەی کە کاتێک کاری ئەمان گەڕان و پاراستنی زانیارییە، بەڵام ئەرکی سەرەکی بریتییە لەوە کە دەیەوێت ڕاستەوخۆ کاریگەریی هەبێت بۆسەر ڕووداوی سیاسیی. لە ڕووی بەهێزیی و چڕی کارەکەوە، چالاکی پەنهانی دەکرێت خۆی لە قایلکردن و پڕوپاگەندە بۆ کردەی نیمچە سەربازیی ببینێتەوە؛ ئەم چالاکییە سەربازییە بەم شێوەیە پێناسە کراوە "کردەیەکە لە نێوان دبلۆماسیەت و جەنگ."

لەکاتێکدا تەکنیکەکانی بەکارهێنانی ئەم کاریگەرییە زۆر و زەوەندن، تایبەتمەندی هاوبەشیان هەیە لەوەی هەروا بە ئاسانی هەستیان پێناکرێت بە واتایەکی تر، ڕۆڵی حکومەت لە ئەنجامدانی چالاکیەکە هەروا بە ئاسانی دیار نییە یان بۆ ڕای گشتی خەڵک ونە. بەهۆی ئەمەوە، توانای دەزگایەکی هەواڵگریی بۆ ئەوەی بە نهێنی کاریکات زۆربەی جار بەو واتایە دێت کە ئەو دەزگایە تەرخانکراوە بۆئەوەی چالاکیەکی پەنهانیش ئەنجام بدات. بەڵام هەروەک لەسەرەوەدا باسکرا، چونکە ئەم چالاکییە لە جێبەجێکردنی سیاسەت پێک دێت نەوەک ئاگادارکردنەوەی داڕێژەرانی سیاسەت، لە ئەمریکادا چەند پێشنیارێک جاروبار دەخرانەڕوو کە چالاکی پەنهانی نابێت

کاری هەمان دەزگا (سی ئای ئەی)[i] بکات کە هەڵدەستێت بە کۆکردنەوە و شیکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی. لەلایەکی ترەوە، هەردوو وڵاتی

---

[i] سیخوڕیی، لەپیشە کۆنەکانی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە بەتایبەتی لەجەنگە نێوە خۆیەکانی بەڵام لەپاش ساڵی ١٩٤٧ لەگەڵ دەست پێکردنی شەڕی سارد لەنێوان بلۆکی ڕۆژهەڵات و بلۆکی ڕۆژئاوادا سیخوڕی بووە بەهەموو شتێک بۆ ئەمریکا، بەڵکو بە پیشەیەکی نیشتمانی دادەنرێ سیخوڕی کردن لەخزمەت ئەمریکا ڕاستەوخۆ لەلایەن دەزگایەک بەڕێوەدەبردرێت بەناوی (هەواڵگری ناوەندی ئەمریکا)، کەناسراوە بە. (c.i.a) وەپێشی دەڵێن (سیا)، زۆر جاریش پێ ی دەڵێن دەوڵەتی دووەمی ئەمریکا، ئەم ناوەش بۆ کاریگەری ئەم دەزگایە دەگەڕێتەوە کە هەیەتی لەسەرجیهان دەتوانین بڵێین ئەمریکا بێ هەواڵگریەکەی ناتوانێ بەشێکی بچوکیش لەو سیاسەتەی کە دەیەوێ لەجیهان بیسەپێنێ سەرکەوتوبێ ئەگەر پاڵپشتی ئەم دەزگایە نەبێ.

بەرلەوەی دەزگای هەواڵگری ناوەندی دروست بێ ئەمریکا بەهۆی وەزارەتی دەرەوە و ناوەخۆ لەڕێ ی دەزگایەک بەناوی (نوسینگەی خزمەتگوزاری ستراتیژی) کارە هەواڵگریەکانی ئەنجام دەدا. بەڵام دواتر لەبەرواری ١٩٤٧/٩/١٨ لەسەردەمی سەرۆکایەتی ئەوکاتەی ئەمریکا (هاری ترومان) فەرمانی دا بە دامەزراندی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکی c.i.a)لە ئێستا بۆتە بەهێزترین هەواڵگری لە جیهان و سیاسەتی ئەمریکا بەڕێوەدەبات

بودجەی ساڵانەی هەواڵگری ئەمریکی نهێنیە، زۆرترە لە بودجەی چەند وڵاتێکی تازەپێگەیشتوو هەتا کۆنگرێس و کۆشکی سپی بڕی ئەو بودجەیە بە تەواوی نازنن. زۆرجار کۆنگرێس ڕەزامەندی داوە لەسەر سەرفکردنی بڕەپارەیەک بۆ پڕۆژەی حکومی کەچی پارەکە چۆتە گەنجینەی هەواڵگری ئەمریکیەوە .زۆرێ یاری هەواڵگری ئەمریکی لە لانگلی دەتوانێ هەربڕە پارەیەک سەرف بکات بێ ئەوەی پێویستی بە

پسولەو بەهانە هێنانەوە هەبێ. هەروەها هەواڵگری شێوەی خەرجکردنی بودجەکە بۆ کۆنگرێس شی ناکاتەوە بۆیە هەواڵگری ئەمریکی بۆتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەناو وڵاتی ئەمریکا.

فەرمانبەرانی هەواڵگری ئەمریکی هەمان پلەوپایەی فەرمانبەرانی دامەزراوەکانی تریان هەیە،موچەی دیاری کراو بۆ ئەو پلەیە وەردەگرن، لەگەڵ هەندێ زیادەی تایبەتی کەبەبیانو و ناوی جۆراو جۆر دەیاندرێتێ لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان ملکەچی دەسەڵاتی مەدەنی نین، ئاشکرایە کەسەرۆکی هەواڵگری مافی دامەزراندن و دەرکردنی هەموو فەرمانبەرێکی هەیە بێ لێپێچینەوە و بێ گەڕانەوە بۆ سیستمی حکومی تایبەت بە فەرمانبەران

هەواڵگری ئەمریکی ■ سێ یەکەی سەربەخۆ پێک دێت:

یەکەی کۆکردنەوەی هەواڵی دەرەکی.

یەکەی کۆکردنەوەی دژە هەواڵگری و دژە سیخوڕیەکان.

یەکەی دەست تێوەر دانی نهێنی لەوڵاتانی دیکەدا

ئەم دەزگایە خاوەنی ژمارەیەکی زۆرە لە سیخوڕ و هەواڵگرەکان کە بە جیهاندا بڵاو بوونەتەوە ، سەرجەم زانیاریە جۆراو جۆرەکانی کە سیخوڕەکان کۆیدەکەنەوە رەوانەی بارەگای هەواڵگری ناوەندی ئەمریکی دەکرێت لە (لانگلی). بارەگای سەرەکی CIA دەکەوێتە دەوروبەری واشنتۆن لە (لانگلی) بە دووری ١٥ کیلۆمەتر، بۆ پاراستنی ئەم بارەگایە رێوشوێنی ئاسایشی توند پەیرەو دەکرێت، دەورەدراوە بە کامێرای چاودێری و پاسەوانی چەکدار، رێگە نادرێت بە هیچ کەسێک سەردانی هەندێ ژووری ئەم بارەگایە بکات چونکە تایبەتن بە پسپۆر و زانایان. ئەم بارەگایە جێگای کارمەندان و پسپۆڕانی دەزگای هەواڵگری ئەمریکیە، کە تێیدا بێ ماندوو بوون کار دەکەن بۆ شیکردنەوەی زانیاریە دزراوەکان، هەروەها جێگای

ئەمریکا و بەریتانیا بە ئەزموون بۆیان سەلمێنراوە کە هەبوونی دوو دامەزراوە بۆ ئەنجامدانی چالاکی نهێنی (یەکێکیان سیخوڕیی و ئەویتریان چالاکی پەنهانی) دەبێتە هۆی بەهەدەردانی وزەیەکی زۆر، ڕکەبەری هەردوو دەزگاکە و خۆتەملقورتاندنی هەردووکیان؛ لە ئەنجامدا جۆرێک لە ڕکابەری دروست دەبێت.[i]

دژە *هەواڵگریی* بریتییە لە پاراستنی کۆمەڵگایەک (وە بەتایبەتی تولنا هەواڵگرییەکانی) لەدژی هەر زیانێک کە ڕەنگە لەلایەن دەزگا هەواڵگرییەکانی نەیارەوە پیادە بکرێت. هەر لەسەرەتاوە، بەرەنگاربوونەوەی هەواڵگریی بەهۆی پرۆگرامەکانی ئاساییشەوە دەستەبەر دەبێت (دەبێت لایەنە پەیوەندیدارەکان دەست هەڵێنن بۆ پاراستن و بەنهێنی هێشتنەوەی ئەو زانیاریانەی کە نابێت بکەونە دەست هەموو کەسێک)؛ وە بەهۆی دژە هەواڵگرییەوە (ئامانج لەم کردارە ئاشکراکردن و گرتنی سیخوڕی بیانییە بۆ ئەوەی دەستی نەگات بە زانیاری نهێنیی). هەروەها بەرەنگاربوونەوەی سیخوڕیی هەڵدەستێت بە پاراستن لە دژی

---

ئەو زانایانەیە کە بەردەوام کار دەکەن بۆ بەرهەم هێنانی نوێترین دامێنان لە تەکنەلۆژیای هەواڵگری.

هەموو بەیانیەک کاتژمێر ٨ کارمەندانی هەواڵگری ئەمریکی لەم بارەگایە دەست بەکارەکانیان ئەکەن، لەم بارەگایەدا شارەزایان ئەو زانیاریانە شیکار دەکەن کە سەرانسەری جیهانەوە سیخوڕەکانیان بەدەستیان هێناوە هەروەها ئەو زانیاریانەش کە لە ناوخۆی ئەمریکا بەدەستیان هێناوە دواتر ئەم زانیاریانە لەڕێگەی کۆمپیوتەرەوە شیکار دەکرێن لە چەند پەڕەیەکدا کۆدەکرێنەوە و دەیخەنە بەردەست سەرۆکی ئەمریکا بۆ ئەوەی بڕیاری کۆتایی لەسەر بدات.

[i] John Ranelagh, The Agency: The Rise and Decline of the CIA (New York: Simon and Schuster, ١٩٨٦), ١٩٩–٢٠٠

شیکردنەوەکانی هەواڵگریی نەیارەکەی و تواناى کۆکردنەوەی زانیارییەکانی؛ ئەم کارە بەهۆی ئۆپەراسیۆنی تەفرەدان پێک دێت کە زانیاری هەڵە دەدات بۆ لەخشتەبردنیان بۆئەوەی قایلیان بکات ئەو زانیاریانە دروستن، وە لە ئەساسیشدا وانەبن.

ئەگەر کەسێک یان دەزگایەک بیەوێت خۆی بپارێزێت لە تواناى هەواڵگریی لایەنی بەرامبەر، ئەوا پێویستە چەند ڕێکارێک بگرێتەبەر. دەکرێت پێویست بێت چەند هەنگاوێک بنێیت بۆ ئەوەی دڵنیایی ئەوە بدەیت کە نابێت کەسێک هەڵبخەڵەتێت بەو زانیارییە هەڵانەی لەلایەن دەزگاکانی ترەوە بە ئەنقەست دەدرێن. بەم پێیەش، بەرەنگاربوونەوەی هەواڵگریی دەبێت ئاگاداری ئەوە بێت کۆکردنەوە و شکردنەوەی زانیارییەکانی بەشێوەیەک بپارێزێت کە تەنانەت خودی ئەندامانی خۆیشی دەستیان پێنەگات. هەروەها، دەبێت هەوڵی ئەوەش بدرێت کە زانیاری هەواڵگریی پێویستیش کۆبکرێتەوە دەربارەی بەرەنگاربوونەوەی هەواڵگریی لایەنی نەیار کە ئامانجیان بریتییە لە کاریگەریی دانان لەسەر حکومەت یان کۆمەڵگا. لەکۆتاییدا، دەبێت بڵێین کە فراوانی چالاکی بەرەنگاربوونەوەی سیخوڕیی لەسەر ئەوە بەندە کە تا چ ئەندازەیەک هەڕەشەکانی چالاکی هەواڵگریی لایەنی نەیار جێگای مەترسین.

ئێمە سەبارەت بە پێکهاتەکانی هەواڵگریی بەوە دەست بە گفتوگۆکەمان دەکەین کە سەرەتا لە کۆکردنەوەی داتاکان بکۆڵینەوە بۆ ئەوەی بتوانین بەشێوەیەکی تەندروست حوکمیان لەسەر بدەین و بیانخەملێنین. میتۆدە هەمەجۆرەکانی ئەو کۆکردنەوەیە (دیسپلینی هەواڵگریی) دەکرێت لەمانەی خوارەوە پێک بێن:

- کۆکردنەوەی زانیاری لە سەرچاوەی مرۆڤیەوە (بەزۆری سیخوریی).
- کۆکردنەوەی زانیاری بەهۆی ئامرازی تەکنیکی (هەواڵگریی تەکنیکی).
- کۆکردنەوەی زانیاری لەڕێگای چالاکی ناپەنهانی بەهۆی پەیوەندی دبلۆماسی یان سەرچاوە بەردەستەکانی زانیاریی، وەک پەخشی ڕادیۆیی یان تەلەڤزیۆنی، وێبسایت یان ئەو سەرچاوانەی پەیوەندییان بە ئینتەرنێتەوە هەیە (سەرچاوەی کراوە).[أ]

---

[أ] ئەم سێ میتۆدە لە باوترین ئەو ڕێگایانەن کە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری بەکاردێن بەڵام بەو واتایەش نییە کە ئیتر هیچ ڕێگایەکی تر نییە و هەر ئەمەیان دروستە. بۆ نموونە، دەکرێت زانیاری هەواڵگریی لە ڕێگای دزینی بەڵگەنامە یان کۆد لە باڵیۆزخانەیەکی بیانیدا کۆبکرێتەوە. ئەم جۆرە دزییە دەچێتە خانەی کۆکردنەوەی زانیاری لەڕێگای مرۆییەوە، بەڵام جیاوازە لە کاری سیخوریی، هەروەک لە سەرەوەدا باسکراوە.

## کۆکردنەوەی زانیاریی لە سەرچاوەی مرۆڤیەوە

کۆکردنەوەی زانیاریی بەهۆی مرۆڤەوە، یاخود سیخوڕیی، ئەو چەمکەیە هەر باسکرا، ئیتر "هەواڵگریی"مان بیردەکەوێتەوە. ئەم شێوازەی کۆکردنەوەی زانیاری لە دیاریکردن و پاشان بەکرێگرتنی کەسایەتیەکی دیاری بیانی پێکدێت، کە بەهۆی پێگەکەیەوە لەناو حکومەتێک متمانەی بەدەست هێناوە، دەتوانێت دەستی بە زانیاری گرنگ بگات و بەهۆی چەند هۆکارێکەوە دەیەوێت ئەو زانیاریانە بداتە کارمەندانی دەزگا هەواڵگرییەکی تر. لە هەندێک حاڵەتدا (بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا)، ئەو کەسەی ئەو زانیاریانە دەبەخشێت دەکرێت کارمەندی حکومەتێک نەبێت بەڵکو تەنیا تاکەکەسێک بێت کە دەرفەتی هەیە چاودێری (یان گوێی لێ بێت) شتێک بکات کە جێگای بایەخە، وەک کاتی گەیشتن و ڕۆیشتنی کەشتیەکی جەنگی لە بەندەرەکەیەوە. دەکرێت ئەو کەسەی بەکرێگیراوە کەسێک بێت کە بەهۆی پەیوەندی تایبەتەوە دەستی بە زانیاری گرنگ بگات (وەک هاوڕێیەتی، کاری بازرگانی، هتد...) لەگەڵ کەسێک کە لەژێر چاودێری هەواڵگریدایە (وەک تیرۆرستێک یان بازرگانی مامەڵەی چەک). بەشێوەیەکی ئاسایی، دوو کەس بە ئەرکی جیاواز لەم کارەدا تێوەدەگلێن: ئەفسەری هەواڵگریی، کە کارمەندێکی دەزگای هەواڵگرییە، وە سەرچاوەی زانیاریی، کە زانیاری بەو ئەفسەرە دەدات بۆ ئەوەی بیانگوازێتەوە بۆ بارەگای سەرەکی دەزگای هەواڵگریی. ئەفسەرە هەواڵگرییەکە لەسەر

پەیوەندیەکانی بەردەوام دەبێت لەگەڵ سەرچاوەکە،[i] ڕێنمایی لە بارەگای سەرەکی دەزگا هەواڵگرییەکە دەگەیەنێت بە سەرچاوەکە، سەرچاوەی

---

[i] کاری هەواڵگری لە هەر وڵاتێکدا بریتییە لە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر پلانە دوژمنکاریەکانی دوژمن لە دژی ئاسایشی وڵات، کۆکردنەوەی زانیاریش تەنها لەڕێگەی سەرچاوەکانەوە دەبێت، سەرچاوەکان ئەو کەسانەن کە هەواڵگری پشتیان پێ ئەبەستێت، ئەم جۆرە کەسانە کاریان کۆکردنەوەی زانیاریە لەسەر ئەو چالاکیانەی لە دژی دەوڵەت ئەنجام ئەدرێت، ئەم جۆرە کەسانە هەر زانیاریەکیان دەست بکەوێت دەیدەنە دەزگای هەواڵگری و لە بری ناوی ڕاستەقینەی خۆیان ناوێکی خوازراو بەکار ئەهێنن.

بۆ هەر سەرچاوەیەک دۆسیەیەکی تایبەتی دەکرێتەوە و تیایدا ڕاپۆرتەکانی هەڵئەگیردرێت دوای وەرگرتنی زانیاریەکانی و گرتنەبەری ڕێوشوێنی گونجاو. هەر بەرپرسێکی هەواڵگری بۆی هەیە لەو ناوچەیەی کە تیایدا ئەژی سەرچاوەی لە خەڵکی ناوچەکە هەبێت، هەروەک چۆن باڵوێز و پاشکۆ سەربازیەکان بۆیان هەیە سەرچاوەیان هەبێت لەو دەوڵەتانەدا کە کاری تێدا دەکەن. بە کارگرتنی سەرچاوەکان کارێکی ئاسان نییە، ئەتوانرێت لە ڕێگەی بیروباوەڕ یان پارە یان ترساندن سەرچاوە بەکار بگیرێت، هەروەها ئەبێت دەزگای هەواڵگری کۆنترۆڵی تەواوی هەبێت بەسەر سەرچاوەدا و نابێت سەرچاوە هەموو کارەکان بوویستی خۆی بکات. ئەتوانرێت بۆ باشتر ناسینی ئەو کەسانەی کە خۆیان هەڵئەبژێرن بۆ ئەوەی وەک سەرچاوە دەست بەکار بن چاودێری بکرێن و لەم ڕووەوە زانیاری لەسەریان کۆبکرێتەوە:

ئایا کێشەی دارایی هەیە؟ حەز و ئارەزووکانی چین؟ ئایا لە کەسایەتیدا لاوازییەک هەیە؟ دەتوانێت چ جۆرە زانیاریەک بەدەست بهێنێت ؟ دەتوانرێت لە چ دەوڵەتێکدا بچێنرێت؟ توانای لە بەرامبەر ڕووبەڕووبوونەوە سەختەکاندا. توانای نواندنی چۆنە؟ باشتر وایە سەرچاوە خاوەنی منداڵ نەبێت و خێزانی نەبێت.

پێویستی پێدەدات (وەک دەزگای کۆپیکردن و پەیوەندییەکان)، وە، بەگشتی، ئامانجی ئەوەیە دڵنیایی ئەوە بدات کە شەپۆلی گواستنەوەی زانیارییەکان بەردەوام بێت.

## جۆرەکانی ئەفسەری هەواڵگریی

لەبەر ئەوەی دەبێت خۆیان لە ڕاداری حکومەتی ئەو وڵاتە بەدوور بگرن کە چالاکی تیادا ئەنجام دەدەن، ئەفسەرانی هەواڵگریی نابێت شوێنێکی دیاریکراویان هەبێت بۆ ئەوەی بانگەشەی ئارەزووەکانیان تیادا بکەن بۆ پارەدان بۆ ئەوەی زانیاری نهێنی بەدەست بهێنن. ئەوان دەبێت ئەو کارە بکەن کە لە زمانی هەواڵگرییدا پێی دەوترێت "چالاکی پەنهانی"- واتە، هۆکارێکی قابیلکەر بۆ ئەوەی لە وڵاتێکدا بمێننەوە، سەرچاوەی دیاری پشتیوانی دارایی، بیانوویەک بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسانەی دەتوانن دەستیان بە زانیاری هەستیار، وە بابەتی پەیوەندیدار بگات...

لە زمانی هەواڵگری سەردەمیانەی ئەمریکیدا، جیاوازی لە نێوان "ئەفسەری شاراوەی "فەرمی" و "نافەرمی" کراوە. ئەفسەری شاراوەی فەرمی بریتییە لە ئەفسەرێکی هەواڵگریی دەمامکدار کە خۆی لە بەرگی دبلۆماتێک یان جۆرێک لە فەرمانبەری حکومی دەنوێنێت کە بەشێوەیەکی ئاسایی دەنێردرێتە وڵاتێکی بیانیی.[i] ئەفسەری نافەرمی[ii] بەو کەسە دەوترێت کە خۆی لە بەرگی بزنسمان، گەشتیار یان ڕۆژنامەنووس حەشاردەدات- ئەمە بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کە بۆچی ئەفسەرەکە لە وڵاتە خانەخوێکەیە.

---

[i] Official cover
[ii] Unofficial cover

ئەفسەری دەمامکداری نافەرمی ڕەنگە ناسنامەی خۆی بشارێتەوە وە وانیشان بدات کە خەڵکی وڵاتێکی ترە نەوەک خەڵکی ئەو وڵاتەی کە تیایدا دەزگای هەواڵگریی ڕایسپاردووە بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی دیاریکراو. ئەگەر وڵاتی خانەخوێ یەکێک بێت لەو وڵاتانەی کە بەشێوەیەکی ڕۆتینی پەنابەر وەربگرێت، ئەوا ئەفسەرەکە دەتوانێت بەم ڕێگایە بچێتە ناو وڵاتەکە.

بەکارهێنانی پێگەی فەرمی بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی چەندین سوودی هەیە. لە هەموویان دیارتر، دەتوانێت پارێزبەندی بە ئەفسەری هەواڵگریی بدات. ئەگەر هەست بە چالاکی سیخوڕیەکەی کرا، یاسای نێودەوڵەتی سنوور دادەنێت بۆ حکومەتی خانەخوێ بۆئەوەی وەک کەسێکی نەویستراو لەو وڵاتە ڕابگەیەنرێت وە دەریبکات لە وڵاتەکە.

سەرەڕای ئەمە، کارکردن وەک دبلۆماتێک دەبێتە هۆی پێشخستنی دەستگەیشتنی ئەفسەری هەواڵگریی بە هەندێ سەرچاوەی گرنگ و شاراوە؛ وەک دبلۆماتێک، ئەو کەسە، بەبێ ئەوەی وەک گومانلێکراو دەرکەوێت، چاوی بە بەرپرسانی وڵاتە خانەخوێکە بکەوێت لەکاتی ئەرکی ئاسایی خۆیدا، سەرەڕای ئەوەی دەتوانێت چاوی بەو دبلۆماتکارانەی وڵاتانی تر بکەوێت کە لەهەمان پایتەختدا نیشتەجێن. لەڕاستیدا، لەبەر ئەوەی وڵاتانی تریش کەسانی فەرمی دەمامکدار بەکاری نهێنی

بەکاردەهێنن بۆ ئەفسەرانی هەواڵگرییان، ئەو کەسە دەرفەتی ئەوەشی دەبێت چاوی بە ئەوانیش بکەوێت.[أ]

---

[أ] بەپێچەوانەوە، لە هەندێ حاڵەتدا چاوەدێری فەرمانبەرانی باڵیۆزخانەی بیانی و کەسانی بیانی بەشێوەیەکی گشتی لەلایەن دەزگای هەواڵگری وڵاتێکەوە بە شێوەیەک توونده کە تاکە ڕێگای سەلامەت بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ سەرچاوەی لە حکومەتی ئەو وڵاتەدا بریتییە لەوەی ئەفسەرە هەواڵگرییەکە لەژێر ناوی دبلۆماسیەتدا کاریکات بۆ پەیوەندی کردن پێیەوە بەشێوازێکی ناڕاددەیەک "کراوە". بۆ نموونە، لە کەیسی تۆلیگ پێنکۆفسکی، سەرهەنگ(عەقید) لە هەواڵگری سەربازی سۆڤیەت کە بۆ دەزگای هەواڵگری بەریتانیا وە ئەمریکا لە سەرەتای ساڵانی شەستەکاندا کار دەکرد، پرسە هەر هەستیارەکە ئەوە بوو کە چۆن پەیوەندی پێوە بکرێت لە مۆسکۆ، کە تیایدا چاودێری دژەهەواڵگریی سۆڤیەت زۆر توونـد بوو لە هەمبەر هەر هەوڵێک بۆ چاوپێکەوتن یان قسەکردن لەگەڵ ناوبراو بەشێوەیەکی نهێنیی. لەکۆتاییدا، بڕیاردرا کە ئەو دەرفەتە بقۆزنەوە کە پێنکۆفسکی چاوی بە چەندین دبلۆماتی ئەمریکی بەریتانی بکەوێت لە مەودای کاری ئاسایی خۆی کە زانست و تەکنەلۆژیا بوو. دەکرێت ئەفسەرێکی هەواڵگریی لەم سەینوبەینەدا خۆی لە بەرگێکی ساختەی دبلۆماسیدا بنوێنێت؛ ناوبراو هێمایەک بەکاردەهێنێت(وەک گرێدانی بۆینباخێکی سووری گوڵدار) بۆ ئەوەی ڕێگا بە پێنکۆفسکی بدات بیناسێتەوە. دوای ئەوەی پەیوەندیەکەی خۆی ناسیەوە، پێنکۆفسکی پێی دەوترێت کە "بڕوانە سەرئاو، با وای دابنێین، وە [دبلۆماتکارەکە/ئەفسەری هەواڵگریی] دوای پێنج خولەکی تر بەدواتدا دێت وە پەیامەکە تۆ هەڵدەگرێت. لەم دۆخەدا، پێویست بە گفتوگۆی کەسێی یان هیچ شتێکی تر ناکات. [ئەم جۆرە چاوپێکەوتنانە]... سەلامەت بوون چونکە لەماوەی دوو یان سێ خولەکدا تۆ دەزانی کە پەیامەکە لە دەستێکی سەلامەتدایە وە کارەکە تەواو بووە. هیچ پێویست بە گەشتکردن ناکات... ئەم میتۆدە سەلامەتترین ڕێگایە

هەروەها، دانانی سیخوڕی هەواڵگریی لەناو باڵیۆزخانەیەک لەژێر دەمامکی کەسێکی فەرمی دڵنیایی ئەوە دەدات کە ئەگەر کەسێکی ئەو وڵاتە لە باڵیۆزخانەکە نزیک بێتەوە بە زانیاری هەستیار، ئەوا دەتوانرێت مەسەلەکە لەلایەن سیخوڕێکی پرۆفیشناڵەوە چارەسەر بکرێت. لەم ڕووەوە، بوونی ئەفسەرێکی فەرمی دەمامکدار بە کۆکردنەوەی زانیاریی هەوڵەکان ئاسان دەکات لەلایەن ئەو هاوڵاتیانەوە کە خەڵکی ئەو وڵاتەن بۆ ئەوەی پەیوەندی بە دەزگا هەواڵگرییەکە بکەن؛ ئەم جۆرە پێگانە سوودێکی زۆریان هەیە وە ڕەنگە پێویستیش بن، بەتایبەتی لەو وڵاتانەی کە یاساکانیان قورسە بۆ هاوڵاتیانیان کە گەشتی دەرەوەی وڵات بکەن یان پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە بکەن.

لەکۆتاییدا، دەمامکداری فەرمی چەند توانایەکی کارگێڕیی تایبەتی هەیە. دەکرێت ئەفسەرەکە پارەی پێبدرێت، وە پرسە کارگێڕیەکانی تریش چارەسەر دەکرێن، بەهۆی کەناڵی ئاسایی حکومەتەوە، وە پەیوەندیەکان دابین دەکات لەگەڵ بارەگای سەرەکی دەزگای هەواڵگریی. لەهەمانکاتیشدا کەسای دەمامکداری فەرمی چەندین زیانیشی هەیە. وەهەروەها، بەهۆی ئەو ژمارە کەمەی کە دیاری دەکرێن بۆ کارکردن لە وڵاتێکی خانەخوێی دیاریکراو، دەزگاکانی دژە هەواڵگریی ئەو وڵاتە ڕەنگە بتوانێت درک بەوە بکات کە کامە "دبلۆمات" ئەفسەری هەواڵگرییە وە کامەیان هەو نییە. بۆیە، دەبێت ئەو ئەفسەرانە زۆر وشیار بن لە ئەگەری هەر چاوەدێرییەکی تەلەفۆن، جوڵە، وە تەنانەت چاوەدێریکردنی ماڵەکەشی لەلایەن دەزگای

---

لەم جۆرە دۆخانەدا." جێگای داخە کە پینکۆفسکی لە کۆتاییدا بە تاوانی سیخوڕیکردن گیرا و دواتر کوژرا.

هەواڵگری خانەخوێ. مومارەسەکردنی بەکرێ گرتنی خەڵکی وڵاتی خانەخوێ بۆ کارکردن لە باڵیۆزخانە لە چەند بوارێکی کارکردنی تایبەتدا ڕەنگە ببێتە هۆکاری ئاسانکردنی چاوەدێریی، بەتایبەتی لەو وڵاتانەی کە تیایاندا هەموو کەسێک ڕێگای پێدراوە لە باڵیۆزخانەیەکی بیانیدا کاربکات وە هەماهەنگی لەگەڵ دەزگای هەواڵگریی وڵاتە خانەخوێکەدا هەبێت.[i] سەرەڕای ئەمەش، شێوازی ئاسانتر و هەرزانتر ڕەنگە بتوانن هەمان ئامانج بپێکن. بۆ نموونە، ئەو بابەتانەی لەلایەن وڵاتێکەوە چاپ و بڵاودەکرێنەوە ڕەنگە بەکاربهێن بۆ زانینی پیشەی ئەفسەرە هەواڵگرییە بیانیەکانی ■ ئەو شێوازەی کە پەیوەندی هەواڵگریی دەستنیشان دەکات، ئاشکرا دەبێت.

هەروەها، لەوکاتەی ئەفسەری فەرمی دەمامکداری نهێنی ڕەنگە دەستی بە هەندێ سەرچاوەی شاراوە بگات (بەزۆری زانیاری دەربارەی دبلۆمات و کاربەستانی تری وڵاتی خانەخوێی کە پەیوەندییان بە ئاسایشی نیشتیمانییەوە هەیە)، ڕەنگە ڕێ لە دەستکەوتنی زانیاری لە هەندێکی تر بگرێت کە سوودڵ بن لە مامەڵە کردن لەگەڵ کاربەدەستانی بیانی، جا ■ بەگشتی یاخود لەگەڵ ئەوانەی خەڵکی وڵاتێکی دیاریکراون. لە هەر حاڵەتێکدا بێت، بەکرێگیراوی شاراوە یەکسەر ئاگاداردەکرێنەوە کە ئەوان مامەڵە لەگەڵ کاربەدەستێکی حکومەتێکی بیانیدا دەکەن، وە ئەمە دەبێت هۆی ئەوەی زیاتر ئاگادار بن. سەرەڕای ئەمە، ئەگەر پەیوەندییە دبلۆماسییەکان پچڕان، هەروەک ڕەنگە لە حاڵەتی جەنگ یان قەیرانی

---

[i] Ronald Kessler, Moscow Station: How the KGB Penetrated the American Embassy (New York: Scribner, ١٩٨٩).

توونددا ڕوویدات- کاتێک هەواڵگریی باش ڕەنگە لە هەموو کاتێک زیاتر پێویست بێت- ئەفسەری فەرمی دەمامکدار دەبێت یەکسەر وڵاتەکە جێبهێڵێت، بەو جۆرەش دەبێت هەموو ئەو ئۆپەراسیۆن و تۆڕانەی کە دروستیان کردووە هەڵبوەشێننەوە.[i]

سوود و زیانەکانی کەسانی نهێنی نافەرمی بریتیین لە پێچەوانەی ئەو شتانەی کە پێشووتر باسمان کردن. لەلایەکی ترەوە، لەبەر ئەوەی ئەوان وەک ئەندامی چالاک و زیندووی دەزگایەکی هەواڵگریی و کۆمەڵگایەکی تایبەتن، دەکرێت ئەو کەسە دەمامکدارە نهێنییە نافەرمیانە بەشێوازێکی تر دەستیان بە سەرچاوەی فراوانتر بگات کە هەرڵبدەن ببنە خاوەنی ناسنامەی ئەوە وڵاتەی کە بۆی نێردراوە کاری تیادا بکات. نادیاریی و شاراوەیی پەیوەندی لەگەڵ حکومەتەکە کە کاری بۆ دەکەن هاوکار دەبێت لە دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ سەرچاوەی گرنگ و هۆکارێکی باشە بۆ ئەوەی ئەو پەیوەندییانە بمێننەوە.

لەلایەکی ترەوە، ئەفسەری نافەرمی دەمامکدار ژمارەیەک خاڵی لاوازی هەیە. تێچوو و بارگرانی ئیداری ئەفسەری نافەرنی زۆر زیاتر لە هی

---

[i] نموونەی هەر بەرچاوی ئەم بابەتە داگیرکردنی باڵیۆزخانەی ئەمریکایە لە تەهران لەساڵی ١٩٧٩ (وە بە بارمتەگرتنی کارمەندانی) کە بووە هۆی پەکخستنی تەواوی ئۆپەراسیۆنەکانی کۆکردنەوەی زانیاری مرۆیی لەم وڵاتە. کاتێک پلان دانرا بۆ دەستکردن بە ئۆپەراسیۆنێکی سەربازیی بۆ ڕزگارکردنی بارمتەکان، هیچ "هەواڵدزێکی ئەمریکی نەمابوو،" وە دەزگای سی ئای ئەی ناچارکرا بۆ ئەوەی هەواڵدزێک بخزێنێتەناو ئێرانەوە بۆ ئەوەی هاوکار بێت لە کۆکردنەوەی زانیاری پێویست بۆ پلانی هەوڵی ڕزگارکردنەکە. ئاشکرایە، کە پلانەکە سەرکەوتوو نەبوو وە دواتر لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە دوای ٤٤٤ ڕۆژ نێردرانەوە ئەمریکا.

ئەفسەری فەرمی نهێنیی. یەکێک لە شێوازەکان بریتییە لە قاییلکردنی دەزگایەک یان دامەزراوەیەکی تایبەتی بۆ ئەوەی ڕێگا بدات ئەفسەرێکی هەواڵگریی خۆی وەک ئەندامێکی دەزگاکە کاربکات. لەسەرێکی ترەوە، دەکرێت ئەفسەرەکان کاری خۆیان دابمەزرێنن یان لەو کارانە تیوەبگلێن کە بەڵگەیەکی باش بێت بۆ بوونیان لە وڵاتی ئامانجدا. لێرەدا ڕێگرەکە بریتییە لەوەی کە ئەمە نەک تەنیا زۆری تێدەچێت بەڵکو پێویستی بەوەشە ئەفسەری هەواڵگریی کاتێکی زۆر تەرخان بکات بۆ ئەنجامدانی چالاکییە "نهێنی"یەکەی ئەگەر ئەو کەسە بیەوێت قاییلکەر بێت، کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی کات و هەوڵدانی ئەفسەرەکە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری سەرەکی پێویست. بەدەستهێنانی زانیاری لە ڕێگای گەیاندنەوە تەنانەت ئەستەمترە، چونکە ئەفسەری نافەرمی ناتوانێت بەشێوەیەکی ئاسایی سوود لە ئامێرەکانی گەیاندنی باڵیۆزخانە وەربگرێت بەبێ ئەوەی نەبێتە هۆی گومان لەلایەن کارمەندانی ئەو شوێنەوە کە ئەرکی ئەو لە ئەساسدا بریتییە لە خۆپاراستن لەوەی بێتە جێگای سەرنجی کەسانی دەورویەری.

یەکێک لە بەناوبانگترین و سەرکەوتوترین ئەو کەسانەی لەژێر ناوی پۆستی نافەرمییەوە کاری سیخوڕی ئەنجامدەدات، بریتیی بوو لە *ریچارد سۆرج* کە هاوڵاتیەکی ئەڵمانی بووە وە کاری پەیامنێری بۆ یەکێک لە بەناوبانگترین ڕۆژنامەکانی ئەڵمانیا دەکرد.[i] ناوبراو سیخوڕی یەکێتی

---

[i] ریچارد سۆرج ناوێک کە ڕەنگە نادیار و نەناسراو بێت لامان کاتێ بەرچاوی هەرخوێنەرێکی ئاسایی ئەکەوێت لە هەرشوێنێکی جیهان، بەڵام لە مێژووی سیخوڕی

جیهانیدا جێگایەکی گەورە داگیر ئەکات، ئەو تاکە سیخوڕە کە لەمێژوودا ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لە یەکلاکردنەوەی ئەنجامەکانی شەڕی جیهانی دووەم، یان بەمانایەکی وردتر (سۆرج) سەرەڕای کۆتایی هاتنی چارەنووسی بەو شێوەیە بە سەرکەوتووترین جاسوس دادەنرێت کە مێژوو ناسیبێتی هەتا ئەم ساتە.

لە فایلە ڕەسمیەکاندا (سۆرج) وا باس کراوە کە خاوەنی کەسێتیەکی لێهاتووە و کەسێکی ڕۆشنبیر و زیرەکە و توانای تێگەیشتنی زۆرە و خۆڕاگرە، هەرشتێک کە ڕووبەڕووی ببێتەوە دەتوانێ لێی تێبگات و سرووشتی کەشف بکات بەشێوەیەکی گونجاو مامەڵەی لەگەڵدا بکات ئەمە دەربارەی کەسایەت (سۆرج).

بەڵام دەربارەی لێهاتووییەکانی لە بواری کردەیدا خاوەنی توانایەکی بەڕێوەبردنی نایابە بەوردبینی و بەهێزی کەسێتی خۆی، (سۆرج) سەرکەوتوترین و کاملترین تۆڕی سیخوڕی بەڕێوەبردووە لە ناوخۆی (چین) و (یابان) لەماوەی جەنگی جیهانی دووەم. بەڵام تەنانەت ئەم هۆکاری ناوبانگ و لێهاتوویی ئەو نیە لە جیهانی سیخوڕیدا کە ململانێکان تێیدا بۆ یەک چرکەش ناوەستن لە جەنگ یان لە ئاشتیدا، بەڵام ناوبانگ و لێهاتوویی ئەو کە بە وەسف کردنی بە دەیان کتێب تەواو نابێت دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو تاکە سیخوڕە لە مێژووی سیخوڕیدا کە توانیویەتی کاریگەری لەسەر گۆڕینی ڕێڕەوی گەورەترین جەنگی کاولکەر هەبێت. (ریچارد سۆرج) لەشاری (باکۆ)ی ڕووسی هاتۆتە دنیاوە لە باوکێکی ئەڵمانی و دایکێکی ڕووسی، ئەو تەمەنی ٣ساڵ بوو کە خێزانەکەی گەڕانەوە بۆ ئەڵمانیا، (سۆرج) کوڕی دووەمی ئەندازیارێکی ئەڵمانیە کە لە کێڵگە نەوتیە شاهانەکاندا کاری کردووە، وە نەوەی (ئەدۆڵف سۆرج)ە کە سکرتێری تایبەتی بیرمەند (کارل مارکس)ە و یەکێکە لەوانەی کە لەسەرەتاوە باوەڕیان بە شیوعیەت هێناوە. (سۆرج ) لە سەرەتادا پەیوەندیکرد بە یەکێ لە تیپە سەربازیەکانی ئەڵمانیا لە شەڕی جیهانی یەکەمدا وەک بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر لەسەر سۆزی ئەو بۆ ئەڵمانیا و ئیمپراتۆر، لە شەڕدا سێ جار بریندار بوو، دواجار برینەکەی سەخت بوو بۆیە

مۆڵەتی پێدرا بۆ ماوەیەکی زۆر لە جێگادا بمێنێتەوە و لەو ماوەیەدا بیری لە هۆکارە سیاسی و ئابووریەکانی هەڵگیرساندنی ئەو جۆرە جەنگانە دەکردەوە و لەو ماوەیەدا کاریگەر بوو بە بیری شوعی و بوە کەسێکی مارکسی، قۆناغەکانی خوێندنی بەسەرکەوتووی تەواوکرد و لە کۆتاییدا بڕوانامەی دکتۆرای لە زانستەسیاسیەکاندا بە دەستهێنا لە زانکۆی هامبۆرگ.

پاشان بەڕەسمی پەیوەندی بە حیزبی شیوعیەوە وەک ئەندامێکی دڵسۆزی حیزب خزمەتی ڕێبازەکەی دەکرد، ماوەک برین پێنج بوو پاشان بووە ڕۆژنامە نووس و شارەزاییەکی لە تەواوی لە کارو باری جیهانیدا پەیدا کرد لە ڕووی سیاسی و ئابوری و سەربازیەوە و تا ئەو رادەیەی کە هەواڵگری ڕووسی داوایان لێکرد هاوکاریان بکات لە دامەزراندنی نووسینگەی هەواڵگری لە بارەگای حیزبدا لە مۆسکۆ، سۆرج لێهاتووی خۆی دەرخست لەو کارەدا و پاش ئەوەی بوو بە هاوڵاتیەکی ڕووسی بە نهێنی گوازرایەوە بۆ خزمەتکردن لە سەرکردایەتی گشتی سوپای سور لە کۆتایدا ڕەوانەکرا بۆ (شەنگەهای ) تا سەرپەرشتی تۆڕی سیخوڕی بکات و پاشان لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٣٣ بانگهێشت کرایەوە بۆ مۆسکۆ و ئەرکی دامەزراندنی تۆڕێکی سیخوڕی لە (تۆکیۆ)ی پایتەختی یابان پێسپێردرا کە ئەوەش لەو سەردەمەدا بە کارێکی ئەزموونی دەهاتە ئەژمار لەبەر ئەوەی سۆرج وەک کەسێکی بیانی دەبێتە جێگەی سەرنجی یابانیەکان. بەرپرسانی هەواڵگری لە ڕووسیا (سۆرج) بە شیاوترین کەس دەزانی بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە لەبەرئەوەی دیمەنی خۆی وەک ئەڵمانیەک دەکاتە پەردەو لە توانایدایە خۆی وەکو ئەڵمانیەکی تەواو نیشان بدات. سەرەتا پێویست بوو لەسەر (سۆرج)کە بچێتەوە بۆ ئەڵمانیا و پشتگیری ئەو وڵاتە بەدەست بهێنێت تاوەکو ببێت بە نوێنەریان لە (تۆکیۆ) بۆ ئەم مەبەستە هەواڵگری ڕووسی چەند بەڵگەنامەیەکی بۆ دەستەبەرکرد و کە بەهۆیەوە بەئاسانی گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا بێ هیچ گرفتێک ، پاش ماوەیەک ژیان لە ئەڵمانیادا توانی پاسپۆرتی ئەڵمانی بەدەستبهێنێت ، گرنگترین کار کە (سۆرج)

---

بە زیرەکی خۆی ئەنجامیدا بەدەستهێنانی متمانەی بەرپرسانی حیزبی نازی ■ کە بۆ ئەو مەبەستە تۆڕەی پڕوپاگەندەکانی ئەو حیزبەی خوێندەوەو ووتە بەناوبانگەکانی هیتلەری لەبەرکرد لە کۆڕ و کۆبونەوەکان دەیوتەوە و تەنانەت چەند جارێک کتێبی (خەباتی من)ی هیتلەری خوێندەوە.

هەموو ئەمانەش هۆکار بوو بۆ ئەوەی ■ بەرپرسانی حیزبی نازی وەک ئەندامێکی دڵسۆزی ئەو حیزبە قبوولّی بکەن ، دوای ئەوەی ■ بەتەواوەتی متمانەی نازیەکانی بەدەستهێنا (بەرلین)ی بەرەو (تۆکیۆ)جێهێشت بۆ دەستکردن بە کارە نوێیەکە■ لە (تۆکیۆ) خۆی وەک ئەڵمانیەکی دڵسۆزی وولاتەکەی دەرخست ■ بەو بەڵگەنامانەی ■ لەئەڵمانیا بەدەستی هێنابوو توانی خۆی وەک پەیامنێری رۆژنامەی (فرانکفۆرت زیتۆج)بناسێنێت، کە بەناوبانگترین رۆژنامەی ئەڵمانیا بوو.

لەو کاتەدا (سۆرج) تەمەن ٣٧ ساڵ بوو کە باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا لە (تۆکیۆ)ی پایتەختی یابان پێشوازیان لێکرد، هەر لەسەرەتای ئەم ئەرکەوە سۆرج توانی لێهاتووی خۆی بسەلمێنێت، هاوڕێیەکی یابانی پەیداکرد بە ناوی(ئەریتۆی مینسۆکادۆ) کە ئەویش پەیامنێری رۆژنامە بوو، سۆرج داوای لێکرد ژوورێکی لە یەکێک لە هۆتێلەکاندا بۆ بدۆزێتەوە، لەو کاتانەدا هەواڵگری یابانی بە وردی چاودێریان دەکرد و سۆرجیش زۆر لێهاتوانە مامەڵەی دەکرد تا ئەو ئاستەی یابانیەکان بێهیوا بوون لە چاودێریکردنی. ئەو ماوەیەی کە هەواڵگری رووسی بۆ (سۆرج)یان دانا بوو تا تۆڕەکەی دابمەزرێنێ تەنها ٢ ساڵ بوو، لەو ماوەیەدا (سۆرج)تۆڕەکەی دامەزراند بە سێ ئەندام ئەوانیش:

- برنار: ئەڵمانی ■ دەرچووی قوتابخانەی مۆسکۆ بوو بۆ ئامێری بێتەل، ئەرکەکەی دامەزراندن و بەڕێوەبردنی ئامێری بێتەل بوو.
- برانکۆدی فۆکلیچ: یوگسلافی بوو بە رووکەش وەک وێنەگری گۆڤارێکی فەرەنسی کاریدەکرد.

---

-میاجی جۆکوتۆ: یابانی بوو تەمەنی ٣٠ ساڵ بوو هونەرمەند بوو ، لەتەمەنی ١٦ ساڵیدا چوو بوو بۆ کالیفۆرنیا و لەوێ پەیوەندی کردبوو بە حیزبی شیوعیەوە. لەساڵی ١٩٢٤ دوای ساڵێک لە دامەزراندنی تۆڕەکە (سۆرج) هەستا بە دوو کردار کە کاری تۆڕەکەی بەرەو پێشەوە برد ئەوانیش:

-بەکرێگرتنی خانوویەکی دوو نهۆم لەگەڕەکی ئازابۆکو ژمارە ٣٠ لە ناگازاکی کە نزیکی بنکەی پۆلیس بوو ئەمەش ببوە پەردەیەک بۆ چالاکیەکانی ٢-دامەزراندنی یابانیەکی تر لە تۆڕەکەدا کە ناوی تۆزاکی هۆکۆسی بوو، شیوعیەکی دڵسۆز بوو بەڕەسمی ئەندامی حیزب بوو، کە دواتر ببووە بەسوود ترین ئەندامی تۆڕە سیخوڕیەکەی (سۆرج).

پاش دامەزراندنی تۆڕە سیخوڕیەکە (سۆرج )لەڕێگەی نیۆرکەوە سەفەری مۆسکۆی کرد و لەوێ پاسپۆرتێکی ساختەی پەیداکرد بۆ تا سەفەرکردنی بۆ ڕووسیا لەسەر پاسپۆرتەکەی دیار نەبێت لەگەڵ خۆیدا زۆرترین زانیاری هەڵگرتبوو، بەرپرسانی هەواڵگری ڕووسی پێشوازیەکی گەرمیان لێکرد و دوو بابەتی سەرەکیان لەگەڵدا تاوتوێکرد ئەوانیش:

ئایا یابان هێرش دەکاتە سەر ڕووسیا؟ ئەگەر هێرش دەکات ئامادەیی یابان تاچ ڕادەیەکە بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ دژی ڕووسیا.

پاشان سۆرج گەڕایەوە بۆ تۆکیۆ و دەستیکردەوە بەچالاکی ناردنی زانیاری، دەرکەوت کە برنار کە بەرپرستی ئامێری بێتەل بوو لە تۆڕەکەی سۆرج کەسێکی شیاو نیە بۆ ئەو کارە ، لەبەر ئەوەی زۆر دواکەوت لە دامەزراندنی ئامێرە کەو ترسێکی زۆری هەبوو ئەمەش وای لە سۆرج کرد کە بیگۆڕێت بە کەسێکی تر ئەویش (ماکس کلاوزۆنی) بوو کە فیتەرێکی ئەڵمانی بوو.

تۆڕەکە لەو ماوەیەدا چالاکیەکانی خۆی بەباشی بەڕێوە دەبرد، یەکەم تاقیکردنەوەی تۆڕەکە لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٦ دا بوو کاتێک ئاژاوەیەکی سەبر ڕوویدا لە تۆکیۆ کە تێیدا ٢٤٠٠ سەرباز بەسەرکردایەتی هەندێ لەئەفسەرانی سوپا

دەستیان گرت بەسەر چەند بینایەکی حکومەتدا، و کەوتنە تیرۆرکردنی گەورەبەرپرسان لە ماڵەکانی خۆیاندا، ئەم ئاژاوەیە گرنگی خۆی هەبوو، خێرا سۆرج داوای لە تۆرە سیخوڕیەکانی خۆی کرد کە یارمەتی بدەن لە زانینی هۆکاری ڕوودانی ئەم ئاژاوەیە، سۆرج لەو کاتەدا بە زیرەکی خۆی سەردانی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیای کرد (وەک پێشتر ووتمان توانیبوی متمانەی ئەوان بە دەستبهێنێت)، و چاوی کەوت بە باڵیۆز(هربرت فۆن) لەگەڵ پاشکۆی سەربازی و پاشکۆی دەریایی باڵیۆزخانە، پێشنیاری کرد کە هەرسێکیان لە لایەن خۆیەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەن لەسەر هۆکاری ڕوودانی ئەو ئاژاوەیە و لە کۆتاییدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان بکەن بەیەک، سۆرج هێندە ڕێزی پەیدا کردبوو کە باڵیۆزی ئەڵمانیا هەرزوو پێشنیارەکەی پەسەند کرد، ئەمەش وایکرد کە سۆرج لێکۆڵینەوەکانی ئەوان ببینێت و زانیاری گرنگی چنگ بکەوێت کە پاشکۆی سەربازی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا لە تۆکیۆ دەستی کەوتبوو دەربارەی هێزی سەربازی یابانی ئەو زانیاریانە بریتیبوو لە چەندین کتێب و ڕاپۆرت و بڵاوکراوە کە ئەوەندە بەنرخ بوو سۆرج دەرگای نوسینگەکەی لەسەر خۆی داخست و بەکامێرایەکی بچووک وێنەی گرت تا بینێرێ بۆ مۆسکۆ.

سۆرج لە یەکەم تاقیکردنەوەیدا سەرکەوتووبوو وەک سیخوڕێکی ڕووسی لە تۆکیۆ لێهاتووییەکی کەم وێنەی پیشاندا لە کۆکردنەوەی زانیاری و قۆستنەوەی دەرفەت و ئاراستەکردنی بۆ بەرژەوەندی خۆی.

کاتێ جەنەراڵ (لیۆشکۆف)ی ڕووسی سوپای ڕووسی بەجێهێشت و رایکرد بۆ یابان بەهۆی ئەو زانیاریە زۆرەی کە لەلای بوو ڕەوانە تۆکیۆ کرا بۆ لێکۆڵینەوە لەو کاتەدا کە ئەڵمانیا کە هاوپەیمانی یابان بوو پێشنیاری کرد کە شاندێکی ئەڵمانی بنێرن بۆ تۆکیۆ بۆ لێکۆڵینەوە لەو زانیاریانەی کە ئەو جەنراڵە بە یابانیەکانی داوە دەربارە تواناو هێزی سوپای ڕووسیا، ئەوە بوو شاندەکە زانیاریەکانی لە لەو جەنەراڵە هەڵهاتووەی سوپای ڕووسیا وەرگرتبوو لە ڕاپۆرتێکدا کۆکردەوەو

کۆپیەکی پێشکەشی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا لە تۆکیۆ کرد سۆرجیش بەهۆی ئەو متمانەیەی لە لەلای بەرپرسانی ئەو باڵیۆزخانەیە هەیبوو توانی وێنەیەک لەو راپۆرتەی دەستکەوێت و هەرزوو بە بێتەل ڕەوانەی مۆسکۆی کرد، لەو راپۆرتەدا هاتبوو کە (لیۆشکۆف) جفرەی سوپای ڕووسیای بۆ یابانیەکان ئاشکرا کردبوو، ئەمەش وای کرد هەرزوو ڕووسیەکان جفرەکەیان بگۆڕن.

لەسەرەتای ئۆکتۆبەری۱۹۳۹ دەزگای ئاسایشی یابانی کەوتە چاودێریکردنی سۆرج ئەمەش لەبەر ئەم هۆکارانە:

- کەسێکی بیانیە (لە یابان چاودێری بیانیەکان دەکرێت)
- ڕۆژنامەنووسە.
- هاموشۆی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا دەکات.

ئاسایشی یابانی کارمەندێکی ۲۸ساڵی کرد بە چاودێر بەسەریەوە کە بە بێدەنگی چاودێری سۆرجی دەکرد هەڵسوکەوتەکانی دەنووسی بە شێوەیەک کە سۆرج هەستی پێنەکات، ڕۆژانە تەنها یەک کاتژمێر چاودێری دەکرد. لەو کاتانەدا ئەڵمانیا پۆڵەندای داگیر کردبوو بەپێی ڕێککەوتنێک لەگەڵ ڕووسیادا دابەشیان کردبوو، هەروەها ئەڵمانیا پاش داگیرکردنی پۆڵەندا پلانی هێرش کردنە سەر ڕووسیای هەبوو لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

- داگیرکردنی کێڵگە گەنمەکانی ڕووسیا
- دەستکەوتنی یەک ملیۆن دیل بۆ کارکردن لە بواری پیشەسازی و کشتوکاڵ لە ئەڵمانیا
- نەهێشتنی مەترسی سنوری ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا. ئەوەی لەسەر هەواڵگری ڕووسیا پێویست بوو کە بزانێت ئایا ئەڵمانیا بەڕاستی پلانی هێرشکرنە سەر ڕووسیای هەی؟ ئەگەر ئەڵمانیا هێرش دەکات ئەوا چ بەروارێک بۆ ئەو هێرشە دیاریکراوە؟

ریچارد سۆرجی بەتوانا بەهۆی زیرەکی خۆیەوە لەگفتوگۆیەکی ئاسایدا لەگەڵ پاشکۆی سەربازی باڵیۆزخانەی ئەڵمانی لە تۆکیۆ توانی بەرواری هێرشی ئەڵمانی

بۆسەر ڕووسیا بزانێت بۆی دەرکەوت کە ئەو هێرشە لەلایەن ئەڵمانەکانەوە ئامادەکاری تەواوی بۆ کراوە و نزیکە ۱۸۰ تیپی ئەڵمانی لەسەر سنووری ڕووسیا کۆکراونەتەوە بەپاڵپشتی تانک و زرێپۆش بەرواری هێرشەکەش ۲ی حوزەیران بوو.
ئەم زانیاریانەش گرنگی خۆی هەبوو لەبەر ئەوەی وەک ووتمان پێشتر ڕێکەوتنێکی سەربازی لەنێوان ڕووسیا و ئەڵمانیادا هەبوو ، سۆرج هەرزوو ئەو زانیاریانەی لەڕێگەی (ماکس کلاوزین) کە بەرپرسی بێتەلی تۆڕەسیخوڕییەکە بوو ڕەوانەی مۆسکۆ کرد بەڵام بەرپرسانی مۆسکۆ گومانیان لە ڕاستی زانیارییەکان هەبوو ئەمەش سۆرجی زۆر تووڕە کرد ، کە ئەڵمانیا لە بەرواری دیاریکراودا هێرشی بۆسەر ڕووسیا دەستپێکرد ئەوکاتە ڕووسەکان ڕاستی زانیارییەکانی سۆرجیان بۆ دەرکەوت، پاش هێرشی ئەڵمانیا ڕووسەکان دەیانویست نیازی یابانییەکان بزانن کە ئایا نیازی هێرشکردنە سەر ڕووسیایان هەیە لە باکورەوە؟ لەبەرئەوەی یابان و ئەڵمانیا هاوپەیمان بوون ، سۆرج ئەو پرسیارەی لە باڵیۆزخانەی یابانی کرد و بۆی دەرکەوت کە یابان قورسایی هێزەکانی خستوەتە سەر بەرەی خۆرئاواو ئامانجی یەکەمی بەرەنگار بوونەوەی ئەمریکایەو ئامادە نییە هێرش بکاتە سەر باکوری ڕووسیا، بێگومان ئەم زانیاریانەش گرنگی سەربازی خۆیان هەبوو لەبەرئەوەی سەرکردایەتی سوپای سور هێزەکانی وولاتەکەی لەباکوری ڕووسیا کشاندەوەو تەرخانی کرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی ئەڵمانیا لە خۆرهەڵات تا لە کۆتاییدا توانی ئەو دوژمنە لە خاکی وولاتەکەی وەدەرنێ.
ئەو کەسەی کە پۆلیسی یابانی ئاراستەی تۆڕەکە کرد بێ ئەوەی بزانێ کەسێک هەبوو بە ناوی (ئیتۆ ریتیسۆ) کە لەیابان گیرابوو بە تۆمەتی شیوعیەت، کاتێ لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرا پرسیاری لێکرا کە ئایا کەس دەناسێ لە شیوعیە یابانییەکان بەتایبەتی ئەوانەی کە بەم دواییانە لە ئەمریکا گەڕاونەتەوە؟ ئیتۆ لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا ووتی کە پووری خزمەتیماڵێک دەکات کە خاوەنەکەی ئافرەتێکە چەند ساڵێکە لە ئەمریکا گەڕاوەتەوە و شانازی بەوەوە دەکەن کە

سۆڤیەت بوو لە وڵاتەکانی چین و ژاپۆن لە ساڵانی سیەکانی سەدەی ڕابردوو تا ئەو کاتەی لە پاییزی ١٩٤١دا دەستگیرکرا. پەیوەندییە نزیکەکەی لەگەڵ کارمەندانی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا لە تۆکیۆ، بەخودی باڵیۆزیشەوە، بووە هۆی ئەوەی دەستی بە زانیاری زۆر و زەوەند بگات دەربارەی پلانەکانی جەنگی ژاپۆنی ئەڵمانەکان. ماوەیەکی کەم پێش دەستگیرکردنەکەی، سۆرج لە ڕاپۆرتێکیدا چەند زانیارییەکی گرنگی بۆ یەکێتی سۆڤیەت نارد کە تیایدا هاتبوو، "ڕۆژهەڵاتی دووری سۆڤیەت سەلامەت دەبێت لە هێرشی ژاپۆنیەکان." بەگوێرەی ڕاپۆرتەکەی ناوبراو، ژاپۆن بڕیاریدابوو هێرش نەکاتە سەر یەکێتی سۆڤیەت؛ بەڵکو لە جیاتی ئەم کارە، هێرش دەکاتە سەر باشوور و خۆرهەڵات لە زەریای هێمن دژی ئەمریکا و بەریتانیا و هۆڵەندا لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا. بەپشت

---

شیوعیە، پۆلیسی یابانی سەرەتا کەوتنە چاودێری کردنی ئەو ماڵە، ئەو ماڵەش ماڵی خاتو (کیتابایاش) بوو کە هاوڕێی (میاجی) ئەندامی سێیەمی تۆڕەکەی سۆرج بوو، لە کاتی لێکۆڵینەوەدا دانی بەوەدا نا کە ئەندامی حیزبی شیوعی بوون لە ئەمریکا، بەم شێوەیە میاجی دەستگیر کراو چەند بەڵگەنامەیەکیان لەماڵەکەیدا دۆزیەوە دەربارەی یەدەگی پترۆڵی نەوتی یابان کە ئەو زانیاریانەش زۆر نهێنی بوون ، دوای لێکۆڵینەوە میاجی دانی بە هەموو شتێکدا ناو سەرجەم ئەندامانی تۆڕەکە دەستگیرکران و لەساڵی ١٩٤٢ دادگایکران و سۆرجیش بە لەسێدارەدان سزادرا و لەماوەی دەستگیرکردنیشی بەرپرسانی ڕووسیا نکوڵیان لێکرد و ئامادەنەبوون هاوکارییکەن ، پاش تێپەڕینی بیست ساڵ بەسەر لەسێدارەدانی سۆرج ڕووسیا دانییێدانا و شەقامێکی سەرەکی لە باکۆ زێدی لەدایک بوونی بەناوەونا هەروەها ناوی کەشتیەکی بارهەڵگری بەناوی ئەوەوە ناو هەروەها پوولێکی دەرکرد کە وێنەی ئەوی لەسەر بوو وەک پاڵەوانێکی ڕووسی.

بەستن بە راپۆرتەکەی *سۆرج*، *ستالین* بەبێ ترس و دڵەراوکێ هەڵسا بە گواستنەوەی سەدان هەزار سەرباز لە خۆرهەڵاتی دوورەوە بەرەو مۆسکۆ، کە لەوێ هاوکاری هێزەکانی تر بکەن بۆ راگرتنی پێشڕەوییەکانی ئەڵمان لە زستانی ١٩٤١-٤٢دا. لە ئەنجامدا، وەستاندنی ئەڵمانەکان لە دەرەوەی مۆسکۆدا بووە خاڵی وەرچەرخانی جەنگەکە.

یەکێکی تر لە نموونە هەرە سەرکەوتووەکانی بەکارهێنانی سیخوڕی نافەرمی، نموونەیەک کە بەهای توانایی گۆڕینی ناسنامەی کەسێک دەردەخات، بریتییە لە سیخوڕێکی ئیسرائیلی بەناوی *ئێلی کۆهێن*. ناوبراو لە دایک و باوکێکی جوو لە میسر لەدایک ببوو، دواتر لە تەمەنی سی و دووساڵیدا لە ساڵی ١٩٥٦ بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کرد و وەک خۆبەخشێک چووە ریزەکانی دەزگای هەواڵگریی ئەو وڵاتە. ناوبراو وەک سیخوڕێکی دەزگای هەواڵگری مۆساد نێردرایە وڵاتی ئەرژەنتین لە ساڵی ١٩٦١ بۆ ئەوەی خۆی وەک بزنسمانێکی عەرەب نیشان بدات، لەژێر نازناوی *کەمال ئەمین تەعبەت*، کۆهێن لەساڵی ١٩٦٤دا چووە شاری دیمەشقی پایتەختی سوریا. ناوبراو پشتگیریی لەلایەن هاوڕێ عەرەبە سووریەکانی پێ بوو کە بە تەواوی وەسفی ناوبراویان کردبوو، کۆهێن توانی (بە کەمێک بەختەوە) جێگای خۆی لەناو بازنەی دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتە بکاتەوە. لەراستیدا ناوبراو بەشێوەیەک پەیوەست بوو کە جارێکیان ئەویان وەک نوێنەرێکی دەوڵەت بەکارهێنا لە نێوان حکومەتی بەعسی نوێ و سەرۆکی نەفیکراوی پێشووی سوریا؛ وە جارێکی تریشیان، خەریک بوو پۆستێکی باڵای حکومی لە کابینەی نویی دەوڵەت پی بدرێت. بەڵام دوای ناردنی زانیاری سەربازیی، سیاسیی وە دبلۆماسی سوریا بۆ ماوەی

سێ ساڵ، دواتر لەلایەن هێزەکانی دژە هەواڵگرییەوە دەستگیرکراو و لە ئایاری ١٩٦٥ لەسێدارە درا.[1]

یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی بەکارهێنانی سیخوڕی نافەرمی بریتییە لە ناردنی ئەو ئەفسەرانە لەژێر ناوی کۆچبەر بۆ وڵاتێکی خانەخوێ. ئاشکرایە کە ئاسانترە ئەو ئەفسەرانە بنێردرێنە ناو وڵاتێک کە تیایدا بەشێوەیەکی ئاسایی ژمارەیەکی زۆری پەنابەر و سەردانکەر بەبێ گرفت وەردەگرێت وە بەشێوەیەکی ئاساییانە مامەڵە دەکات دەربارەی کۆنترۆڵکردنی سنوورەکانی بەبەراورد لەگەڵ ئەو وڵاتەی کۆچبەر وەرناگرێت، کە بەگشتی چاوەدێری سەردانیکەران دەکات، و سنوورەکانی بە باشی دەپارێزێت.

یەکێک لە نموونە سەرنج ڕاکێشەکان کە بەباشی وێنەی ئەوە دەکێشێت تا چ ئەندازەیەک یەکێتی سۆڤیەت دەیخواست کات و هەوڵەکانی بەگەڕبخات بۆ ئەم جۆرە ئۆپەراسیۆنانە بریتییە لە نموونەی *لوبیک زیمنیک* (هاوڵاتی چیکی کە لەلایەن دەزگای هەواڵگریی سۆڤیەت کە بە KGB ناسراوە بەکرێ گیرابوو) بەپێدانی ناسنامەی *رودۆلف هێرمان* (رودۆلف هێرمانی ڕاستەقینە هاوڵاتیەکی ئەڵمانی بوو کە لە جەنگی دژی یەکێتی سۆڤیەت لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا کوژرابوو)، ناوبراو بۆ ماوەی یەک ساڵ لە ئەڵمانیای خۆرهەڵاتدا ژیا. پاشان، لە

---

[1] بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو لەسەر ژیانی کۆهێن وەک سیخوڕێکی ئیسرائیلی، بڕوانە:

Stanley A. Blumberg and Gwinn Owens, *The Survival Factor: Israeli Intelligence from World War I to the Present* (New York: Putnam, ١٩٨١), ٢٠٨–٢٤.

کۆتایی ساڵی ١٩٥٧، لەگەڵ هاوژینەکەی کە خەڵکی ئەڵمانیای خۆرهەڵات بوو(وە ئەویش سیخوڕی بۆ یەکێتی سۆڤیەت دەکرد) و منداڵێکی ساوا بەرەو ئەڵمانیای خۆرئاوا بەڕێ کەوتن، لەوێ وەک پەنابەندەیەکی ئەڵمانیای خۆرهەڵات نیشتەجێ بوون.

دوای چوارساڵ مانەوەی لە ئەڵمانیای خۆرئاوا، *هێرمان* بەرەو کەنەدا کۆچی کرد، کە تیایدا لە کۆتاییدا کارێکی بچووکی دامەزراند بۆ فلیمی ڕیکلام و بازرگانیی. ئەو چەندین ئەرکی بچووکی بۆ دەزگای هەواڵگریی سۆڤیەت بەجێ گەیاند، وەک کۆکردنەوەی "راپۆرتی کەسەکان" لەسەر ئەو سیاسەتڤان و ڕۆژنامەنووسانەی چاوی پێکەوتن بەهۆی کارەکەیەوە، وە بەردەوامیدان بە پەیوەندی لەگەڵ پرۆفیسۆرێکی کەنەدی کە سیخوڕی *KGB* بوو. گرنگترین ئەرکی ناوبراو بریتیی بوو لە پاراستنی ناسنامەی کەسایەتیەکەی بۆ ئەوەی بتوانێت، لە ئەگەری هەر شکستێکی پەیوەندی دبلۆماسی لە نێوان یەکێتی سۆڤیەت و کەنەدا، کۆنترۆڵی تۆڕەکانی سەرچاوەی کەنەدی بکات لە "نیشتەجێبوونی" یاسایی(بەرپرسی بنکەی *KGB* لە باڵیۆزخانەی سۆڤیەت لە شاری ئۆتاوا).

دوای شەش ساڵ مانەوە لە کەنەدا، هێرمان ڕێنمایی پێدرا بۆ ئەوەی لە کەنەداوە بچێتە ئەمریکا، کە تیایدا هەڵسا بە ئەنجامدانی هەمان ئەرک. کاتێک پیتەری کوڕی بوو بە حەڤدە ساڵ، *هێرمان* توانی قایلی بکات کە کار بۆ *KGB* بکات. لەبەر ئەوەی پیتەر منداڵ بوو کە هێنایانە ئەڵمانیای خۆرئاوا و لە تەمەنی چوار ساڵیەوە لە کەنەدا و ئەمریکادا گەورە ببوو، پاشخانەکەی بەهیچ شێوەیەک نەدەبووە جێگای گومانی دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەو دوو وڵاتە؛ ئەو دەبوایە خۆی ئامادە بکات بۆ ئەوەی

پیشەیەک لە حکومەتی ئەمریکیدا بەدەست بهێنێت، کە تیایدا بتوانێت وەک سەرچاوەیەکی ماوەدرێژی سۆڤیەت کاربکات. وادانرابوو کە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی *FBI* ناتوانن گومان بکەن لەو بنەماڵەیە بەڵام دواتر دوای چەندین ساڵ توانیان هەموویان دەستگیربکەن و لە ئەنجامدا ڕادەستی دادگا کران.

تێکەڵیکردنی سیخوڕیی دەمامکداری فەرمی و نافەرمی حکومەتێک لە ئەنجامدانی کۆکردنەوەی چالاکی زانیاری وابەستەیە بە ژمارەیەک فاکتەرەوە. بەشێوەیەکی گشتی، دوو لە گرنگترین ئەو هۆکارانە بریتین لە جۆری ئەو زانیارییەی کە گەرەکە و ئەو ئامرازانەی بەردەستن بۆ دەستگەیشتن پێی. ئەگەر کەیسی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە جەنگی سارددا وەربگرین، دەبینین کە کۆکردنەوەی زانیاری لە ڕێگای مرۆییەوە لەدژی یەکێتی سۆڤیەت پەیوەست بوو بە نیازەکانی سەرکردایەتی سۆڤیەت، توانای سەربازی نیشتیمانییان، و هەوڵەکانی دەزگای هەواڵگریی ئەو وڵاتە لە دژی خۆرئاوا. ئەم سەرنجە وردە، لەگەڵ چاوەدێری چڕی هەموو بیانیەکان لەلایەن دەزگا ئەمنیەکانی سۆڤیەتیەوە، بەو واتایە دەهات کە خەباتی کۆکردنەوەی زانیاری مرۆیی لەلایەن ئەمریکا و هەندێ لە وڵاتانی ترەوە بەشێوەیەکی فەرمی پشتی بەو ئەفسەر هەواڵگرییانە دەبەست کە لەژێر پەردەی سیخوڕی فەرمی کاریان دەکرد. بە پێچەوانەوە، لەم ساڵانەی دواییدا وڵاتی چین زۆر کاری دەکرد لە بەکارهێنانی سیخوڕی نافەرمی بۆ ئەنجامدانی کاری کۆکردنەوەی زانیارییە پێویستەکانی لە ئەمریکادا. هەرچەندە دەزگا هەواڵگرییەکانی وڵاتی چین هەندێ ڕێگای کۆنی بەکرێگرتنی سیخوڕ و بەکارهێنانی سیخوڕی فەرمی

بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پەیڕەو دەکەن، دەزگای هەواڵگریی چینی بەشێوەیەکی ئاسایی چەندین میکانیزمی بەکرێگرتنی سیخوڕی نافەرمی گرتەبەر، وەک کۆمپانیای زەبەلاح، بەرنامەی گۆڕینەوەی فێرخواز و بابەتی زانستی، و وەفدی زانستی و بازرگانیی. هەروەها هەواڵگری چینی سیخوڕی "خەوتوو"ی ماوەدرێژیش بەکار دەهێنێت کە لە چینەوە کۆچ دەکەن و وەک هاوڵاتی وڵاتێکی بیانی خۆیان دادەمەزرێنن بۆ ماوەیەکی درێژ پێش ئەوەی چالاکیەکی تایبەتمەندار بە هەواڵگریی ئەنجام بدەن لەو وڵاتانەی کە کۆچیان بۆی کردووە. ئەم بەکارهێنانە چڕەی سیخوڕی نافەرمی وڵاتی چین بە ئامانجی ئەوەیە کە تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی ئەمریکی و بابەتی لەم جۆرە، سروشتی کراوەی رێژەیی بازاڕە بازرگانیەکانی ئەمریکا، وە ئاسانی نیشتەجێ بوون لە ئەمریکا، وە بوونی کۆمەڵگایەکی ئەتنی چینی کە تیایدا کۆچبەرە نوێکان دەتوانن خۆیان بگونجێنن، لە بەرژەوەندی خۆیدا بەکاریهێنێت وە سوودی هەواڵگریی لێیانەوە وەچنگ بکەوێت.

## جۆری سەرچاوە هەواڵگرییەکان

هەروەک چۆن جیاوازیمان کرد لە نێوان ئەفسەری هەواڵگریی دەمامکداری فەرمی و نافەرمیدا، دەکرێت جیاوازی بکەین لە نێوان جۆرەکانی سەرچاوە هەواڵگرییەکانیش. یەکێک لە جیاوازیە بنچینەییەکان بریتییە لە هەمەجۆری ئەو سەرچاوانەی کە ئەفسەری هەواڵگریی، دوای ئامادەکاری هەموو پێداویستییەکان، بەشێوەیەکی چالاکانە بەکرێیان دەگرێت بۆناو خزمەتی دەزگای هەواڵگریی وە ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت بە

خۆبەخشانە هاوکاری دەزگایەکی هەواڵگری وڵاتێکی بیانی بکەن، هەندێکجار کارەکە دەگاتە ئەو رادەیەی بچنە ناو باڵیۆزخانەکەی.

سەرچاوە بەکرێگیراوەکان بەگشتی زیاتر بە متمانەپێکراو دادەنرێن، چونکە ئەفسەری هەواڵگری دەرفەتی هەبووە لە کەسایەتی و ماندەرەکانی بکۆڵێتەوە بەر لەوەی هەوڵ بدات تەجنیدیان بکات. سەرەڕای ئەمەش، ئەو سەرچاوانەی تەجنید دەکرێن لەسەر بنەمای ئەوە هەڵدەبژێردرێن کە بتوانن دەستیان بە زانیاری گرنگ بگات. لەگەڵ ئەوەشدا، ناسنامە و تەجنیدی سەرچاوەکان کارێکی قورسە و کاتێکی زۆری دەوێت، وە هیچ دڵنیاییەک نیە کە تەنانەت وردترین و باشترین سەرچاوە لە ڕاستیدا بە ئەرێنی وەڵام دەداتەوە بۆ دەرفەتی تەجنیکردن. لەلایەکی ترەوە، ئەو جۆرە سیخوڕانەی کە بەشێوەیەکی ئاسایی جێگای گومانن[i] هەمیشە دەکرێت زانیاری هەڵە و لەڕێ لادەر بداتە ئەو دەزگا هەواڵگرییەی کە کاری بۆ دەکات، وە بە وڵاتەکەی ڕابگەیەنێت کە پلان و ڕێگاکانی ئۆپەراسیۆنی لایەنی بەرامبەر لە چ ئاستێکدان، یان یەکێک لە سەرانی هەواڵگریی ئەو وڵاتە بخاتە تەڵەوە بۆ ئەوەی دەستگیر بکرێت. دەزگایەکی هەواڵگریی، کە گومانی هەیە بە بوونی ئەم جۆرە سیخوڕانە، دەکرێت چەندین دەرفەت لەدەست بدات بۆ بەدەستهێنانی زانیاریگەلێک کە بە ئاسانی دەیتوانی دەستی بکەوێت. مێژوو و بەسەرهاتی هەواڵگریی پڕن لەو جۆرە سیخوڕانە کە لەسەرەتادا فەرامۆشکران یان ڕەتکراونەتەوە بەڵام دواتر دەرکەوت کە سەرچاوەی بایەخداری هەواڵگریین.

---

[i] walk-ins

یەکێک لە نموونە بەرچاوەکانی ئەم جۆرە کەیسانە بریتییە لە کەیسی *"فریتز کۆلبی"*، کە کارمەندێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیا لە ماوەی جەنگی جیهانیی دووەم بوو. کاری ناوبراو بریتیی بوو لە دۆزینەوەی ئەو زانیاریانەی کە بە لێشاو و ڕۆژانە دەهاتنە ناو ئەڵمانیا لە ڕێگای باڵیۆزخانەکانی ئەو وڵاتەوە لە سەرتاسەری جیهان. ئەو بابەتانەی کە ڕۆژانە گرنگیان پێدەدرا بریتیی بوون لە بابەتی هەستیاری ستراتیژیی، سەربازیی، هەواڵگریی و مەسەلە دبلۆماسییەکان. بەهۆی ئەوەی *کۆلبی* وەک کارمەندێکی گەڕۆک کاری دەکرد، ناوبراو لە ئابی ١٩٤٣دا گەشتی وڵاتی سویسرای کرد کە لەگەڵ خۆیدا نزیکەی دوو سەد بەڵگەنامەی گرنگی هەڵگرتبوو کە لەناو فایلەکانی وەزارەتی دەرەوە لە بەرلین هێنابووی. یەکەمجار ناوبراو ڕووی کردە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە شاری بێرن. بەریتانیەکان هیچ بایەخیان بە زانیاریەکانی *کۆلبی* نەدا. بۆیە، دواتر ڕووی کردە *ئالان دولیس*، بەرپرسی ئۆپەراسیۆنە هەواڵگرییەکانی ئەمریکا لە سویسرا. بەئاگاییەوە، بەڵام کەمتر لە هاوپەیمانە بەریتانیەکان، ئەمریکیەکان لەگەڵ *کۆلبی* کەوتنە کارکردن، وە لە گەشتە یەک لەدواییەکەکانیدا بۆ بێرن، ناوبراو زیاتر لە ١٥٠٠ بەڵگەنامەی نهێنی ئەڵمانەکانی پێ بەخشین. دەکرێت بڵێین ناوبراو گرنگترین دەرگای سیخوڕی جەنگ بوو لەگەڵ ئەڵمانەکان.[i]

سەرەڕای سەرچاوەی نهێنیی، دەکرێت جیاوازیەک بکەین لە نێوان ئەو هۆکارانەی کە بۆچی ئەوان ئەم زانیارییانە دەبەخشن. ئەم سەرچاوانە

---

[i] Joseph E. Persico, *Piercing the Reich: The Penetration of Nazi Germany by American Secret Agents during World War II* (New York: Viking, ١٩٧٩), ٦٢–٧٢, ٣٢٨.

دەکرێت بەهۆی کارتێکەری ئایدۆلۆژیی، ئەتنی یان وابەستەیی ئاینی هاندرابن کە بەهێزترن لە وابەستەبوونیان بۆ ئەو وڵاتەی کە تیایدا نیشتەجێن و هاوڵاتین تیایاندا، دەکرێت ئەوان چڵێس و چاوچنۆک بن؛ دەکرێ پێیان وابێت کە کردەوە و ئایدۆلۆژیەتی وڵاتەکانیان پەسەند بێت؛ دەکرێت ئەوان خەڵکانێکی ناهاوسەنگ بن کە ئاواتەخوازن هەندێ گۆڕانکاری بخەنە ژیانیانەوە؛ ڕەنگە ئەوان بیانەوێت تۆڵەی ئەو خەراپ مامەڵەیە بکەنەوە کە لەلایەن حکومەتەکانیانەوە دەرهەق بەوان کراوە؛ یان دەکرێت هەڕەشەیان لێ کرابێت، بۆیە پەنا بۆ ئەم کارە دەبەن. گرنگی ڕێژەیی ئەم هاندەرانە لەسەر تایبەتمەندیەکانی ئەو کۆمەڵگایە و تەکنیکانە دەوەستێت کە دەزگا هەواڵگرییەکان دەیگرنەبەر.

بۆ نموونە، مێژووی کۆکردنەوەی زانیاریی بەهۆی مرۆڤەوە لە هەواڵگریی یەکێتی سۆڤیەتی جاران دژی ئەمریکا و بەریتانیا لە ساڵانی سیەکانەوە وێنەیەکی جوانمان نیشان دەدات لە گۆڕینی ئامانج لە ئایدۆلۆژیەتەوە بەرەو چڵێسی و تۆڵەکردنەوە وەک دوو هۆکار بۆ ئەمریکی و بەریتانیەکان کە ویستیان بوو خیانەت و ناپاکی لە وڵاتەکانیان بکەن. لە ساڵانی سییەکاندا، سۆڤیەتیەکان درکیان بەوە کرد کە بانگی کۆمۆنیزم بۆ ژمارەیەک لە قوتابی و وانەبێژی زانکۆی کەیمبریج، بە هەندێ لە بنەماڵە دیارەکانیشەوە، بووە هۆی ئەوەی ژینگەی ئایدۆلۆژیی ببێتە جێگای بایەخیان. لە نێو ئەو قوتابیانەی کە لەو کاتەدا تەجنید کران کە دواتر

بوون بە سیخوڕی دیاری سۆڤیەت لەناو حکومەتی بەریتانیا، *گای بێرگسم* *دۆناڵد ماکلەن*، وە *هارۆلد* ("کیم") *فیلبی* تیادا بوون.[1]

---

[1] ئەگەر بگەڕێین بە دوای ناوبانگی بە ناوبانگترین سیخوڕ لە جیهاندا، دەبینین سیخوڕی بەریتانی (کیم فیلبی) بە ناوبانگترین سیخوڕە پەردەی لەسەر لادرابێ لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە ، ئەو سیخوڕەی ماوەی ۳۰ ساڵ بەریتانیای هەڵخەڵەتاند و کاری بۆ یەکیەتی سۆڤیەت دەکرد، تا لە کۆتاییدا هەواڵگری ڕووسی بڕیاری خانەنشینکردنی دا لەبەر ئەو خزمەتەی کە پێشکەشی یەکێتی سۆڤیەتی کردبوو، بانگێشتکرا بۆ ڕووسیا لەڕێگەی بەیرووتەوە و ئێستا لە ڕووسیا بە کامەرانی ژیان بەسەر دەبا .

لەساڵی ۱۹۱۲ لە شاری ئەمبالای هیندستان لە دایک بووە ، کوڕە تاقانەی بەڕێز (هاری سانت جۆن برد فیلبی بوو) کە فەرمانبەر بوو لە حکومەتی هیندی ، پاشان فیلبی گوازرایەوە بۆ عێراق کە ئەو کاتە لەلایەن بەریتانیاوە داگیر کرابوو کرا بە ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ، پاشان بوو بە نوێنەری حکومەتی بەریتانی لەڕۆژهەلاتی ئەردەن و لە کۆتاییدا بوو بە ڕاوێژکاری پاشای سعودیە، باوکی کیم ناڕازی بوو لە سیاسەتی بەریتانیا لە خۆرهەلات و هەر ئەو ناڕازییە بە میرات بۆ کوڕەکەیمایەوە .

کیم فیلبی چووە کۆلێژی (ترنتی) لە زانکۆی کامبریدج، لەو ڕۆژانەدا بیری سۆسیالستی لە ناو ڕۆشنبیراندا باو بوو ، چوونە ڕیزی حیزبی شیوعی بەڵگەی ئازایەتی و بەجەرگی بوو ، هەر لەم ڕێگایەوە فیلبی چووە پەیوەندی کرد بەڕیزەکانی حیزبی شیوعیەوەو بە نهێنی کاری بۆ دەکردن، بە تەواوی تێکەڵی بیروباوەڕی مارکسیەت و شیوعیەت بوو، لە هاوینی ۱۹۳٤ دا لە ڤیەنا بوو بڕیاریدا ببێتە سەربازێک لە ململانێی جیهانی دژ بە فاشیەت و کەوتە ناو گێژاوی سیاسەتەوە، لە سەرەتادا ناوی خۆی لە لیستی شۆڕشگێڕانی ئیشتیراکی تۆمار کرد کە شیوعیە نەمساویەکان یارمەتی و پشتگیریان دەکرد، وەکو پەیامنێرێک لە

نێوان چەند یەکەیەکی دژ بە حکومەت دەستی بەکارکردن کرد، لەو کاتانەدا کچێکی ئەمساوی شیوعی ناسی و یەکیان خۆشویست ئەویش (ئەلیس فریدمان) بوو کە بە (لیتر فریدمان) ناسرا، کە ئەویش بە تەواوی تێکەڵی سیاسەت ببوو، کاتێک حکومەت دژی شیوعیەکان وەستایەوە و خانوەکانی کرێکارانی بۆردومان کرد و سەدانیان لێکوژرا (فیلبی) ئەم کوشتارەی بەچاوی خۆی بینی و بوو بە ڕادیکاڵێکی توندڕەو. وا ڕێککەوت کە دەزگای هەواڵگری ڕووسی لەو کاتانەدا دوو بەکرێگیراوی هەبوو کە سیخوڕی بۆ دەکردن، یەکێکیان (تیودور مالی) هەنگاری بوو کە لە ڕابردوودا قەشە ببوو دواتر ببوە کۆمەنیست، لەگەڵ (جابور بینتن) ئەمیش هەر کۆمەنیست بوو ، هەردوو کیان باوەڕیان وابوو کە (فیلبی) کەسێکی گونجاوە بۆ سیخوڕی و ئامادەیە لە پێناو بیروباوەڕی شیوعیەتدا خۆی بەخت بکات ، لە کۆتایدا توانیان بیهێننە ناو ڕیزەکانی خۆیانەوە بەڵام داوایان لێکرد کە هاوسۆزی خۆی بۆ بیروباوەڕی شیوعیەت بشارێتەوە و وەک نهێنییەک بیپارێزێت تا بتوانێت دزە بکاتە ڕیزەکانی حکومەتی بەریتانیا هەوڵ بدات لە ناو حکومەتی بەریتانیدا جێگایەک بۆ خۆی دابین بکات وە باشتریش دەبوو کە ئەگەر هەوڵ بدات لە نێو هەواڵگری بەریتانیدا پلەیەک بەدەست بهێنێت، بۆ ئەم مەبەستە (فیلبی) گەڕایەوە بۆ بەریتانیا و وا خۆی دەردەخست کە هیچ پەیوەندیەکی بە کۆمۆنیست و بیری مارکسیەتەوە نییە، ئەم خۆ دەرخستنەش گرنگی خۆی هەبوو تا وای لێبکات جێگای خۆی لە نێو حکومەتی بەریتانیادا بکاتەوە ، تا لە کۆتایدا بوو بە ئەندامی کۆمەڵەی (ئەنگلۆ-ئەڵمانی) کە کۆمەڵەیەکی ڕاستڕەو بوو ، ئەم کۆمەڵەیە بۆ ئەوە کاریان دەکرد کە هاوپەیمانییەک لە نێوان بەریتانیا و ئەڵمانیای نازیدا دروست بکەن، لەو کاتاندا بە تەواوەتی پەیوەندی خۆی بە هاوڕێ کۆمۆنیستەکانیەوە بڕیبوو، تا سەرئەنجام بووە کەسێکی جێگەی متمانەی بەریتانیا و لەساڵی ١٩٣٦ وەک پەیامنێری ڕۆژنامەی (لەندەن تایمز) دەستبەکاربوو ، ناردیان بۆ ئیسپانیا تا دەنگوباسی شەڕی ناوخۆی ئەوێ بۆ ڕۆژنامەکە بنێرێ، لەوێ چەند ڕاپۆرتێکی بۆ

ڕۆژنامەکە نووسی کە تێیدا پشتگیری جەنڕاڵ (فرانکۆ)ی دەکرد ، ئەمەش وایکرد کە ناوبانگی وەک کەسێکی ڕاستڕەو ، لە هەمان کاتدا توندڕەو ناوبانگ دەربکات، بەڵام ئەو بە نهێنی پەیوەندی کردبوو بە هەواڵگری ڕووسیەوەو هەر زانیاریەکی لەسەر شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا بەدەست بهێنایە ڕەوانەی هەواڵگری ڕووسی دەکرد .

ڕۆژێکیان تووشی پێشهاتێک هات کە هێندەی نەمابوو ژیانی سیخوڕی کۆتایی پێبێت، کاتێک سەربازە ئیسپانیەکان گومانیان لێکرد و بە ماوەیەک بەندیان کرد تا هەندێک پرسیاری لێبکەن، لەو کاتەدا هەندێک بەڵگەی پێبوو کە جێگای تۆمەتبارکردنی بوو، بەڵام بە دزیەوە ئەو بەڵگەنامانەی قووت دلو ڕزگاری بوو لە ساڵی ١٩٣٩ کە هێشتا پەیامنێری ڕۆژنامەی (لەندەن-تایمز)بوو، ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخسا کە تێکەڵی یاری موخابەراتی ببێت ئەویش لە ڕێگەی هاوڕێیەکیەوە کە هەروەکو ئەو بەکرێگیراوی هەواڵگری ڕووسی بوو بەڵام بە نهێنی دزەی کردبووە ناو ڕیزەکانی هەواڵگری بەریتانی، ناوی ئەو هاوڕێیە (جای بیرجس) بوو ، پاش ئەوەی (جای) توانی (فیلبی) بهێنێتە ڕیزەکانی موخابەراتی بەریتانیەوە لە سەرەدا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرد و هەروەها لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیدا کرد تا دڵنیا بن لەوەی هیچ سۆزێکی بۆ بیری شیوعیەت نییە، تا لە کۆتایدا وەک کارمەندێکی هەواڵگری بەریتانی قبوڵکرا و سەرئەنجام ئاواتەکەی هاتە دی و لە بەشی دژە هەواڵگری وڵاتە بیانیەکان دامەزرا ، ئەمە ئەو جێگایە بوو کە خەونی پێوە دەبینی تا لەڕێگەیەوە زۆرترین زانیاری هەواڵگری بەدەست بێنێت و بە نهێنی پێشکەشی موخابەراتی ڕووسی بکات، (فیلبی) هەرزوو لە نێو هەواڵگری بەریتانیدا جێی خۆی کردەوە و بووە کەسێکی خۆشەویست ، توانی بلیمەتی خۆی لە بواری کۆکردنەوەی زانیاریدا بسەلمێنێت و زۆرکەس پێشبینی ئەوەی دەکرد کە لە داهاتوو ببێت بە سەرۆکی هەواڵگری بەریتانی و کەسیش بە خەیاڵیدا نەهات کە ئەو بە نهێنی کار بۆ هەواڵگری ڕووسی دەکات. لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٤ دەرفەتێکی گرنگی

بۆ رەخسا ئەویش ئەوە بوو کە سەرۆکایەتی بەشی نۆهەمی وەکالەتی موخابەراتی بەریتانیایان پێسپارد، کە ئەم بەشەش کاری ئەوە بوو دژی چالاکییە سیخورییەکانی رووسیا بوەستێتەوە کە بۆ ماوەیەک ئەم بەشە چالاکیەکانی راگیرا بوو بەلام دوای جەنگی جیهانی دووەم دووبارە زیندو کرایەوە (فیلبی) کرا بەسەرۆکی ئەو بەشە و نزیکەی ١٠٠ سیخوریان خستە بەردەستی ، هەواڵگری رووسەکان لەمەدا قازانجێکی زۆریان کرد ، تەنها بەڵگەنامە نهێنیەکانی رووسەکان دەتوانن قەبارەی ئەو خیانەتە دیاری بکەن کە (فیلبی) کردوویەتی لە وڵاتەکەی خۆی و ج خزمەتێکی پێشکەشی رووسە شیوعیەکان کردووە، بە دڵنیاییەوە ئەو خزمەتەی کە (فیلبی) پێشکەشی رووسەکانی کردووە بە پەنجەی دەست نازمێردرێن. یەکێک لەو خزمەتانە ئاشکرا کردنی ناوی هەموو سیخورەکانی بەریتانیا بوو کە لە ئەورووپای رۆژهەڵات دژی رووسیا چالاکیان ئەنجام دەدا. لە ساڵی ١٩٤٥ (فیلبی) رووبەرووی کێشەیەک بووەوە کە زۆری نەمابوو ببێتە هۆی ئەوەی لە کاری هەواڵگری دوور بخرێتەوە ، دوو پیاوی هەواڵگری رووسی پەنایان هێنایە رۆژئاوا، یەکێکیان ناوی (ئیگور جوزینکۆ) بوو کە نووسەری شفرە بوو لە باڵیۆزخانەی رووسیا لە کەنەدا و لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێک بروسکەی زۆر نهێنی هێنابوو، ئەوی تریان ناوی (کونستانتین فولوف) بوو کە ئەفسەرێکی گەورەی هەواڵگری رووسی بوو لە ئەستەمبوڵ، کە پەنای بردبووە بەر باڵیۆزخانەی بەریتانیا و داوای پەنابەندەیی سیاسی کردبوو، هەروەها ئەوەی پێراگەیاندبوون کە هەواڵگری رووسی توانیویەتی دزە بکاتە نێو هەواڵگری بەریتانییەوە و بەلام بە تەواوەتی نەیدەزانی کە ئەو بەکرێگیراوەی هەواڵگری رووسی کێیە کە دزەی کردووەتە ناو هەواڵگری بەریتانییەوە. هەڵهاتنی ئەو دوو کارمەندەی هەواڵگری رووسی و پەنا بردنیان بۆ بەریتانیا وای لە (فیلبی) کرد بە لە ئاشکرا بوون بترسێت و داوای یارمەتی و ئامۆژگاری لە (یوری مردین) کرد، کە بریکاری هەواڵگری رووسی بوو لە لەندەن و سەرپەرشتی تۆرێکی سیخوری دەکرد کە (فیلبی) یەکێک بوو لە ئەندامانی ئەو تۆرە، (مردین) (فیلبی) ئاگادار

کردەوە کە ئەو ناتوانێت هیچ کارێک بکات دژیان بۆیە پێویست لەسەر هەواڵگری ڕووسی کە هەریەکێک لە و دوو هەڵهاتووە لەناوبەرێت، بۆیە (کونستانتین فولوف)یان دەستنیشان کرد کە دەبێ لەناو ببرێت، (فیلبی) چوونکە سەرۆکی بەشی دژە سیخوڕی بوو دەبوو خۆی چاوپێکەوتن لەگەڵ (فولوف)دا بکات لێی بپرسێت کێن ئەوانەی دزەیان کردووەتە ناو هەواڵگری بەریتانییە و بە نهێنی زانیاری دەدەن بە ڕووسەکان؟ بۆ ئەم مەبەستە (فیلبی) گەشتی کرد بۆ باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە ئەستەمبوڵ لەهەمان کاتدا هەواڵگری ڕووسی پلانی لە ناوبردنی (فولوف)یان داڕشتبو، تا ئێستا نەزانراوە کە (فولوف) چی لێکراوە بەڵام دەنگۆیەک هەیە دەڵێت لە ڕۆژی دیارنەمانی لاشەی کەسێک لە نزیک فڕۆکەخانەی ئەستەمبوڵ دۆزراوەتەوە کە هەموو گیانی بە لەفاف پێچراوە. سەبارەت بە هەڵهاتووی دووەمیش (ئگور جوزینکۆ) دەرکەوت کە زانیارییەکی ئەوتۆی لانییە دەربارەی دزەکردنی هەواڵگری ڕووسی بۆناو هەواڵگری بەریتانی. لە کۆتایدا (فیلبی) گەڕایەوە لەندەن و دەنگوباس لە نێو دەزگای هەواڵگری بەریتانی بڵاو بووەوە کە (فیلبی) پلەی بەرز دەکرێتەوە، لە کۆتایدا کردیان بە سەرۆکی وێستگەی هەواڵگری بەریتانی لە واشنتۆن، لە ژێر پەردەی سکرتێری یەکەمی باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە واشنتۆن دەست بەکاربوو، یەکێ لەو کارەی کە کەوتبووە سەرشانی ئەوە بوو کە وەک هەڵقەی پەیوەندی نێوان هەواڵگری بەریتانی و ئەمریکی کاربکات، ئەمەش دەرفەتێکی زێڕینی تربوو بۆ (فیلبی) تا ڕووسەکان لە پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی زانیاری نێوان هەواڵگری بەریتانی و ئەمریکی ئاگادار بکاتەوە، (فیلبی) لە واشنتۆن دەستی بەکار کرد، هەر زوو توانی شفرەی ئەمریکیەکان بەدەست بهێنێت و کە بۆ پەیوەندی بێتەلی نێوان لەندەن و نیویۆرک بەکاردەهێنرا، (فیلبی) هەر زوو ڕووسەکانی لەم نهێنییە ئاگادار کردەوە و ڕووسەکانیش توانیان گوێ لە پەیوەندییە بێتەلەکانی هەردوولا بگرن، واشنتۆن و لەندەن هەستیان بەوە کرد کە گۆڕانێک لە خەستی پەیوەندی بێتەلەکانیان ڕوویداوە گومانەکەشیان لە جێگەی خۆیدا بوو.

سەرەتای ئاشکرا بوونی (فیلبی) بەوە دەستی پێکرد کە هەواڵگری ئەمریکی توانی کتێبێکی شیفرەی ڕووسەکان بەدەست بهێنێت و بەم ڕێگایە توانیان نامە شفرەدارەکانی ڕووسەکان بخوێننەوە لەم ڕێگەیەوە بۆیان دەرکەوت کە ژمارەی سیخوڕەکانی هەواڵگری ڕووسی لە ئەمریکا و بەریتانیا بە سەدان سیخوڕ بوو، بەڵام ئەم سیخوڕانەش ناوی خوازراویان هەبوو کە ئاشکرا کردنیان ئاسان نەبوو ، بەڵام لە ئەنجامی بەراورد کردنی چەند نامەیەکدا توانیان ناسنامەی چەند سیخوڕێکی دیار ئاشکرا بکەن بە تایبەتی ئەوانەی خەریکی پێدانی زانیاری ئەتۆمی بوو بە ڕووسەکان کە لەنێویاندا (کلوز فوشن)ی تێدا بوو کە دەستگیریان کرد، ئەمەش مەترسی خستە دڵی (فیلبی) وە، کاتێ ئەمریکی و بەریتانیەکان بۆیان دەرکەوت کە سیخوڕێکی ڕووسیا هەیە کە پایەیەکی بەرزی هەیەو ناوە نهێنیەکەی (هومر)ە، کە زانیاری گرنگ و نهێنی دەگەیەنێتە ڕووسەکان، گومانەکان لەسەر (فیلبی) زیادی کرد بەڵام زانیاریە بەدەست هاتووەکان بەس نەبوون بۆ تۆمەتباکردنی، تا لە کۆتاییدا بەریتانیا بڕیاریدا بیگەڕێنێتەوە و ئەو پۆستەی لێوەربگرێتەوە هەرچەندە گومانەکان لەسەری بەردەوام بوون، ساڵی ١٩٦١ بە تەواوی (فیلبی) ئاشکرا بوو کاتێک کە سیخوڕێک بە ناوی (جۆرج بلێک) کە سیخوڕی ڕووسەکان بوو گیراو هەموو شتێکی درکاند و بۆ بەریتانیەکانی ئاشکرا کرد کە (فیلبی) سیخوڕی بۆ ڕووسەکان دەکات لەو کاتانەدا (فیلبی) بە ئەرکێک لە لوبنان بوو لەلایەن بەکرێگیراوێکی هەواڵگری ڕووسیەوە ئاگادار کرایەوە کە هەڵبێت بۆ ڕووسیا، لە ٢٣ی مایسی ١٩٦٣ (فیلبی) خۆی کرد بەناو قەرەباڵغی ئاهەنگێکدا و لەوێ خۆی شاردەوە بە یەکجاری دیار نەما، دوای شەش هەفتە مۆسکۆ ڕایگەیاند کە (کیم فیلبی) مافی پەنابەرێتی سیاسی پێدراوە

پەیوەندی هەواڵگری ڕووسی لەگەڵ (فیلبی) تا ساڵی ١٩٨٠ بەردەوام بوو، بەڵام لە کۆتاییدا هەواڵی هەڵهاتنی بۆ ڕووسیا بوو بە مانشێتی زۆربەی ڕۆژنامە جیهانیەکان و ڕۆژنامەکان چیرۆکی خەیاڵی و سەیر و سەمەرەیان لە بارەیەوە دەگێڕایەوە، لە

لەلایەکی ترەوە، ئەو ئەمریکی و بەریتانیانەی کە دەسگیرکران بە تۆمەتی سیخوڕیکردن بۆ یەکێتی سۆڤیەت لەسالآنی حەفتا و هەشتاکاندا بەزۆری بەهۆی چلێسیەوە هاندرابوون. لە نموونەیەکی تردا، کە تیایدا باس لە *ئیوارد لی هاروَلد* دەکات، ئەفسەری پێشووی سی ئای ئەی کە چەندین زانیاری گرنگی سەبارەت بە ناوەڕۆکی پلانە تۆپەراسیۆنەکانی چالاکی دەزگاکەی لە مۆسکۆ بەخشیەوە دەزگای هەواڵگریی سۆڤیەتیی، پالنەرەکە بریتیی بوو لە تۆلەکردنەوە لە دژی سی ئای ئەی، بەهۆی ئەوەی لەکار دەریان کردبوو.[i]

بەگشتی، دەکرێت بلێین کە بەکارهێنانی سێکسیش بۆ دەستگەیشتن بە نهێنیەکان و چاوسوورکردنەوە وەک هۆکارێک بۆ سیخوڕیی هۆکارێکی لەجێی ئەم بابەتەیە، هەرچەندە توانای شاراوە بۆ چاوسوورکردنەوە ڕەنگە وا لە ئەفسەرێکی هەواڵگریی بکات بۆ ئەوەی سەرچاوەیەک بە چالاک

ساتەوەختی هەڵهاتنیەوە تەناتەت تا کۆتایی تەمەنی بەردەوام بوو لە خزمەتکردنی هەواڵگری ڕووسی هەموو بەیانییەک نوێنەری هەواڵگری ڕۆژنامە بەریتانی و ئەمریکیەکانی بۆ دەبات و ئەویش پاش خوێندنەوەی ڕاپۆرتێکیان لەسەر دەنوسێت و دەیان نێرێت بۆ هەواڵگری، بەم دواییە ئافرەتێکی ڕووسی هێنا کە ٢٠ ساڵ لەخۆی بچووکتر بوو هەرچەندە پێشتر سێ ژنی تەلاقداوە ئەمەش وەک خەلاتێکی هەواڵگری ڕووسی بەرامبەر ئەو خزمەتانەی پێشکەشی کردووە، لە کۆتایشدا تووشی هەساسیەتی پێست هات تا لەساڵی ١٩٨٨ دا کۆچی دوایی کرد. حکومەتی شیوعی ڕووسیاش ڕێزێکی تایبەتی لێنا وەک سیخوڕێکی گەورە سیاسەتمەدارانی ڕووسیا لە ناشتنەکەیدا بەشدار بوون و پلەی جەنەڕاڵیان پێبەخشی لەسەر وەسێتی خۆی لە گۆڕستانێکی ڕووسی ناشتیان.

[i] David Wise, *The Spy Who Got Away: The Inside Story of Edward Lee Howard* (New York: Random House, ١٩٨٨)

بهێڵێتەوە کە بۆتە سیخوڕ بەهۆی هەندێ هۆکاری تر بەڵام دواتر بیەوێت وازبهێنێت.

بۆ نموونە، لە جەنگی جیهانیی دووەمدا ئافرەتێک هەبوو بەناوی "بێتی پاک" کە توانی زانیاری گرنگ بەهۆی سێکسەوە بەدەست بهێنێت. بێتی شووی بە دبلۆماتکارێکی بەریتانی کرد، ئەو لە ئەسڵدا خەڵکی ئەمریکا بوو وە لەوێدا لەدایک ببوو، هەربۆیە کاری بۆ هەردوو دەزگای هەواڵگریی ئەمریکی و بەریتانی دەکرد. هونەری کۆکردنەوەی زانیاری ناوبراو بەزۆری پێک هاتبوو لە ئەنجامدانی کاری سێکسی لەگەڵ بەرپرسە گرنگەکانی حکومەتە بیانیەکان. ناوبراو چەندین دەسکەوتنی مەزنی بەدەستهێنا، لەوانە کۆکردنەوەی زانیاری بایەخداری دبلۆماسی لە وەزیری دەرەوەی پۆلەندا پێش ئەوەی جەنگ ڕووبدات، داتای گرنگی بەدەست هێنا لە هەوڵەکانی کۆدشکێنەرێکی (cryptologist) پۆلەندی بۆ شکاندنی کۆدی ئەڵمانەکان، وەرگرتنی زانیاری لەسەر چۆنیەتی کارکردنی باڵیۆزخانەی فەرەنسی لە واشنتۆن، وە لە کۆتاییشدا توانی زانیاری بەکەڵکی "کۆدی نووسینی"[i] فەرەنسی و ئیتالی بەدەست بهێنێت.[ii]

ئەگەر وردتر بچینە ناو ئەم مەسەلەیەوە، سێکس بە یەکێک لە گرنگترین فاکتەر دادەنرێت بۆ ئەوەی کەسی بەئامانجگیراو بخەیتە تەڵەوە و دواتر هەڕەشەی لێ بکەی بۆ ئەوەی زانیاری گرنگ یان ئەو ڕاپۆرتانەی پێویستن بخاتە بەردەمی. لە کۆنترین و سەرنجڕاکێشترین ئەو کەیسانەی کە تا ئێستاش لە لاپەڕەکانی مێژووی هەواڵگرییدا باس دەکرێت بریتییە لە

---

[i] Cypher: سیستەمی نووسینی نهێنی (وەرگێڕ)

[ii] Mary S. Lowell, *Cast No Shadow: The Life of the American Spy Who Changed the Course of World War II* (New York: Pantheon, ١٩٩٢).

کەیسی *ناوریس سیژان*، باڵیۆزی فەرەنسا لە مۆسکۆ لەساڵانی پەنجا و شەستەکاندا. بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە باڵیۆزەکە "چاوحیز" دیار بوو، (سەرەڕای ئەوەی خێزانداریش بوو) دەزگای هەواڵگریی یەکێتی سۆڤیەت ($KGB$) کچێکی چاو سەوزی بالآبەرزی شۆخوشەنگی لەناو خودی باڵیۆزخانەکەدا[i] تەرخانکرد (هاوڵاتیەکی یەکێتی سۆڤیەت لەژێر فشاردا بۆ ئەوەی هاوکار بێت) بۆ ئەوەی لە خشتەی بەرێت و پاشان سێکسی لەگەڵ بکات. هەر کە مەسەلەکە بەباشی پەرەی سەند، ناوبراو کەوتە حاڵەتی سەرسوڕمانەوە بەهۆی گەڕانەوە "چاوەڕواننەکراوەکەی" هاوسەری ناوبراو. هاوسەری ئافرەتەکە "بەتووڕەییەکی شێتانە" هەڕەشەی کرد کە کەیسەکە بڵاوبکاتەوە و باڵیۆزەکەش پەلکێشی دادگا دەکات. *سیژان* نهێنیەکەی لەلای "هاوڕێ"یەکی ڕووسی درکاند- لەڕاستیدا، ئەو کەسە هەمان ئەو پلاندارێژەرە بوو کە هەر لەسەرەتاوە ئۆپەراسیۆنەکەی ڕێکخستبوو؛ "هاوڕێکە" پێشنیاری کرد کە تەواوی مەسەلەکە بە نهێنی بهێڵێتەوە. پلانی دەزگای هەواڵگریی سۆڤیەت ($KGB$) بریتیی بوو لەوەی کە ئەو دۆخە ناوازەیە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی هەڕەشە لە *سیژان* بکات بە هێنانی ناوبراو بۆناو دەزگاکە و کارکردن بۆ ئەوان کاتێک گەڕایەوە فەرەنسا وە، ئەوان هیوایان خواست، کە تەنانەت پلە و پۆستێکی باڵاتر بە ناوبراو بدرێت. پلانەکەی سۆڤیەت شکستی هێنا بەهۆی بەهۆی

---

[i] Co-optee: بەو کارمەندە دەوترێت کە خۆی هاوڵاتی وڵاتی خانەخوێیە، بە لەناو باڵیۆزخانەی وڵاتێکی بیانیدا کاردەکات (وەرگێڕ).

هەڵگرانەوەی نووسەری تێکستی فیلمێکی سینەمایی کە نهێنیی نەخشەکەی لابوو.[١]

## گرفتەکانی کۆکردنەوەی هەواڵگری مرۆیی

لەکاتی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی لەڕێگای مرۆڤەوە، دەزگا هەواڵگرییەکان تووشی چەندین گرفت دەبنەوە کە لە سروشتی ئەو دەزگایەدایە، لەکاتێکدا ئەوانی تر زیاتر تایبەتن بە سروشتی ئامانجی هەواڵگرییەوە. لە کۆندا گرنگترین تایبەتمەندی ئەو زانیارییە بریتیی بوو لەوەی تا چ ئەندازەیەک ئەو کەسەی زانیاری لێوەردەگیرێت متمانەپێکراوە.

سەرچاوەکان دەکرێت، بەهۆی هاندەری پارەوە، یان زانیاریەکان ساختە بکەن یاخود وای لێبکەن کە بایەخدار دەربکەوێت، یان ئەوەندە گەورەی بکەن وابزانرێت لە پێگە و پۆستێکی باڵاوە دەستیان کەوتووە. مێژووی هەواڵگریی نموونەی کەمی ئەو جۆرە سەرچاوانەی تیادایە کە بەپێدانی زانیاری دروستکراو و گەورەکراو پارەیەکی زۆریان دەسکەوتبێت.

ئەم جۆرە زانیارییە سەرکاغەزانە بۆ بەرژەوەندی پارە لەساڵانی چلەکان و سەرەتای پەنجاکاندا سەی هەڵدا، بەشێوەیەک فێڵ و تەڵەکەیان بەکاردەهێنا کە دەزگا هەواڵگرییەکانی وڵاتانی شوعیەتی ڕۆژئاوای ئەورووپای تووشی گرفتی جەوهەری کردبوو. ئەم کردەوانە بەزۆری لەلایەن ئەو ئاوارانەوە ئەنجام دەدران کە بەهۆی سیاسەتەوە وڵاتەکانیان

[١] John Barron, *KGB: The Secret Work of Soviet Secret Agents* (New York: Reader's Digest, ١٩٧٤), ١١٤–٤٠.

جێهێشتبوو، ئەو کەسانە هەرزوو بۆیان دەرکەوت کە لەو سەردەمە پڕ لە کێشمەکێشمەدا دەتوانن بەهۆی فرۆشتنی "زانیاریی" نانی ڕۆژانەی خۆیان دەستەبەر بکەن. وە ئەوەی جێی تێڕامانە، ئەو کەسانەی کە لێیان دەپرسین ئەم پارەیان لە کوێ هێناوە، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە کەسێکی ناسیاوی خۆیان پلەیەکی بەرزی پێ دراوە لەناو حکومەتە شوعیە نوێکەدا. لەوکاتەی ژمارەیەکی زۆری ئەو ئاوارانە لە ئاستێکی بەرزی خوێندندا بوون وە لەڕووی سیاسیشەوە پێشکەوتوو بوون، ئەوان توانایان هەبوو ئەم زانیاریانە ڕوویەکی جوانی بەبەردا بکەن و لەبەردەم خەڵکدا بەجوولنی شیبکەنەوە بۆ ئەوەی ئەو زانیاریانە ببنە جێی سەرنج و ڕەزامەندی دەزگا هەواڵگرییەکان.[i]

یەکێکی تر لە کێشە مەترسیدارەکانی تری کۆکردنەوەی زانیاریی مرۆیی بریتییە لەو ئەگەرەی کە دەکرێت ئەو "سیخوڕە" بۆ دەزگای بەرامبەریش کار بکات[ii]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو زانیاریانەی دەیبەخشێت هەڵەن و تەنیا بۆ ئەوەیە دەزگا هەواڵگرییەکە بەسەردا ببات. ئەم جۆرە سیخوڕیە دووسەرەیە لەکاتێکدا دەردەکەوێت کە سەرچاوەیەکی هەواڵ دەستگیر دەکرێت وە دەست دەکات بە درکاندنی هەندێ زانیاری بۆ ئەوەی ئەو کەس و دەزگایەی گرتوویەتی بەمەبەستی خۆپاراستن لەسزایەکی توند.[iii]

---

[i] Allan Dulles, *The Craft of Intelligence* (Boulder, Colo.: Westview, ١٩٨٥), ٢١٦.

[ii] Double-agent

[iii] ئەگەر ئەو سیخوڕەی گیراوە ڕەتی کردەوە هاوکاری بکات، ڕەنگە بکرێت بۆ ئەوەی دەزگا هەواڵگرییەی دەستگیری کردووە بۆ ئەوەی بەفێڵ خۆیان بکەن بەو

نمونەگەلی زۆر سەرنجراکێش لە جیهانی هەواڵگرییدا سەبارەت بە سیخوڕی دووسەرە لە لاپەڕەکانی مێژوودا تۆمارکراون. بەریتانیەکان سەرکەوتووبوون لە کۆنترۆڵکردنی، وە بەکارخستنی، تەواوی هەوڵەکانی کۆکردنەوەی زانیاری لە ڕێگای مرۆڤەوە کە ئەڵمانیا سەرپەرشتی دەکرد لەناو خاکی بەریتانیا لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانیی. هەر لە سەرەتای جەنگەکەوە، بەریتانیەکان دەستیان بەسەر هەموو ئەو ڕاپۆرتە هەواڵگریانەدا گرت کە لەلایەن هاوڵاتیانی ئەڵمانی ئەو وڵاتەوە دەنێردرانە وڵاتەکەیان. لە نێو دەستکەوتەکانی تری ئەم پرۆسەیەدا، ئەم ڕاپۆرتانە هاوکار بوون لە هەڵخەڵەتاندنی ئەڵمانەکان دەربارەی سروشت و شوێنی گیرسانەوەی کەشتیەکانی (D-day)[i] لە ناوچەی نۆرماندی فەرەنسا. تەنانەت تا دواساتەکانی جەنگی جیهانیی دووەم (٩ حوزەیران ١٩٤٤)، پەیامێک لە سەرچاوەیەکی کۆنترۆڵکراو لەلایەن بەریتانیەکانەوە بایەخێکی بێ ئەندازەی هەبوو لە ڕاگرتنی یەکەیەکی زرێپۆشی ئەڵمانەکان لەناوچەی *کالێ* (بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو هێرشەی کە لەڕاستیدا هەر وجودی نەبوو)،

---

کەسە بە ناردنی چەندین پەیام بەناوی کەسە دەستگیرکراوەکە. ئەمە لەو دۆخانەدا سەرکەوتوو دەبێت، وەک سیخوڕیی کاتی جەنگ لە سنووری دوژمن، کە تیایدا سەرچاوەکە چاوەڕوانی ئەوەی لێناکرێت چاوپێکەوتنی ڕووبەڕوو لەگەڵ کەسێکی سەرپە دەزگاکەی ئەنجام بدات.

[i] D-day: ئەو لەنگەرگرتنە بوو کە کەشتی هاوپەیمانان لە نۆرماندی لە بەرواری ٦ی حوزەیرانی ١٩٤٤دا لەکاتی جەنگی جیهانی دووەم ڕوویدا کە تیایدا هاوپەیمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. (وەرگێڕ)

بەم جۆرەش بووە هۆی یارمەتیدانی هێزی حەقیقی داگیرکردنەکە لە نۆرماندی بۆ دابینکردنی ئاسایشی ئەو شوێنەی هێزەکانی تیادا بوو.[i]

کێشەکانی تری ئەم جۆرە سەرچاوانە پەیوەستن بە سروشتی ئامانجەکە. تا زیاتر دەزگا ئاسایشی نێوخۆیی وڵاتێکی ئامانج کاریگەرتر و بەهێزتر بێت، زیاتر کارەکە قورس دەبێت بۆ بەدەستهێنانی زانیاری هەواڵگریی لە رێگای مرۆڤەوە لەو وڵاتەدا. حکومەتێک کە کۆنترۆڵی تەواوی هەبێت بەسەر گەشتی نێودەوڵەتی و پەیوەندیەکانی گەیاندنەوە، هەروەها بەسەر جووڵە ئابووریەکانی و جموجۆڵی هەمەجۆری ترەوە، کارەکە زۆر قورس دەکات بۆ سیخوڕی نافەرمی لەناو وڵاتەکەیدا، یاخود "نایاسایی،" ئەفسەری هەواڵگریی بۆ گەشتکردن بۆ وڵاتێک، دانانی چالاکیە "شاراوەکانیان"، وە کارکردن بەبێ ئەوەی پێیان بزانرێت. ئەفسەرانی فەرمی نهێنی دەکرێت ببنە ئامانجی چاوەدێری ورد، وەئەمەش ئەرکیان قورس دەکات بۆ ئەوەی چاویان بە هاوڵاتیانی ئاسایی بکەوێت لە وڵاتی ئامانجدا بەبێ ئەوەی چاوەدێری بکرێن. ئەنجامەکە بریتییە لەوەی کە لەچەمکی هەواڵگریی ئەمریکدا پێی دەوترێت "ئامانجی زەحمەت" یان "ناوچەی قەدەغەکراو"، وڵاتێک کە تیایدا چالاکیە هەواڵگرییەکان بە گشتی دەکرێت سوودی هەبێت تەنیا لەژێر سیخوڕی فەرمی وە ئینجا بێگومان کارێکی تاڕادەیەکی زۆر ئەستەمە.

---

[i] Christopher Andrew, *Her Majesty's Secret Service: The Making of the British Intelligence Community* (New York: Viking, ١٩٨٦), ٤٨٨. J. C. Masterman, *the Double-Cross System in the War of ١٩٣٩ to ١٩٤٥* (New Haven, Conn.: Yale University Press, ١٩٧٢).

ئامانجەکانی تریش چەند کێشەیەکی تایبەت دروست دەکەن. بۆ وێنە، کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی لەسەر تیرۆریزم بەهۆی سروشتی تایبەتی هەر گروپێکەوە کۆسپی تێدەکەوێت. تا ئەو ڕادەیەی کە بەئەندامبوون لەو جۆرە گروپانە پەیوەستە بە ناسینی درێژخایەن، پەیوەندی خێزانیی، یان توانای پێشتر، کارەکە زۆر قورس دەبێت بۆ ئەوەی سەرچاوەیەکی هەواڵگری بخەیتە ناویانەوە. بەهەمانشیوە، بوونی دڵسۆزیی لەناو جۆرە گروپێکی لەم شێوەیەدا کارەکە قورس دەکات بۆ ئەوەی ئەندامێکی ئەو گرووپە قایل بکەی بۆ ئەوەی خیانەت و ناپاکی لێبکات.
کێشەکان کۆتاییان نایەت تەنانەت ئەگەر کەسێکیش بە سەرکەوتویی بخزێنرێتە ناو گروپێکی تیرۆرستی. بۆ مانەوەی ئەندامێک بەو شێوازەی تۆ دەتەوێت، دەبێت ئەو سەرچاوەیە پشتیوانی ماددی بداتە، یاخود بەژداربێت، کردەوە تیرۆرستیەکان. زۆربەی دەزگا هەواڵگرییەکان ناچارن هەندی سنوور دابنێن لەسەر کردەوەیەک کە ئەفسەری چالاکیەکان یاخود سەرچاوەکە بیگرێتە بەر بۆئەوەی زانیارییە ئەسڵیەکەی بپارێزێت. لە هەمانکاتدا، بەکارهێنانی ئەو زانیاریانەی لەلایەن سەرچاوەکەوە دراوە بۆ ئاگادارکردنەوە لەدژی یان بەپێچەوانەوە پوچەڵکردنەوەی کردەیەکی تیرۆرستی پلانبۆداڕێژراو بۆئەوەی بۆ تیرۆرستان ڕوون بکاتەوە کە هەواڵدەرێک لەناو ئەواندا هەیە، بەم شێوەیەش مەترسیی دەکەوێتە سەر ژیانی ئەو سەرچاوەیە. بەزۆری ئەندامێک فێڵی لێناکرێت و ناخرێتە ناو بازنەیەکی هەواڵگرییەوە کە پێیەوە هەڕەشەی لێبکرێت بۆ ئەوەی دەزگاکە دەرفەتی ئەوەی هەبێت بچیتە ناو بنج و بناوانی کردەوەکانیان گروپی لەو

جۆرە، ناتوانرێت بە ئاسانی کارەکان بەشێوەیەکی تەندروست ئەنجام بدەن.

***ڕێگا تایبەتەکانی ئەفسەری هەواڵگریی لەگەڵ سەرچاوەی زانیاریی(Tradecraft)*** ئەو ڕێگا تایبەتیانەی ئەفسەرێکی هەواڵگریی بەکاریان دەهێنێت بۆ ئەوەی کاری خۆی تیادا بکات و پەیوەندی بە سەرچاوەکانیەوە بکات بەبێ ئەوەی لەلایەن هەواڵگریی بەرامبەرەوە پێی بزانرێت پێی دەوترێت(Tradecraft). مەترسیدارترین گرفت کە ئەفسەرێکی هەواڵگریی تووشی دەبێت بریتییە لەوەی کە لایەنی بەرامبەر دەیخاتە ژێر چاودێری وردەوە (چاودێری بکە و بەدوایدا بڕۆ) بۆ ئەوەی چاودێری هەنگاوەکانی بکات و ناسنامەی هەموو ئەو کەسانە ئاشکرا بکات کە پەیوەندی پێوە کردووە. پاشان ئەرکی ئەفسەرەکە ئەوە دەبێت بزانێت ئایا لەژێر چاودێریدایە یان نا، ئەگەر لەژێریدابوو، خۆی لەم چاودێرییە بدزێتەوە بۆ ماوەیەکی تەواو درێژ وە بەتەواوی پەیوەندیەکانی بچڕێنێت لەگەڵ سەرچاوەکە بەبێ ئەوەی ناسنامەکانیان ئاشکرا بکات.

یەکێک لەو تەکنیکانەی بۆ خۆدزینەوە لە چاودێریکردن لەلایەن سی ئای ئەیەوە فێری ئەفسەرەکانی کراوە لەلایەن *ئیدوارد لی هاوارد* ڕوونکراوەتەوە، کە خۆی ئەفسەرێک بوو لەو دەزگایە، بۆ خۆدزینەوە لە چاودێری ئێف بی ئای لە ساڵی ١٩٨٥. لەکاتی گەڕانەوەیان بۆ ماڵەوە، خێزانەکەی شوفێریی دەکرد، وە گەیشتنە ئەو بڕوایەی ئۆتۆمبیلێکی ئێف بی ئای چاودێرییان دەکات، *هاوارد* بە خێزانەکەی وت کە لە سوڕانەوەیەکدا بسوڕێتەوە لە فلکەیەکی تاریکدا! هەر کە لە کۆرنەرەکە

سوڕایەوە، ناویراو دەرگاکەی کردەوە و خۆی فڕێ دایە خوارەوە بەبێ ئەوەی زیانی بەرکەوێت. لە هەمانکاتدا، خێزانی *هاوارد* لە شوێنەکەیدا بوکەڵەیەکی هێنایە دەرەوە، وایانیشاندا کە ئەو کەسانەی لە دوورەوە چاوەدێرییان دەکەن وەک مرۆڤێکی ئاسایی دەرکەوێت و وابزانن *هاوارد* هێشتا لەناو ئۆتۆمبیلەکەیدایە. دواتر خێزانەکەی گەڕایەوە ماڵ، چووە ناو گەراج، وە دەرگای گەراجی داخست، وای لە تیمی چاوەدێری کرد وابزانن *هاوارد* لەماڵە، بەم شێوەیەش ناویراو توانی ڕابکات بەبێ ئەوەی کەسێک هەستی پێبکات.

هەروەها (tradecraft) لە چەند تەکنیکێک بۆ پەیوەندیکردن بە سەرچاوەیەکەوە بەبێ ئەوەی بەهیچ شێوەیەک چاویان بەیەک بکەوێت، پێکدێت. بۆ نموونە، لەوانەیە ئەفسەرەکە پارچەکاغەزێک تەسلیمی سەرچاوەکە بکات کە لە شەقامێکدا بە تەنیشت یەکتردا تێدەپەڕن[1]. ئەگەر بە دروستی پرۆسەکە جێبەجێ کرا، بێگومان لەلایەن دەزگا چاوەدێرییەکان لایەنی بەرامبەر هەستی پێ ناکرێت. دەکرێت ئەفسەرەکە جانتایەک لە تەنیشت سەرچاوەکەدا بەردڵتەوە لەکاتێکدا خەریکی خواردنەوەی قاوەیەک بێت؛ سەرچاوەکە دەچێتە سەر ئەو مێزەی کە ناویراو لێیەوە جانتای خۆی دادەنێت، هەردوو جانتاکە لەڕووی شێوە و قەبارەوە ڕێک وەک یەکن. ئەو کاتە سەرچاوەکە دەچێت جانتای ئەفسەرەکە لەجیاتی هی خۆی هەڵدەگرێتەوە. دووبارە، ئەگەر لایەنی چاوەدێر بەوردی سەیری پرۆسەی دانان و هەڵگرتنەوەی جانتاکەی کردبێت، ئاڵوگۆڕکردنەوەکە هەستی پێ ناکرێت.

---

[1] Brush-pass

بەهەمانشێوە، ئەفسەرێکی هەواڵگریی دەکرێت تێبینیەک لە شوێنی دیاریکراو بەجێ بهێڵێت، وەک دانانی لەناو کونی دارێک لە پارک، چەند کاتژمێرێک دواتر، سەرچاوەکە دەری دەهێنێت.[i] ئەگەر ئەفسەرەکە ئەو پارچە کاغەزە جێ بهێڵێت بەبێ ئەوەی پێی زانرابێت، ئەو کەسەی چاوەدێری دەکات هەر بەردەوام دەبێت لە بەدواداچوونی، ترک بەوە ناکات کە ئەو چاوپێکەوتنەی دەبوایە ڕوویدات کۆتایی پێهاتووە. ڕۆبەرت هانسن، تایبەتمەند لە دژەهەواڵگری *ئێف بی ئای* بەتۆمەتی سیخوڕیکردن بۆ بەرژەوەندی یەکێتی سۆڤیەت و پاشان ڕوسیای فیدراڵی درایە پاڵ بۆ ماوەی نزیکەی پانزە ساڵ، کە بەزۆری بەهۆی ئاڵوگۆڕکردنی جانتاوە پەیوەندی دەبەست[ii]؛ بەپشت بەستن بە لێکۆڵینەوەکانی *ئێف بی ئای* لەگەڵ ناوبراو، ئەو ئەم ڕێگایەی بە سەلامەتترین شێواز داناوە:

> یەکێکی تر لەو شتانەی دەزگایەکی هەواڵگریی پێویستە خۆی لێ بپارێزێت، ئەگەر بکرێت، چاوپێکەوتنی سەرچاوەکەیە لەو وڵاتەی تیایدا سیخوڕی دەکات. وە هەر زۆر باشتریشە ئەگەر لە وڵاتی سێیەمدا یەکتر ببینن، کە تیایدا چاوەدێریکردن کەمتر بێت یاخود هەر نەبێت. بۆ نموونە، یەکێتی سۆڤیەت زۆربەی جار پێی وابووە باشترە چاوی بە سەرچاوە گرنگەکانی ئەمریکی بکەوێت، وەک جۆن وۆکەر(کە برێکی زۆری زانیاری نهێنی سەبارەت بە پەیوەندییە کەشتیگەلەکان و ئۆپەراسیۆنەکانیان بەخشی) لە

[i] John Barron's account of the Soviet spy ring headed by John Walker, *Breaking the Ring* (Boston: Houghton Mifflin, ١٩٨٧), ٨٠ ٩٦.
[ii] Dead-drop

ئەمسا، وڵاتێک بەشێوەیەکی فەری بێ لایەن بوو لە جەنگی ساردا هەرچەندە شێوازی حوکمی ئەمسا ئەورووپیەکی دیموکراسی بوو.[i]

لە چەندین کەیسی تردا ئەو دەزگا هەواڵگریانەی لە دژی ئەمریکا کاریان دەکرد پێیان باش بوو سەرچاوەی زانیاریەکەیان لە کەنەدا یان مەکسیک ببینن. هۆکاری لۆجیکی لەپشت ئەمەش بریتیی بوو لەوەی کە ئەمریکیەکان بە ئاسانی دەتوانن سەردانی هەردوو وڵاتەکە بکەن. بۆ نموونە، زمانناس و شیکەرەوەی سی ئای ئەی *لاری وۆتای* چین، کە ماوەیەکی درێژی بۆ بەرژەوەندی کۆماری وڵاتی چین سیخوڕی دەکرد، بە بەردەوامی سەردانی شاری تۆرۆنتۆی دەکرد بۆ ئەوەی زانیاری ورد بدات بە ئەفسەرەکەی.[ii]

یەکێکی تر لە ئامرازە کۆنەکانی تر بۆ ئەفسەری هەواڵگری و سەرچاوەکان بۆ ئەوەی پەیوەندی بە یەکترەوە بکەن بەبێ ئەوەی ڕووبەڕوو چاویان بەیەکتر بکەوێت، بریتییە لە "نووسینی نهێنی" و "نووسینی زۆر بچووک".[iii] ئەم تەکنیکانە لەو کەیسانەدا سوودیان هەیە کە تیایدا ئەفسەرەکە و سەرچاوەکە هۆکارێکی ڕواڵەتییان هەیە بۆ پەیوەندی کردن بە یەکترەوە بەڵام گومان لەوە دەکەن کە دەکرێت نامەکانیان لەلایەنی بەرامبەر بکرێتەوە و لەکۆتاییشدا بخوێنرێتەوە. بۆ بەکارهێنانی نووسینی نهێنی،

---

[i] Herbert Rommerstein and Stanislav Levchenko, *The KGB against the "Main Enemy": How the Soviet Intelligence Service Operates against the United States* (Lexington, Mass.: Lexington, ١٩٨٩), ٢٩٣.

[ii] Nicholas Eftimiades, *Chinese Intelligence Operations* (Arlington, Va.: Newcomb, ١٩٩٨), ٣٣, ٣٦–٣٧.

[iii] Microdots

ئەفسەرەکە یان سەرچاوەکە لەسەر بەرگی نامەکە شتێکی جیاواز لە ناوەڕۆکی نامەکە دەنووسێت. ئینجا، بەبەکارهێنانی پارچە کاغەزێکی تایبەتی کاربۆن، پەیامێکی نهێنی لەسەر نامە ئەسلیەکە دەنووسێت. پەیامەکە بەچاوی ئاسایی نابینرێت بە تەنیا ئەو کاتە دەبینرێت کە لەلایەن ئەفسەرێکی تایبەتی کیمیاییەوە دەپشکنرێت، بەم شێوەیە هەردوو لایەنەک دەتوانن پەیامەکانیان ئاڵوگۆڕ بکەن. "نووسینی زۆر بچووک" دووەم ئامرازی پەیوەندی کردنە؛ لەم کەیسەدا، وێنەکان بچووک دەکرێنەوە و لەشوێنێکی ناو نامەکەدا دەشاردرێنەوە، دەکرێت لەژێر مۆرەکەدا بێت، یان شوێنی شکاندنەوەی زەرفی نامەکە، یاخود لەسەر ئەو خاڵەی لە کۆتایی هەر ڕستەیەکدا دادەنرێت.

## هەڵاتووەکان[1]

تا ئێستا قسەمان لەسەر ئەو ئەفسەرە هەواڵگرییانە بووە کە لە مەسکەنی خۆیانن- واتە، ئەو کەسەی زانیاری دەدات لەوکاتەی خۆی بەدوور دەگرێت لە پێگەیەکی فەرمیی. ئاشکرایە ئەمە بەپێی لێکدانەوەکانی کۆکردنەوەی زانیاری باشتری حاڵەتە، چونکە وادەکات بەردەوام دەستی بە زانیاری بگات، هەروەها سەرچاوەکەش بۆ ئەوەی بەڵگەنامەی تایبەت یان زانیارییەک بەدەست بهێنێت کە پێویست و بەسوودن. بەڵام ئەمە پێویستی بەوە هەیە کە پەیوەندییەکان لەنێوان سەرچاوە و ئەفسەری کەیسەکەی بە شاردراوەیی بمێننەوە، وە مەترسی دروست دەکات لەسەر سەرچاوەکە ئەگەر گیرا.

---

[1] Defectors

لە شوێنێکی قەدەغەکراودا، ئەم بارقورسیانە تەنانەت زیاتریشن. لەئەنجامدا، کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی مرۆیی لە دژی ئەم جۆرە وڵاتانە بەزۆری لەسەر ئەم جۆرە هەڵاتوانە بەندە. لەڕووی هەواڵگرییەوە، ئەمە ئەو سەرچاوانەن کە لە شوێنی خۆیان نامێننەوە بەڵکو لەوڵاتەکانیان هەڵاتوون، بە نایاسایی، وە پەناهەندەییان پێدراوە. لە ماوەی دوای جەنگی جیهانیی دووەمدا، کۆکرینەوەی زانیاری هەواڵگریی مرۆیی لەلایەن ڕۆژئاواوە لە دژی یەکێتی سۆڤیەت بە توندی پشتی بەستبوو بەم جۆرە کەسانە. بۆ نموونە، لە سەرەتای پەنجاکاندا، دەزگا هەواڵگرییە ڕۆژئاواییەکان زۆر سەرکەوتوو نەبوون لە تەجنیدکردنی ئەفسەرە هەواڵگرییەکانی سۆڤیەت. هەرچەندە لە ساڵی ١٩٥٤، لەماوەی چوار مانگدا، پێنج ئەفسەر ڕایانکردە ڕۆژئاوا. ئەو هەڵاتوانە بوون بەهۆی دونیایەک لە زانیاری گرنگ لەبارەی ئۆپەراسیۆنەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە ماوەی دەیەی دوای جەنگی دووەمی جیهانیی. بەهۆی ئەم هەڵاتوانەوە، زانیاری گرنگی نوێ زانرا دەربارەی مومارەسەی ئاسایش دەزگای ($KGB$) وە تەڵەکەی ئەفسەرانی ئەو دەزگایە، ئەمە بووە هۆی شکاندنی کۆدی چەندین حکومەتی تر، تەڵەکانیان بۆ حکومەتە ڕۆژئاواییەکان، وە تیرۆگلانی ئەو دەزگایە لە کوشتنی چەندین کەسی دیاری وڵاتەکانیان.[i] بەهەمانشێوە، هەڵاتنی *حوسێن کەماڵ*، زاوای سەدامی

---

[i] لە کۆتاییدا ساڵی ١٩٥٣دا، دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت، پاشان ناونرا بە $MGB$ (وەزارەتی ئاسایشی دەوڵەت)، بەشێک بوو لە وەزارەتی ناوەخۆ ($MVD$). دوای دەستگیرکردنەکەی *بێریا* و دواتر کوشتنی لە ساڵی ١٩٥٣ بە تۆمەتی تیرۆگلان لە مردنی ستالیندا، دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت دووبارە لە

دیکتاتۆر، لە ئابی ١٩٩٥ بووە هۆی بەخشینی زانیاری بەهادار دەربارەی بەرنامە نهێنیەکەی عێراق لەبارەی پێشخستنی چەکی بایۆلۆژی کە لەلایەن کۆمسیۆنی پشکنینی نەتەوە یەکگرتووەکان لەماوەی چوار ساڵی پێشودا ئاشکرانەکرابوو.

سەرەڕای گرنگییان، هەڵاتووەکانیش کێشەی خۆیان هەیە. لەوانە، کارێکی قورسە دڵنیابین کە ئەوان هەر بەڕاستی لە وڵاتەکانیان ڕایانکردووە، نەوەک هاوڵاتی دڵسۆز بن کە لەلایەن حکومەتەکانیانەوە نێردرابن بۆ هەڵخەڵەتاندنی لایەنی بەرامبەر. بێگومان پێویستە هەندێ گومانمان هەبێت کاتێک مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین، هیچ نەبێت لە سەرەتادا. ئەو زانیارییە گوماناویانەی لەلایەن چەندین هەڵاتووی گرنگی سۆڤیەتەوە بە ئەمریکا دراوە- بەتایبەت، دەربارەی بوون و نەبوونی سیخوڕی سۆڤیەت لەناو حکومەتی ئەمریکادا- هەرگیز بە تەواوی چارەسەر نەکراوە؛ بۆماوەی چارەگە سەدەیەک سەری لە هەواڵگری ئەمریکی شێواندووە.[i]

---

وەزارەتی ناوەخۆ جیاکرایەوە وە بوو بە *KGB* (کۆمیتەی ئاسایشی دەوڵەت). لەوکاتە نائارامەدا بوو لەناو دەزگای هەواڵگریی کە ئەم هەڵاتنانە ئەنجامدران. هەرپێنج هەڵاتووەکان (وە ئەو وڵاتانەی بۆیان چوون) ئەمانەی خوارەوە بوون: یوری (یابان)؛ پیۆتر دێریابین (نەمسا)؛ ڤلادیمێر و ئیڤدۆکیا پێترۆڤا (ئوستورالیا)؛ نیکۆلای خۆخلۆڤ (ئەڵمانیای ڕۆژئاوا). بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە:

Gordon Brook-Shepherd, *The Storm Birds: Soviet Post-War Defectors* (London: Weidenfeldand Nicolson, ١٩٨٨), ٥٧–١٣١.

[i] Tom Mangold, *Cold Warrior: James Jesus Angleton, the CIA's Master Spy Hunter* (New York: Simon and Schuster, ١٩٩١), and Edward J. Epstein, *Deception: The Invisible War between the KGB and the CIA* (New York: Simon and Schuster, ١٩٨٩).

## کۆکردنەوەی زانیاری تەکنیکی

کۆکردنەوەی زانیاری تەکنیکی بریتییە لە کۆمەڵێک تەکنیک بەبەکارهێنانی تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو، ئەوەک سیخوڕی مرۆڤ، بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی. ئەم جۆرە هەواڵگرییە بە هەموو کەسێک ئەنجام نادرێت بەڵکو کەسانی تایبەتمەند و بلیمەتی پێویستە بۆ ئەنجامدانی. ئەو جۆرە تەکنیکانەی بەکاریان دەهێنن بریتین لە وێنەگرتنی دوورمەودا و بڕینی شەپۆلی کارۆموگناتیسی.

## هەواڵگری فۆتۆگرافیی یان وێنەیی

ئەم هەردوو هەواڵگرییە، هەروەک لە ناوەکانیانەوە دیارە، بریتییە لە بەکارهێنانی وێنەگریی بۆ کۆردنەوەی زانیاریی. وردتر بدوێین، ئەم جۆرە وێنەگرتنی دوورمەودایە بەکاردەهێنێت بۆ دەستخستنی وێنەی شوێن یان شت کە ناتوانرێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەدەستمان بگات. ئەم جۆرە هەواڵگرییە وەک چاوەدێری ئاسمانیی دەستی پێکرد، ڕێک لەوکاتەدا دەرکەوت کە خودی فڕۆکەوانی سەری هەڵدا.[i]

---

[i] تەنانەت بەر لەو کاتەش، باڵۆن بەکاردەهاتن بۆ چاوەدێری بارەگاکانی دوژمن لەلایەن یەکەم کۆماری فەرەنسی لە ساڵی ١٧٩٤، وە لەلایەن سوپای یەکێتی لە جەنگی ناوەخۆی ئەمریکادا. لە هەردوو کەیسەکەدا سەرکەوتنی بەرچاو بەدەست نەهات، وە هەردوو سوپاکە دواتر لەیەکتر هەڵوەشانەوە.
(William E. Burrows, *Deep Black: Space Espionage and National Security* (New York: Random House, ١٩٨٧; New York: Berkley, ١٩٨٨), ٢٦–٢٨)

لە سەرەتای جەنگی جیهانیی یەکەمدا، لە ئابی ١٩١٤، هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانی هەڵسا بە چاوەدێریکردنی سوپای ئەڵمانی لە ڕێگای ئاسمانیەوە کە بەناو بەلجیکادا پێشڕەوییان دەکرد. هەرکە قۆناغی سەرەتایی جوڵانەوەکە کۆتایی هات وە سوپاکانی ئەڵمانیا و هاوپەیمانان ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە بەدرێژایی بەرەیەک لە سویسراوە بۆ زەریای باکور، چاوەدێری ئاسمانیی وەک بەدیلێک بینرا بۆ ئەو ئەرکە قورس ■ پڕئازارەی سیخوڕی مرۆیی کە چیتر ئەم تەکنیکە توانای نەبوو ڕووبەرێکی فراوان بەدرێژایی و لەپشت سوپای دوژمن چاوەدێری بکات. هەروەک عەمید *ویلیام میچێل* نووسیویەتی، "جەنگێک لەسەر هێڵەکاندا زیاتر ■■■ هۆی فراوانکردنی بیر و هۆشم دەربارەی ئەوەی چۆن سوپاکان پێک هاتوون لە هەر ژمارەیەک لە گەشتکردن لەسەر زەویەکانی دوژمن."[i]

بە زێتر بەرەوپێشچوونی بواری فرۆکەوانی و وێنەگریی، پشکنینی وێنەیی ئاسمانیی بوو بە سەرچاوەیەکی گرنگ لە زانیاری هەواڵگریی لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا. ئەم تەکنیکە نەک تەنیا بۆ دۆزینەوەی شوێنی سوپا و جووڵەکانی هێزی دوژمن بەکاردەهات بەڵکو بۆئەوەی زانیاری لەسەر پێشکەوتنە گرنگەکانی تەکنەلۆژیاش وەربگرێت. بەم پێیەش، بەریتانیەکان وێنەی ئاسمانیان بەکارهێنا، ئەمە سەرەڕای سەرچاوەکانی تری زانیاریی بۆ ئەوەی موتابەعەی پێشکەوتنە تەکنیکیەکانی ئەڵمانەکان بکەن، وەک پەیوەندییە ڕادیۆییەکانی دروستکراو لەلایەن پیشەسازی

---

[i] William Mitchell, *Memoirs of World War I: "From Start to Finish of Our Greatest War"* (New York: Random House, ١٩٦٠), ٥٩, as cited in Russell F. Weigley, *The American Way of War* (Bloomington: Indiana University Press, ١٩٧٧), ٢٢٤.

ئەڵمانیاوە بۆ ڕێنمایی کردنی فڕۆکە بۆمبهاوێژەکانیان بۆ سەر ئامانجەکان لە ئینگلتەرا، ڕادارە نوێکانی بەرگری ئاسمانیی، و موشەکەکانی (ڤی ١) و (ڤی ٢).[i]

تا هەنووکە، هەموو ئەو نموونانەی باسکران لەکاتی جەنگەدا بوون؛ ئەمە بێگومان دەکرێت بەشتێکی ئاسایی دابنێین. لەکاتی جەنگدا ماندەری سەربازیی بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە چالاکییە زیاترە، وە بەربەستە سیاسیەکانیش بۆ هەمان کردار کەمترن. تەنیا گرنگتر نییە کە بزانن چی لە ناو وڵاتی دوژمندا دەقەومێت لەکاتی جەنگدا، بەڵکو شێوازی بەدیلی زانین لەبارەی ئەم چەندە کەمترن. کەسێک ناتوانێت بەتەنیا پشت بە ڕاپۆرتی ڕۆژنامەوانان، گەشتیاران، دبلۆماتکاران یان کارمەندێکی باڵیۆزخانە ببەستێت؛ بەگشتی، ڕومالی میدیایی بەتووندی کۆنترۆڵدەکرێت، سنوورەکان دادەخرێن، وە گەشت لەنێوان وڵاتی ئامانجدا یاساغ دەکرێت، تەنانەت بۆ هاونیشتیمانیانی وڵاتی خۆیشی وە هاوڵاتیانی وڵاتانی بێ لایەنیش بە هەمانشێوە. لە هەمان کاتدا، یاساغی یاسای نێودەوڵەتی لەدژی فڕین بەسەر وڵاتێکی تردا بەبێ ڕەزامەندی چیتر نابنە بەربەستێکی سیاسیی.

ئەو بارقورسیانەی ئەمریکا تووشی بوو لە هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی چالاکی کۆکردنەوەی مرۆیی لەدژی سۆڤیەت لەماوەی ساڵانی دوای جەنگی جیهانیی دووەم وای کرد ئەگەری بەکارهێنانی وێنەی ئاسمانیی لەکاتی

[i] R. V. Jones, *Most Secret War* (London: Hamish Hamilton, ١٩٧٨), reprinted in the United States as *The Wizard War: British Scientific Intelligence,* ١٩٣٩–١٩٤٥ (New York: Coward, McCann and Geoghegan, ١٩٧٨).

ئاشتیشدا بخاتە بەرنامەی کاریەوە. ئەو ئارەزووە بەهێزتر بوو کاتێک لە ساڵی ١٩٥٠ لەوە ترسا کە داگیرکاری کۆریای باکوری بۆ کۆریای باشوور ڕەنگە سەرەتایەک بێت بۆ داگیرکاریەکی سۆڤیەت بۆ ئەورووپای خۆرئاوا. بەلەبەرچاوگرتنی نەبوون و دەگمەنیی سەرچاوەی هەواڵگری مرۆیی، ئەمریکا لەوە ترسا کە ئامادەکارییەکانی سۆڤیەت بۆ ئەم جۆرە داگیرکردنە دەکرێت پێی نەزانرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، زانیاری سەرەتایی هەواڵگری لەبارەی "فەرمانی جەنگ"ی سۆڤیەت بەزۆری نەبوو، وە بەم پێیەش، بۆ حکومەتی ئەمریکی قورس بوو حوکمی لۆژیکی بدات دەربارەی ئەوەی دەبێت خەرجی سەربازی خۆی چەند بێت.

یەکێک لە نموونەکانی نەبوونی داتای مرۆیی لەسەر سوپای سۆڤیەت بریتیی بوو لەو هەرەشەی تەخمینکراوەی "بۆشایی بۆمبهاوێژەکان"ی ناوەڕاستی ساڵانی پەنجاکان. ئەمریکا زانیاریەکی زۆر کەمی هەبوو لەسەر پلانەکانی سۆڤیەت یان توانای ئەو وڵاتە بۆ بنیادنانی فڕۆکەیەکی بۆمبهاوێژی جەنگیی یان "قورس" (فڕۆکەیەک کە توانای هەڵگرتنی بۆمبی ناوەکی هەبێت بە مەودای بۆمبی کیشوەربڕ). بەڵام ئاهەنگەکانی ڕۆژی سوپای سۆڤیەت لە تەممووزی ١٩٥٥، هەر یەکسەر دوای "چوار وڵاتە زلهێزەکە" (ئەمریکا، سۆڤیەت، فەرەنسا، وە بەریتانیا) لە کۆڕی جنێف، کارمەندێکی بەرپرسی ئاسمانیی ئەمریکی لە باڵیۆزخانەی وڵاتەکەی بیست و هەشت فڕۆکەی بۆمبهاوێژی نوێی بینی کە بەو ئاوەدا دەفڕین. وادەرکەوت کە سۆڤیەت بەرنامەیەکەی لەناوبردنی ئەنجامداوە بۆ بنیادنانی بۆمبهاوێژی ستراتیژیی کە دەبووە هۆی، بە دیدی پلانەکانی بەرگریی ئەمریکا، کردنەوەی بۆشاییەکی گرنگ- ئەمەش دەبووە هۆی دروستکردنی

بۆشاییەکی گرنگ لەنێوان تواناکانی ئەمریکا و سۆڤیەت لەم ناوچەیەدا. بەڵام ئەو کارمەندە فێڵی لێکرا و هەڵخەڵەتێنرا. ئەو بیست و هەشت فرۆکەی بۆمبهاوێژی نەبینیوە بەڵکو ژمارەیەکی کەمتری بینیوە کە بۆماوەی چەند جارێک سوڕابوونەوە.[i] نەبوونی زانیاری متمانەپێکراوی زیاتر، وە راپۆرتی ئەو کارمەندە بووە بناغەی چەند بڕیارێکی زیادکردنی خەرجی بەرگری ئاسمانیی.

چەندین هەوڵ دران بۆ ئەوەی زاڵ بن بەسەر ئەو کەم زانیاریەدا دەربارەی سۆڤیەت. یەکێک لەو پرۆژانە، کە ناوی نهێنی (Moby dick) بوو، پێکهاتبوو لە فڕاندنی باڵۆن بۆ ئاسمان لە ئەورووپای خۆرئاوا کە کامێرای وێنەگرتنیان پێوە لکاندبوو، ڕووی لە خوارەوە کرابوو. بیرۆکەکە ئەوە بوو کە ئەم باڵۆنانە دواتر بەسەر ئاسمانی سۆڤیەتدا دەفڕن بە ئاراستەی بایەکی خۆرئاوایی تاوەکو دەگەنە یابان یان زەریای هێمن. لەم خاڵەدا، کامێراکانیان لە وەڵامی سیگناڵی رادیۆیی بەردەدرێنە خوارەوە. لە ڕاستیدا، ژمارەیەکی زۆەی ئەو باڵۆنانە لە ئاسمانی یەکێتی سۆڤیەتدا هاتنە خوارەوە، وە بووە هۆی ئەوەی سۆڤیەت لە چۆنیەتی تەکنەلۆژیاکە تێبگات. لە هەر کەیسێکدا، بەهۆی جووڵەی هەکەزایی باڵۆنەکان لەسەر زەویەکی فراوانی یەکێتی سۆڤیەت، ئەو وێنانەی لە فلیمەکەدا دەردەهێنران کەم زانیاری هەواڵگریان بەدەستەوە دەدا.

لە تەمموزی ١٩٥٥دا، لە کۆڕی "چوار گەورەکە"دا، سەرۆک *ئایزنهاوەر* پێشنیاری پلانی "ئاسمانی کراوە"ی خستەڕوو بۆ چاوەدێری کردنی ئاسمانی دوولایەنەی ئەمریکا و سۆڤیەت. بەگوێرەی ئەم پلانە، هەردوولا

---

[i] John Prados, *The Soviet Estimate: U.S. Intelligence Analysis and Russian Military Strength* (New York: Dial, ١٩٨٢), ٣٨–٥٠.

"پلانی تەواوی پێکهاتە سەربازییەکانیان بەیەکتر دەدەن"، و هەر وڵاتێک مافی ئەوەی دەبێت چاوەدێری ئاسمانی بە سەربەستی پەیڕەو بکات لەسەر سنووری ئاسمانی ئەوی تریان.[i] *ئایزنهاوەر* پێی وابوو هەر هەوڵێک دوادەخات لە هەر هێرشێکی لەناکاودا؛ بەپێی بیرکردنەوەی خۆی، هێرشبەرێکی نادیار بەو ئاسانییە ناتوانێت ئامانجەکەی بپێکێت ئەگەر چاوەدێری ئاسمانیی بێ سنوور بێت. ئەو چاوەدێرییە ڕێککەوتنی داماڵینی چەکیش لە داهاتوودا ئاسان دەکات، چونکە هاوکار دەبێت لە یەکلاییکردنەوەی ئەوەی ئایا لایەنی بەرامبەر پابەندە بە ڕێککەوتنەکەیان یان نا.

*ئایزنهاوەر* ویستی لەسەر ئەوەنەبوو پلانەکانی مەرجدار بکات بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پێشکەوتووی هەواڵگریی لەسەر ڕێککەوتنی سۆڤیەت. بەرلە هەشت مانگ، لە ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٥٤، ناوبراو بەنهێنی ڕەزامەندی دەربڕیبوو لەسەر پێشخستنی فڕۆکەی ئاسمانیی وێنەدار، فڕۆکەی (U-٢)، کە دەیتوانی بەبێ ئەوەی شەڕکەر و موشەکە ئاسمانییەکان بکەنە ئامانج، بفڕێت. سەرەڕای ئەمەش، شتێکی چاوەڕواننەکراو بوو کە وەرگرتنی زانیاری بەهۆی کامێرای فڕۆکەوانییەوە دەبێتە هۆی مەترسیەکی مەزن.[ii] سەرۆک وەزیرانی سۆڤیەت، *نیکیتا*

---

[i] Stephen E. Ambrose, *Eisenhower: The President*, vol. ٢ of *Eisenhower* (New York: Simon and Schuster, ١٩٨٤), ٢٦٤–٦٥.

[ii] دامەزراوەی ڕاند لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٤٦، داوای لێکرا کە لێکۆڵینەوەیەک بکات لەسەر ئەوەی تا چ ئەندازەیەک سەتەلایتی سوڕانەوە بەدەوری زەویدا دەست دەدات و زیانی نییە. لە لێکۆڵینەوەکەیدا، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە سەتەلایتەکان دەتوانن "بۆ

خرۆشۆف، پێشنیاری "ئاسمانی کراوە"ی ڕەتکردەوە، ناوبراو وای لێکدایەوە کە دەبێتە هەوڵێک بۆ بەیاساییکردنی کردەی سیخوڕیی. لە ٢١ی حوزەیرانی ١٩٥٦، ئایزنهاوەر بەنهێنی ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر گەشتی (U-٢) بەسەر سۆڤیەتدا. لەماوەی چوار ساڵی داهاتوودا، گەشتەکانی (U-٢) بەسەر هەردوو سنووری سۆڤیەت و بەدرێژایی سنوورەکەی، بەسەرکەوتوویی زانیاری زۆری دەرخست، بۆ یەکەم جار بووە هۆی ئەوەی ئەمریکا جبەخانەی تاقیکردنەوەی سەربازیی و بنکە گرنگەکانی سۆڤیەت ببینێت. سۆڤیەتەکان لەڕێی کەناڵ دبلۆماسییەکانیانەوە بەنهێنی ناڕەزایی زۆریان دەربڕی لەدژی ئەم فڕینانە بەڵام لەسەرەتادا نەیتوانی هیچ هەنگاوێک بهاوێژێت. بەڵام ماوەیەکی زۆری نەبرد سۆڤیەت دەستی کرد بە دروستکردنی هەندێ ئامراز بۆ هێرشکردنە سەر (U-٢). لە یەکی ئایاری ١٩٦٠، ئەوان سەرکەوتوو بوون لە خستنەخوارەوەی یەکێکیان، فڕۆکەوانەکەشیان گرت، لە پرۆسەیەکدا کە ناوی (*فرانسیس گاری پاوەرس*) بوو.

---

چاوەدێری فڕۆکەیی بەکاریێت وە ئەو فڕۆکەیەی لایەنی بەرامبەر ئەگەر لەڕووی تەکنیکەوە هەمان کوالیتی نەبێت، ناتوانرێت بهێنرێتە خوارەوە.

Walter A. McDougall, *The Heavens and the Earth: A Political History of the Space Age* (New York: Basic Books, ١٩٨٥), ١٠٢–١١.

Merton E. Davies and William R. Harris, *RAND's Role in the Evolution of Balloon and Satellite Observation Systems and Related U.S. Space Technology*, R-٣٦٩٢-RC (Santa Monica, Calif.: RAND, September ١٩٨٨).

تەنانەت بەر لە ڕووداوی(U-٢)، ئەمریکا دەستی کردبوو بە کارکردن لەسەر توانای وێنەی سەتەلایتی چاوەدێریی.[i] هەرچەندە ئەو تەکنەلۆژیانە لەماوەی قۆناغی پەرەسەندنەکەی بەئاشکرایی گفتوگۆی لەسەرکراوە، بوونی ئەو تەکنەلۆژیایە، لەسەرەتای ساڵانی نووەوە، وەک زانیاری زۆر نهێنی لەقەڵەم دراون.[ii] ئەم سیاسەتە هەتا ساڵی ١٩٧٨ بەچالاک مایەوە، کاتێک سەرۆک جیمی *کارتەر*، ویستی خەڵکی ئەمریکا دڵنیابکاتەوە لە دروستکردنی پەیمانی *سالت*،[iii] بە ئاشکرایی دووپاتیکردەوە کە ئەمریکا خاوەنی تەکنەلۆژیایەکە کە توانای هەواڵگریەکەی بەهێزتر بووەوە، شایانی باسە، هەروەک باسکرا، ئەم تەکنەلۆژیایە بۆ ماوەی چەندین ساڵ بە نهێنیی مابووەوە. بەکۆتایی هاتنی جەنگی سارد، بوون و ناسنامەی نووسینگەی چاوەدێری نیشتیمانی(*NRO*)- شوێنێک کە بەرپرس بوو لە

---

[i] McDougall, *The Heavens and the Earth*, ٩٧–١٣١, ١٩٠, and ٢٢٤, and Dwayne A. Day, John M. Logsdon, and Brian Latell, *Eye in the Sky: The Story of the Corona Spy Satellites* (Washington, D.C.: Smithsonian, ١٩٩٨).

[ii] هەرچەندە دەکرێت رادابنرێت کە سۆڤیەتیەکان تێگەشتن کە ئەم جۆرە چاوەدێرییە بوونیان هەیە، بەڵام وا بەباش نەزانرا کە ڕای گشتی خەڵک لەم حەقیقەتە ئاگادار بکرێتەوە. لە هەمانکاتدا، یەکێتی سۆڤیەت ئەو هەڵوێستەی گرتەبەر کە چاوەدێری ئاسمانی بۆتە هۆی پێکهێنانەی سیخوڕیی و ئەمەش بەپێچەوانەی یاسا نێودەوڵەتیەکانی چاوەدێری ئاسمانی بوو. بەلەبەرچاوگرتنی ئەم هەڵوێستە، ئەمریکا نیگەرانی ئەوە بوو کە گفتوگۆیەکی کراوەی چاوەدێری ئاسمانی دەبێتە هۆی هاندانی دەستبەجێی مۆسکۆ کە گرفتێکی لێیەوە ساز بکات. دواتر لە کۆتاییەکانی سەردەمی ئیدارەی ئایزنهاوەردا، وە لەسەرەتای ئیدارەی جۆن کەنەدی، چەند هەنگاوێک گیرانەبەر بۆ بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە.

[iii] Strategic Arms Limitation Treaty

پڕکردنەوەی پێداویستی هەواڵگری حکومەتی ئەمریکا بۆ ڕای گشتی خەڵک ئاشکرا کرا.[i]

گرنگترین تایبەتمەندی چاودێری وێنەیی لەئاسمانەوە بریتییە لەوەی کە دەبێت کوالیتی و هێزی ئەو ئامێرەی بەکارهاتووە بۆ کۆکردنەوەی فۆکەسکردنە سەر ماددە لەسەر زەوییەوە، زۆر بەهێز بێت. هەڵبژاردنی ئەو بەرزییەی کە سەتەلایتەکەی تیادا دەسوڕێتەوە دووبارە کاریگەری هەیە لەسەر کوالیتی وێنەکان، واتە؛ تا بەرزیەکەی کەمتر بێت، وێنەکان ڕوونتر دەبن. هەروەها، پەیوەندییەکی تەواوکەر لە نێوان بەرزی و کاتی مانەوەی سەتەلایتەکە هەیە لە بڕیاردان لەسەر کوالیتی وێنەکە. فاکتەرەکانی تری سوڕانەوە کە پێویستن بۆ ئەو کاتانەی ڕووی کامێراکە لە ڕۆژ بێت، واتە کوالیتیەکی وای هەبێت وێنەکان بەئاراستەی خۆریش بگرێت. نموونەی ئەو وڵاتانەی لە ئێستادا خاوەنی ئەم جۆرە تەکنۆلۆژیایەن و بەکاریان دەهێنێت بریتین لە وڵاتانی؛ ڕوسیا، ئەفریقیای باشوور، کەنەدا، هیندستان، ئوستراڵیا، ئیسرائیل، چین و بەڕازیل. هەموو ئەو وڵاتانەی ناویان هێنران، خۆیان بەرهەمهێنەری ئەم تەکنەلۆژیایەن.[ii]

---

[i] Eric Schmitt, "Spy-Satellite Unit Faces a New Life in Daylight," *New York Times*, November ٣, ١٩٩٢, A١٠.

[ii] Rachel E. Billingslea, Matthew R. Domsalla, and Brian C. Payne, *The National Reconnaissance Office: A Strategy for Addressing the Commercialization of Space Imagery*, April ٦, ١٩٩٩, available at www.fas.org/eye/ ADA٣٦٦٦١٠.htm.

بوونی بەرفراوانی وێنەی بازرگانی هەم سوودی هەیە هەمیش گرفت بەدوای خۆیدا دەهێنێت. لەلایەک، بەهۆی کڕینی ئەو ئامێرانەوە، لەوانەیە حکومەت بەشێک لە پێداویستیە

# هەواڵگری هێمایی[i]

هەواڵگریی هێما بریتییە لە پرۆسەی وەرگرتنی زانیاری لە ڕێگای ئەو شەپۆلە کارۆموگناتیسیەی لەلایەن دەزگایەکی هەواڵگرییەوە دەبرِدرێن. ئەم جۆرە هەواڵگرییە بەگوێرەی جۆری ئەو شەپۆلە کارۆموگناتیسبەی کە دەستیان کەوتووە لەڕێی هەواڵگرییەوە، پۆلێن دەکرێت:

- هەواڵگری گەیاندن (پەیامی رادیۆیی)
- هەواڵگری تێلیمەتریی (هێمای شەپۆلی فرۆکە)
- هەواڵگری ئەلیکترۆنی (وەک رادار)
- یان هەر شەپۆلێکی تری کارۆموگناتیسی کە بەشێک بێت لە ئامێری ئەلیکترۆنی، وە بکرێتە ئامانجی وەرگرتنی سیگنالی دەزگایەکی تری هەواڵگریی.

---

وێنەییەکانی خۆی دابین بکات، بەم شێوەیەش رێگا بە دەزگا هەواڵگرییەکانی دەدات سەرنجی خۆیان چڕبکەنەوە لەسەر پێویستییە تایبەتیەکان کە ڕەنگە وابەئاسانی ناتوانرێت بەجۆرێکی تر دەست بخرێت. لەلایەکی ترەوە، تەشەنەکردنی سەتەلایەتی چاوەدێری وێنەیی بازرگانی کارەکە بۆ حکومەت زۆر قورستر دەکات بۆ ئەوەی بارەگا هەستیارە سەربازییەکانی و ئەو ئۆپەراسیۆنانەی ئەنجامیان دەدات بشارێتەوە.

[i] Signal intelligence

## هەواڵگری گەیاندن[i]

لەسەرجەم جۆرەکانی هەواڵگری هێمادا، کۆنترینیان بریتییە لە هەواڵگری گەیاندن کە بۆ کاری ڕادیۆیی بەکاردەهات بۆ سوود وەرگرتن لێی بۆ کاری گەیاندنی سەربازیی وە دبلۆماسیی.[ii] بەدرێژایی جەنگی جیهانیی دووەم، ئەم جۆرە هەواڵگرییە (لەگەڵ شیکردنەوەی کۆدەکان- شکاندنی ئەو کۆدانەی کە پەیامی گرنگی پێدا دەگوازرێتەوە)، تا ئەو ئەندازەیەی زانیاری بەردەست ڕێگامان پێدەدات حوکمی لەسەر بدەین، گرنگتر بوو لە هەر سەرچاوەیەکی تری هەواڵگریی بۆ زلهێزەکان، هەم لەکاتی جەنگ و هەمیش لە ئاشتیدا.[iii]

یەکێک لە کۆنترین ئەو بەڵگەنامانەی بەردەستن لەبارەی بەکارهێنانی هەواڵگری گەیاندن بریتیی بوو لە هەوڵەکانی کەشتیگەلی بەریتانیا لەماوەی جەنگی جیهانیی یەکەم بۆ دەستخستنی زانیاری پێشوەختەی ئاگاداربوون لە هاتنی ئەڵمانەکان بۆناو زەریای باکوور. هەروەها، لە

---

[i] Communication intelligence

[ii] مێژووی بەکارهێنانی بڕینی پەیام پێش بەکارهێنانی ڕادیۆ وەک ئامرازێکی پەیوەندی دەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەکی زۆر بەرلە بوونی ڕادیۆ، ئەوکات پەیامبەران دەستگیردەکران وە نامەکان دەکرانەوە. هەروەها، کێبلی تەلەگراف دەکرێت بشکێنرێت وە بە ئاسانی گوێی بۆ بگیرێت. لەماوەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا، بەریتانیەکان دەستپێشخەر بوون لە ڕووی هەواڵگرییەوە کە کۆمپانیاکانیان خاوەنی چەندین کۆمپانیای مەزنی هێڵی کێبلی نێودەوڵەتی بوون، یاخود ئەگەر خاوەنیش نەبونایە، ئەوا لەوێدا کاریان دەکرد.

[iii] David A. Hatch with Robert Louis Benson, *The Korean War: The Sigint Background* (٢٠٠٠), available at www.nsa.gov/korea/papers/sigint_background_korean_war.hm

سەرەتای جەنگەکەدا بەریتانیەکان کێبلی تەلەگرافی ژێرئاوی ئەڵمانیایان بڕی کە دەبووە هۆی بەیەکبەستنەوەی ئەڵمانیا بە ئەمریکا، ئەفریقیا و ئیسپانیا. لە ئەنجامدا، "کێبل"ی دبلۆماسی ئەڵمانی بۆ ئەم ناوچانە دەبوایە بەهۆی ڕادیۆوە بنێردرێت و لەو کاتەشدا موعەڕەز بوو بۆ ئەوەی لەلایەن بنکە چاوەدێریەکانی بەریتانیاوە بشکێت.[i]

بەبێ لە بەرچاوگرتنی سەرکەوتنەکانی پێشوو، لە جەنگی جیهانی دووەمدا بوو کە ماوەی زێڕینی بەریتانیەکان، ئەمریکاش، لە بەکارهێنانی هەواڵگری گەیاندنەوە دیاریکرا. بەریتانیەکان توانیان ئەو گەیاندنە زیاد لە ئاڵۆزەی ئەڵمانیا و یابان بشکێنن، وە بڕێکی زۆر لە زانیاری گرنگ و وردی سەربازیی، سیاسیی بخەنە بەردەستی سەرکردەکانی هەردوو وڵاتی بەریتانیا و ئەمریکا. ئەوەی دەمێنێتەوە بڵێین ئەوەیە کە مێژوو ئەوە یەکلایی دەکاتەوە کە ئەم جۆرە هەواڵگرییە ج ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا لە یەکلاییکردنەوەی جەنگی جیهانیی دووەم و سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە دژی زلهێزەکانی تری ئەو جەنگەدا.[ii]

یەکێک لە نموونە دیارەکانی سوودی هەواڵگری گەیاندن لە کەیسی سەرکەوتنی هێزی کەشتیگەلی ئەمریکا بەسەر یاباندا لە جەنگی "میدوەی"[iii] خۆی دەبینێتەوە. یابان دەیویست سەرکەوتنە مەزنەکەی

---

[i] بۆ زانیاری تەواو لەسەر کەشتیگەلی بەریتانیا لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی، بڕوانە:

Patrick Beesley, *Room ٤٠: British Naval Intelligence ١٩١٤–١٨* (New York: Harcourt Brace Jovanovich, ١٩٨٢).

[ii] G. J. A. O'Toole, *Honorable Treachery: A History of U.S. Intelligence, Espionage, and Covert Action from the American Revolution to the CIA* (New York: Atlantic Monthly, ١٩٩١), ٣٨٤–٩٧.

[iii] Midway

بەکاریهێنێت لە پێرل هاربەر لە کانوونی یەکەمی ١٩٤١ بە گرتنی شوێنی ستراتیژی دوورگەی میدوەی وە، لە پرۆسەکەدا، هەموو ئەو شوێنەواران لەناوبەرن کە پەیوەندیان بە هێزەکانی کەشتیگەلی ئەمریکا لە زەریای هێمندا هەیە. ئەگەر پلانی یابان سەریگرتبا، دوورگەی هاوایش داگیردەکرا، وە ئەمریکا دەبوایە بە مەرجەکانی تۆکیۆ بۆ ئاشتی قایل ببوایە. بەنیسبەت یابانیەکان، سەرکەوتنێکی خێرا لە زەریای هێمن زۆر گرنگ بوو، چونکە جەنگان لە شەڕێکی وا درێژخایەندا لەگەڵ وڵاتێک کە خاوەنی ژمارەیەکی دانیشتوانی ئاواز زیاتر بێت وە لە ئەساسدا بەهێزتریش بێت، کارەساتێکی مەزن بوو بۆ ئەمریکیەکان وە سەرکەوتنێکی بێ وێنە بوو بۆ یابانیەکان.

بەبێ ئەوەی یابانیەکان ئاگاداربن، شارەزایانی شکاندنی کۆدی نووسینی هێزی دەریایی ئەمریکی لە یابان ئاگاداری پەیوەندیەکانیان بوون وە کۆدی هێزی دەریایی یابانیەکانیان دەشکاند. لە ئەنجامدا، هێزە ئەمریکیەکان لە پێشدا پلانی هێرشی یابانیەکانیان بۆ سەر میدوەی ئاشکرا کرد.[i] پرچەک بەو زانیارییە هەواڵگرییە، ئەدمیرال چێستەر نیمیتز هێزی دەریایی یابانیەکانی خستە ناو بۆسەیەکەوە لە باکوری دوورگەکە لە ٤ی حوزەیرانی ١٩٤٢، کە بووە هۆی تێکشکاندنی چوار کەشتی سەربازیی و شکاندنی توانای یابان بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی مەزن لە زەریای هێمندا. شەڕی میدوەی شکستێکی مەزن بوو بۆ یابانیەکان وە خاڵی وەرچەرخانی

[i] Edwin T. Layton with Roger Pineau and John Costello, *"And I Was There": Pearl Harbor and Midway—Breaking the Secrets* (New York: Morrow, ١٩٨٥), ٤٢١–٢٢.

جەنگەکەش بوو؛ ئەم شکستە هەموو هیوای یابانیەکانی کۆتایی پێهێنا کە پێیان وابوو جەنگەکە بەخێرایی دەباتەوە.

لەکاتێکدا کە ئێمە پێشبینی دەکەین کە هەستیارترین پەیامی ڕادیۆیی وڵاتێک بە کۆد دەکرێت بۆ پاراستنی نهێنیەکانی، هەندێ بواری هەواڵگریی گەیاندن هیچ کۆدشکێنیان نییە. بەهۆی ئەو خەرجی و بارقورسیەی هەیەتی، هەندێ پەیامی ڕادیۆیی کۆد نەکراون؛ بۆ نموونە، گەیاندنی دەنگی تەکتیکی، وەک لە نێوان فڕۆکە و بنکەکانی کۆنتڕۆڵی ئەرزیی، عادەتەن لە فەزایەکی ڕووندا ئاڵوگۆڕیان پێدەکرێت. لە کەیسی تردا، ناردنی پەیامەکان بەو ڕێگەیەدا کۆد نەکراون چونکە بڕوا وایە، جا ڕاست بێت یان هەڵە، کە نەیارێک ناخوازێت، یان ناتوانێت، ئەو کۆدانە ببڕێت (بەهۆی ئەو قەبارەی مەزنەی زانیاری کە هەیانە) یان پرۆسێسیان بکات. بۆ نموونە، پەیامەکانی گەیاندنی هاتووچۆی بازرگانی کۆد نەکراوە، هەرچەندە هەندێ لە زانیاریەکانی دەکرێت بەهای بۆ دوژمنێک هەبێت. لە کۆتاییدا، نابێت ئێمە لە گرنگی نا هەستیاری ئاسایی کەم بکەینەوە: بۆ نموونە، ئەمریکا تەنیا وەڵامێکی درەنگی دایەوە کاتێک زانی کە تەلەفۆنکردن بۆ شوێنی دوورمەودا کە بەهۆی تاوەرەکانی مایکرۆوەیڤەوە دەنێردرێت لەلایەن ئەو وڵاتانەی کە پەیوەندی دبلۆماسییان لەگەڵیدا هەبوو دەبردرێن و پەیامەکان ئاشکرا دەبن.[i]

---

[i] U.S. Senate, Select Committee on Intelligence, *Meeting the Espionage Challenge: A Review of United States Counterintelligence and Security Programs,* S. Rpt. ٩٩-٥٢٢ (Washington, D.C.: Government Printing Office, ١٩٨٦), ٣٣–٣٤, ٨٠–٨١.

یەکێتی سۆڤیەت بۆماوەی چەندین ساڵ (هەروەک ڕووسیا کردی تا ساڵی ٢٠٠٢) بەردەوامیدا بە بڕینی چەندان پەیامی گەیاندن لە شاری لۆردیسی کوبا.

هەروەها، تەکنیکێک لەم بوارەدا هەیە کە بە "شیکردنەوەی هاتووچۆی پەیامەکان" دەناسرێت، ئەمە وا دەکات زانیاری بەسوود بەدەست بێن لە قەبارە و تایبەتمەندی دەرەکی گەیاندنی ڕادیۆکان، تەنانەت کاتێک ناوەڕۆکی پەیامەکان ناڕوونیش بن. بۆ نموونە، ئەگەر بارەگایەکی سوپا وە بەشە بچووکەکانی نامەی دەنگی بەڕێگای شەپۆل ئاڵوگۆڕ بکەن، دەکرێت شیکەرەوەیەک بگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئۆپەراسیۆنێکی گرنگ خەریکە ڕوودەدات. بە هەمانشێوە، بەهۆی "دۆزینەوەی ئاراستە،"- تەکنیکێک بۆ ئاشکراکردنی بنەڕەتی جوگرافی هێمایەکی ڕادیۆیی- کەسێک دەتوانێت شوێنی کەشتی، فڕۆکە یان ئەو شوێنەی پەیامەکەی لێ دەرچووە ئاشکرا بکات.

لە کاتێکدا زۆربەی هەواڵگری گەیاندن لە شکاندنی پەیامی ڕادیۆیی پێکدێت، دەکرێت ئەو پەیامانەی لە ڕێگای وایەریشەوە دەنێردرێن بشکێنرێن. ئەمە پێویستی بە دەستگەیشتن هەیە بەو وایەرانەی کە پەیامەکانیان پیادا دەگوازرێنەوە. بۆ نموونە هێڵی تەلەفۆنی نۆرمال کە بە وایەر پەیامەکانی دەگەیەنرێت بۆ باڵیۆزخانە یەن کونسوڵخانەیەکی وڵاتی نەیار لەناو خاکی وڵاتەکەیدا.

دەکرێت بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر هەندێ جار دەستمان بە هەندێ زانیاری بگات، تەنانەت لە دەرەوەی وڵاتی خۆیدا، لە شارە دابەشکراوەکانی ڤییەننا وە بەرلین لە سەرەتا و ناوەڕاستی ساڵانی پەنجاکاندا، هەواڵگریی بەریتانی و ئەمریکیەکان توانیان دەستیان بەو وایەرانە بگات و گوێ بۆ سەرجەم گفتوگۆکان بگرن کە لەلایەن

دەسەڵاتدارانی سوپای سۆڤیەتەوە بەکاردەهات.[i] لە بەرلینیشدا، ئەمریکیەکان توانیان دەست بەسەر وایەرێکدا بگرن لە شارەکەدا کە بەژێر ناوچەی دەسەڵاتدایی ئەواندا تێدەپەڕی کە لە بنەڕەتدا لەلایەن سۆڤیەتەوە پلانی بۆ دانرابوو.[ii]

تەکنیکێکی تری هاوشێوە بریتییە لە وەرگرتنی زانیاری لەڕێگای کێبڵەوە لەژێر دەریاوە لەلایەن وڵاتی نەیارەوە. بۆ نموونە، لەساڵانی حەفتاکاندا، ئەو غەواسە دەریاییانەی کەشتیگەلی دەریایی ئەمریکا توانیان لەژێر دەریای *ئۆخۆتۆسک* کێبڵێکی ژێردەریایی سۆڤیەت ئاشکرا بکەن کە بەسترابووەوە بە بنکەی سەرەکی هێزە دەریاییەکانی سۆڤیەت لە *پیترۆپاڤلۆڤسک* لە نیمچەدوورگەی *کامچاتکا* لەگەڵ *ڤلادیڤۆستۆک* و مۆسکۆ. غەواسەکان ئامێرێکیان بەستبووەوە کە گفتوگۆکەیان تۆمار دەکرد؛ ئەو تۆمارانە بەشێوەیەکی ئاسایی هەموویان کەوتنە بەر دەستی ئەمریکیەکان.[iii]

دەکرێت بەهۆی ئەم جۆرە تەکنیکەوە دەستمان بکات بەو و ئامێرانەی کە بەکارهاتوون لە ناردن و وەرگرتنی گفتوگۆی کۆدکراو. بۆ نموونە، ئەفسەرێکی پێشووی هەواڵگری بەریتانیا سەرکەوتنەکانی خۆی دەگێڕێتەوە لە گفتوگۆی دیۆماسی نهێنی میسریەکان لەگەڵ دانانی ئامێرێکی بیستۆکی گوێگرتن لە شوێنێکی نزیک ئامێری کۆدشکێنی

[i] Wiretapping
[ii] David E. Murphy, Sergei A. Kondrashev, and George Bailey, *Battleground Berlin: CIA vs. KGB in the Cold War* (New Haven, Conn.: Yale University Press, ١٩٩٧), chap. ١١.
[iii] Sherry Sontag and Christopher Drew, *Blind Man's Bluff: The Untold Story of American Submarine Espionage* (New York: Public Affairs, ١٩٩٨), ١٥٨–٨٣ and passim.

بەریتانیەکان لە نزیک باڵیۆزخانەی لەندەنی میسری. بە بەکارهێنانی وەستایەکی چاککەرەوەی تەلەفۆن، ئەفسەر هەواڵگرییەکانی بەریتانی توانیان ئامێرێک ببەستنەوە لە تەلەفۆنێکی نزیک شوێنەکە کە توانای هەبوو دەنگی دوورمەودا وەربگرێت کە لەلایەن میسریەکانەوە بەکاردەهات. بەم زانیارییە، کۆدشکێنەرە بەریتانیەکان توانیان ئەم سیستەمە بشکێنن و پەیوەستی بکەن بە شێوازی ئامێریکاری هەواڵگری خۆیان، وە بەم شێوەیەش گوێیان لە هەموو ئەو گفتوگۆیانە بوو کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی میسرەوە دەکرا. ئۆپەراسیۆنی هاوشێوەش ئەنجامدران لەو کاتەی میسرییەکان ئامێری نوێیان دەهێنایە بەریتانیان بۆ بەکارهێنانیان لەناو باڵیۆزخانەکەیاندا، هەواڵگریی ئەو وڵاتە ئامێری سیخوڕیی بچووکیان دەخستە ناو ئەو ئامێرانەی میسر، وە بەم شێوەیەش گوێیان لە سەرجەم زانیارییە ئاڵوگۆڕکراوانە دەبوو.[1]

پێشکەوتنە تەکنەلۆژیەکان لە پەیوەندی شەپۆلیدا کێشەی نوێی خوڵقاندووە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری بەهۆی گفتوگۆی شەپۆلی د وایەرەوە. لەکاتێکدا بڕینی شەپۆلی ڕادیۆیی ئاسایی پشت بە توانا بۆ دانانی ئانتێنێکی وەرگری هەستیاری باش لە شوێنێکی گونجاودا دەبەستێت، وە گوێگرتن لە هێڵی تەلەفۆنی ئاسایی پەیوەندی بەوەوە هەیە بتوانین بەشێوەیەکی فیزیکی بوونمان بۆ ناو ئامێرەکە هەبێت، بڕینی شێوازی نوێی گفتوگۆ کێشەی قورستری خوڵقاندووە. بۆ نموونە، کێبلی

[1] U.S. Senate, Select Committee on Intelligence, *Meeting the Espionage Challenge*, ٣٤–٣٥; for an unofficial account of this episode, see Kessler, *Moscow Station*, ٩٢–٩٧.

فایبەر ئۆپتیک،[i] کە لەڕووی بازرگانییەوە زیاتر بایەخی پێدەدرێت چونکە زیاتر ئاساییشی پەیوەندی دابین دەکات (واتە، دەتوانێت زانیاری زیاتر بنێرێت لەهەر یەکەیەکی کاتتدا)، هەروەها قورسترە بتوانرێت گوێی لێبگیرێت بەبەراورد لەگەڵ ئەو وایەرانەی کە بەشێوەیەکی ئاسایی بەکاردەهاتن. بەهەمان شێوە، تەلەفۆنی مۆبایلی ئاسایی، سەرەڕای ئەو ڕاستیەی کە بەهۆی شەپۆلی ئاسمانییەوە داتاکانی دەگوازرێنەوە، کێشەی قورس دروست دەکات بەهۆی ئەو قەیدانەی خاوەنی مۆبایلەکە دەیخاتە سەر مۆبایلەکەی بۆ زانینی جوڵەکانی پەیوەندیکەرەکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.[ii]

## هەواڵگری دووریێو[iii]

فۆرمەکانی تری هەواڵگری هێما نوێترن لە هەواڵگریی گەیاندن، بۆ ئەم فۆرمانە ڕەنگدانەوەی پێشکەوتنی بەکارهێنانی دیاردەی موگناتیسی کارەبایین لە سەربازییدا. هەواڵگری تێلێمەتری لە ڕووی فیکرەوە وەک هەواڵگری گەیاندنە جگە لەو گەیاندنانەی کە بەدزیەوە گوێ دەگیرێت لە نێوان ئامێرێکی تاقیکردنەوە (وەک موشەک) وە بنکەی سەرزەوی، وە ئەو گەیاندنە لە وشە پێک نایەت بەڵکو لە خوێندنەوە و پێزانینی کۆد پێکدێت کە پەیوەستن بە لایەنی بەرامبەر بۆ ڕێگرتن لە ئاشکرابوونی

---

[i] fiber-optic cables

[ii] بۆ باسێکی تێروتەسەل لەمەڕ گرفتەکانی بڕینی دەنگی کێبلی فایبەر ئۆپتیک، بەتایبەتی ئەوانەی لەژێر دەریادا دانراون، بڕوانە:
Neil King Jr., "As Technology Evolves, Spy Agency Struggles to Preserve Its Hearing," *Wall Street Journal*, May ٢٣, ٢٠٠١, A١.

[iii] Telemetry

پلانەکانیان. (ئەم گەیاندنی پەیامانە بە تێلیمەتری ناسراون—واتە پێوانە کردن لە دوورەوە). بەهای ئەم جۆرە گۆڕاوانە، پلەی گەرما لە خاڵی جیاواز لەناو ئامێرەکەدا، ڕێژەی شەپۆلی وزە، و چەندان هۆکاری تر، هەموویان بەیەکەوە، وێنەیەکی ڕوونی ئەوە بە ئەندازیارەکانی سەر زەوی دەدات کە بزانن لەوێ چی دەگوزەرێت. ئەمە یارمەتی ئەندازیاران دەدات هەر کێشەیەک بدۆزنەوە کە سەرهەڵدەدات لەکاتی هەر تاقیکردنەوەیەک وە چاککردنەوەی ئەدای ئامێرەکە.

بەهەمان شێوە، ئەم جۆرە زانیاریانە بەهایەکی بێ شوماریان هەیە بۆ دوژمنانیش. ئەگەر بتوانن ئەو گفتوگۆیانە ببڕن و داتاکانی وەرگێڕن، ئەوا دەتوانن ناوەڕۆک سیستەمی چەکی نوێ بزانن کاتێک ئەوان هێشتا لە قۆناغی تاقیکردنەوەدان. (شیکردنەوەی داتای دووریپێو-تێلیمەتری کارێکی زۆر قورسە؛ لەگەڵ شیکردنەوەی کۆدشکێنیی، لە بەشی داهاتوودا وەک جۆرێکی شیکردنەوەی هەواڵگریی باسکراوە.) بەم شێوەیە، هەروەک لە هەواڵگریی گەیاندن بینرا، ئەو وڵاتەی تاقیکردنەوە ئەنجام دەدات هەوڵی جیددی دەدەن بۆ ئەوە ڕێ لە دەستگرتن بەسەر ئەو زانیاریانە بگرن بۆ زانیاری تێلیمەتری بە ناردنەوەیان بۆ وێستگەکانی سەرزەویی بە فۆرمێکی کۆدکراو. یاخود، داتای تێلیمەتری دەکرێت تۆمار بکرێن وە لەسەر ئامێری تاقیکردنەوەدا بهێڵرێنەوە بۆئەوەی جارێکی تر وە لە دواتردا دەستیان پێ بگاتەوە. ئەم پرۆسەیە، کە پێی دەوترێت "پوختکردنەوە"، وا دەکات داتاکان لە هەر دزەپێکردنێک بپارێزرێن؛ هەرچەندە، دەکرێت ئەمە ڕێکارێکی مەترسیدار بێت، چونکە لەحاڵەتی شکستی وێرانکەری ئامێری تاقیکردنەوەکەدا، ڕێک کاتێک داتای

تێلیمەتری زیاترین سوودی دەبێت، ئەو کەپسولەی زانیاریەکانی تیادا پارێزراوە دەکرێت لەناو بچن یان کارەکە قورس بکات بۆ ئەوە شوێنی بزانرێت.

## هەواڵگری ئەلیکترۆنیی[i]

هەواڵگری ئەلیکترۆنی پێکدێت لە چاوەدێریکردن و شیکردنەوەی داتای ئەلیکترۆماگنێتیکی ناگەیاندن لە ئامێری سەربازیی بیانیدا. لە ئاستی هەرە سەرەتاییدا، هەواڵگریی ئەلیکترۆنی وا لە وڵاتێک دەکات کە بەردەوام بێت لە شوێنهەڵگرتنی پێکهاتە سەرەکیەکانی سوپای چەکداری وڵاتێکی تر(وەک ڕادار بەرگریی ئاسمانی، بنکەی فەرمان و کۆنترۆڵکردن)، ئەمە هەندێ جار پێی دەوترێت "تەنزیماتی ئەلیکترۆنی جەنگ." سیستەمی هەواڵگریی ئەلیکترۆنی سەتەلایتی پشکینینی پێشوەختەی زەریا ( The EORSAT) بەکارهاتوو لەلایەن یەکێتی سۆفیەتی جاران، وە ئێستاش ڕووسیا، نموونەیەکی زیندووی ئەم چاوەدێریکردنەیە. بۆماوەی چەندین ساڵ، ئەم سیستەمە بەکاردەهات بۆ زانین و ئاشکراکردنی شوێنی کەشتیگەلی ئەمریکا بە بڕینی ئیشارەتی ئەلیکترۆنی ئاسایی(وەک ڕادار) کە لەلایەن کەشتیەکانەوە دەنێردرا لەکاتی گەشتکردن لە دەریای بەرزدا.[ii] نموونەیەکی هەرە بەرچاوی ئەم جۆرە هەواڵگرییە لە ماوەی هێرشەکانی ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٨٢دا بۆ سەر لوبنان دەردەکەوێت. لەوکاتەی سوپای

---

[i] Electronics Intelligence

[ii] Jeffrey Richelson, *Sword and Shield: The Soviet Intelligence and Security Apparatus* (Cambridge, Mass.: Ballinger, ١٩٨٦), ١٠٣–١٠٥. Curtis Peebles, *Guardians: Strategic Reconnaissance Satellites* (Novato, Calif.: Presidio, ١٩٨٧), ٢٧٩–٨٩.

ئیسرائیل چووە ناو لوبنانەوە لە هەوڵێکدا بۆ لەناوبردنی هێزەکانی ڕێکخراوی ئازادی فەلەستینی (PLO) کە لەوێوە کارەکانیان دەکرد، فەرماندەری باڵای ئیسرائیلی نیگەران بوو لەبارەی ئەگەری هەر هێرشێک بۆسەر لەشکرەکەی لەلایەن هێز و تانکەکانی سوریا لە دۆڵی بەقعە لە ڕۆژهەڵاتی لوبنان. پاراستنی ئەم هێزانە وابەستە بوو بە لەناوبردنی پاتری "سام"ی هێزەکانی سوریا. بەبەکارهێنانی، درۆنی بچووک، بێ فڕۆکەوان، و نزم فڕ، ئیسرائیلیەکان توانیان فێڵ لە سورییەکان بکەن بە بڕینی شەپۆلی ڕاداری سیستەمەکەیان وە دیاریکردنی شوێنی ئەو درۆنانە. بەپشت بەستن بەو زانیاریانە، ئیسرائیلیەکان توانیان لە ئەنجامدا لەماوەی چەند کاتژمێرێک هێزە ئاسمانیەکانی خۆیان بنێرن و سەرجەم ئەو سیستەمەی سوریەکان لەناو بەرن، وە توانیان بە تەواوی دەست بەسەر ئاسمانی لوبناندا بگرن، وە هەموو ئەگەرێک لەناو بەرن کە مەترسی بێت لەلایەن سوپای سوریاوە بۆ ئەوە هاوکاری هێزەکانی ڕێکخراوی ئازادی فەلەستینی بکەن.

## کۆکردنەوەی زانیاری لە سەرچاوەی کراوە

### پەخش و بڵاوکراوە

هیچ باسێکی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی دروست نییە بەبێ ئەوەی ئاماژە بە ڕۆڵی کۆکردنەوەی زانیاری لە سەرچاوەی کراوە بدەین- واتە؛ ڕۆژنامە، پەرتووک، پەخشی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، ئینتەرنێت، وە هەر سەرچاوەیەکی تری کراوەی زانیاریی.

گرنگی سەرچاوەی کراوە لە پرۆسەی هەواڵگرییدا گفتوگۆیەکی زۆری لەسەر دەکرێت وە بەو پرسیارانەوە وابەستەیە کە باس لە چۆنیەتی سروشتی زانیارییە هەواڵگرییەکەوە دەکەن. یەکێک لە بۆچوونەکان، کە لەلایەن *شێرمان کێنت* وەک نموونە باسکراوە، بریتییە لەوەی کە زۆربەی "زانیاری هەواڵگریی سودبەخشی ئاستی باڵای بیانی... دەبێت لە ڕێگای چاوەدێریی و لێکۆڵینەوەی ورددا بێت.[i] لەلایەکی ترەوە بۆچوونی ئاساییتر ئەوەیە کە لەکاتێکدا سەرچاوەی کراوە دەکرێت زانیاری گرنگ، حەقیقەتی گرنگ، وەک نیەتی تایبەتی نەیارێک، دەبێت بەشێوەیەکی سەرەکی بەدەست بخرێت لە سەرچاوەی ناگشتییەوە، بەڕێگای سیخوڕیی و بەدەستهێنانی زانیاریی لە ڕێگای هونەری تایبەتەوە.

لە بەشەکانی داهاتوودا ئەمە بەتێروتەسەلی باسکراوە. لە ئێستادا، سەرنجەکە دەخرێتە سەر بەکارهێنانی جۆراوجۆر کە دەکرێت سوود لە زانیاری سەرچاوەی کراوە وەربگیرێت. بۆ نموونە، ئەرکی ئاسایی ئەفسەری هەواڵگری سەربازیی بریتییە لە ئامادەکردنی زانیارییەکی پوختی زۆر لەبارەی چەند وڵاتێک کە تیایدا ئۆپەراسیۆنە داهاتووەکانی سەربازیی ئەگەری ئەوەی تیایدا ئەنجام بدرێن. ئەم جۆرە زانیارییە پوختانە بە شێوەیەکی ئاسایی لە هەموو زانیارییەک کە سوودی هەیە بۆ ستافی هەواڵگری سەربازیی پێکدێن. زانیاری دەربارەی جوگرافیای وڵاتێک، پەیوەندیی و تۆڕەکانی گواستنەوەی، سیستەمی سەربازیی و ئابووریی وە زانیاری تر دەبێت بەشێوەیەکی پوخت کۆبکرێتەوە بۆئەوەی ئاسانکاری بۆ پلاندانەرەکە بکات بۆ ئەوەی بڕیارگەلێکی بەجێ بدات، وەک یەکلایی

---

[i] Sherman Kent, *Strategic Intelligence for American World Policy* (Princeton, N.J.: Princeton University Press, ١٩٤٩; reprint, ١٩٦٦), ٣٤.

کردنەوەی ئەوەی بە چ خێراییەک سوپا و شتمەکی پێویست دەبێت لە شوێنێکەوە بگوازرێنەوە بۆ شوێنێکی تر.

جگە لەچەند کەیسێکی وڵاتانی تەواو زانیاری پارێزراو نەبێت (وەک یەکێتی سۆڤیەتی جاران، کە لە ساڵی ١٩٨٨دا دانی بەوەدانا کە وەک رێوشوێنێکی ئەمنی نەخشەی وڵاتەکەی بە هەڵە نیشانی جیهانی دەرەوە دەدا)،[i] زۆربەی ئەو زانیاریانە لە سەرچاوەی نووسراوی کراوەدا بەردەست دەبن؛ نەخشەی رێگا و رێگای شەمەندەفەر وە خشتەی بەرێکەوتنیان، وتاری رۆژنامە و گۆڤارەکان، راپۆرتی ئابووری و ئاماری حکومەت، بە تەنانەت رێنمایی کۆنی گەشتکردنیش. کۆکردنەوە و پۆلێنکردنی دوو پرسی جیای ترن. برێکی زۆری زانیاری لەم جۆرە کۆکردنەوەیدا بەرجەستە دەبێت، وە ئەو سەرچاوانەی پێویستن بۆ کۆکردنەوە بۆ هەر وڵاتێک کە بزانرێت سوودیان هەیە بۆ کاری هەواڵگری. ئەگەر، هەروەک لە بەشی داهاتوودا باسکراوە، ئەو هێزە سەربازییە ئەمریکیەی کە لە ساڵی ١٩٨٣دا هەڵسا بە داگیرکردنی *گرینادا* نەخشە و زانیاری تری دەربارەی دوورگەکە پێ نەبوایە، ئەوا زۆر قورس بوو بتوانن ئە دوورگەیە داگیربکەن.

بەهەمانشێوە، برێکی زۆری سەرچاوەی ئاماریی لە سەرتاسەری جیهاندا داتای ئابوریی بڵاودەکاتەوە. بە بڕیاردان لەسەر ئەوەی دەبێت چ زانیاریەک کۆبکرێتەوە، پێویستی بەوەیە کە ئایا پێویستیەکانی ئەو هەواڵگرییە لە چیدا خۆی دەبینێتەوە. دەکرێت داتای ئابوریی پێویست

[i] V. Zaykin, "'Secret' Classification Removed," *Izvestiya*, September ٣, ١٩٨٨, ٢, reprinted and translated in Federal Broadcast Information Service (FBIS), *Soviet Report*, September ٨, ١٩٨٨ (FBIS-SOV-٨٨-١٧٤), ٥٣–٥٤.

بن بۆ پاڵپشتیکردنی نەخشاندنی سیاسەتی بازرگانی جیهان یان ئابلۆقەی دارایی، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کاریگەرییەکانی زیان و باندە نێودەوڵەتیەکان. جۆرەکانی تری داتای ئابووریی، چاوەدێری کردنی هاتنی پارەی کاش بۆناو وڵاتێک، دەکرێت ڕێنیشاندەر بێت بۆ زانینی مەودای بازرگانیکردن بە ماددەی هۆشبەر. لە کۆتاییدا، هەواڵگری ئابووریی دەکرێت پێویست بێت بۆ پشتیوانیکردنی شیکردنەوەی سیاسیی و سەربازیی. بۆ نموونە، لەکاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا، ئابووریناسەکانی دەزگای ستراتیژیی ئەمریکی، هەڵسان بۆ کۆکردنەوەی بڕێکی زۆری زانیاری کراوەی داتای ئابووری بۆ ئاسانکردنی دانانی پلانێکی ستراتیژی بۆردومانکردن: ئامانجەکە بریتیی بوو لە وێرانکردنی بەشەکانی ژێرخانی پیشەسازیی ئەڵمانی-وەک نەوت- کە بڕوا وابوو گرنگ بێت بۆ بەردەوامیدان بە هەوڵەکانی جەنگی نازییەکان. هەر لەو ماوانەی دواییدا، پێشبینیەکانی ڕەفتاری سۆڤیەت لە کۆتایی هەشتاکاندا ببوە پرسی ڕۆژەڤ کە چۆن باری ئابووری ئەو وڵاتە کاریگەریی دەبێت لەسەر بوارەکانی تری سیاسەتدا. هەر یەکێک لەم پێداویستییە هەواڵگریانە پێویستی بە جۆری جیاوازی داتای ئابووریی هەیە.

شیکەرەوە هەواڵگرییەکان پێوستیان بە هەمان جۆری زانیاریی هەیە-واتە، وتاری کەسایەتییە دیارە سیاسییەکان، دەقەکانی یاسا و بڕیارەکان، ئەژماری دانیشتوان وە داتای تری پەیوەستدار بە دانیشتوانەوە- کە پێویست دەبێت بۆ هەر شیکردنەوەیەکی ئەکادیمی دۆخی سیاسیی یان کۆمەڵایەتیی لە وڵاتێکی بیانیدا؛ لەڕاستیدا، بەرهەمی کۆتایی هەردووکیان دەکرێت هەمان شت بێت.

بەپشتبەستن بەسەرچاوە بەردەستەکان، دەکرێت دەزگایەکی هەواڵگریی هەڵسێت بە کۆکردنەوە زانیاری تایبەتمەند بە قەبارەیەک کە ببێتە هۆی جێگای سەرسوڕمانی توێژەرێکی کۆمەڵایەتیی. بۆ نموونە، هونەرێکی گرنگ بۆ تێگەیشتن لە پرۆسە سیاسییەکان و دروستکردنی بڕیاری سیاسیی سیستەمێکی "داخراو"ی سیاسیی لە زانینی پێشەکانی ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتیەکان بۆ زانینی ئەوەی کە کامە کاربەدەستی ئاست مامناوەند کاریگەری هەیە لەسەر بڕیارەکانی دەستەی باڵای جێبەجێکاری بڕیارەکان، پێکدێت. هەر کە ئەم جۆرە پەیوەندییە دیاریکران، شیکەرەوەیەک دەتوانێت، بە بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی ئاستی کاریگەریی ئەو کەسە، ڕێژەی بەهێزی بەرپرسە ئاستباڵاکانی ناوبراو بزانێت. بە ئەنجامدانی ئەم کارە، پێویست دەکات کە زانیاری تەولو لەسەر ئەو کەسە ئاست مامناوەندییە کۆبکرێتەوە کە لە سەرچاوەی کراوەدا هەن. ئەمە پێویستی بەوە هەیە کە چاوەدێری هەموو ڕۆژنامە و پەخشە تەلەفزیۆنیەکان بکرێت کە تیادا ئەو کەسە بەدەر دەکەوێت؛ تۆمارکردنی هەموو بابەتی هەواڵ لەسەر کەسەکە کە ئەو نیشان بدات چۆن پلەی بەرزکراوەتەوە، نزم کراوەتەوە، یان کاربەدەستێک گوازراوەتەوە یان کە هەردوو کاربەدەستە بە یەکەوە دەبەستێتەوە؛ و هەموو ئەنجامی داتاکانی بخرێنە ناو داتابەیسێکی کۆمپیوتەرەوە بۆ ئەوەی سوودی هەبێت بۆ توێژەران. زانایەک، تەنانەت پەیمانگایەکی ئەکادیمیش، دەکرێت قورس بێت فشاری بخرێتە سەر بۆ ئەوەی ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرێت.

## ڕاپۆرتی دبلۆماسیی و کارمەندی ناو باڵیۆزخانە

یەکێکی تر لە ڕێگاکانی کۆکردنەوەی زانیاریی- ڕێگایەک کە دەکرێت وەک پێکهاتەیەکی کۆکردنەوەی زانیاری لە ڕێگای مرۆییەوە و سەرچاوەی کراوە لەقەڵەم بدرێت، چونکە بەهۆی سیخوڕی مرۆییەوە بەدەستهاتووە بەڵام بە شێوازێکی ڕاستوڕەوان و یاسایی و بێ فێڵ و تەڵەکە، پێکدێت لە ڕاپۆرتی دبلۆماتکاران و فایلی کارمەندانی باڵیۆزخانەکان کە لە باڵیۆزخانەیەکی خانەخوێدا کاردەکەن دەربارەی ئەو ڕووداوانەی لەو وڵاتانەدا کە بۆی نێردراون. لە ڕاستیدا، هێڵکە لە نێوان دبلۆماتکار و ئەفسەری هەواڵگرییدا هەمیشە ڕوون نییە. هەروەک یەکێک لە مێژوونووسانی دبلۆماسی دەنووسێت، "هەندێ جار باڵیۆزەکان یەکسەر لەو هێڵی دیار لە نێوان کۆکردنەوەی زانیاری شەرعی و سیخوڕیی بۆ چالاکی تری قێزەوەن لادەدەن وە شتێک دەکەن کە لە بۆچوونی دەزگا هەواڵگرییەکان بەدەرە."[i] بەڵام تەنانەت ئیمڕۆش، کاتێک دوو وەزیفە جیاوازن، ڕاپۆرتە دبلۆماسییەکان لەسەر دۆخی سیاسیی لە وڵاتی خانەخوێ دەکرێت گرنگ بن بۆ هەر شیکردنەوەیەکی سیاسیی. ئەو دبلۆماتەی کە دەتوانێت بە ئاسانیی دەستی بگات بە کەسایەتیە سیاسییە دیارەکان لە وڵاتێک دەتوانێت زانیاری گرنگ بەدەست بهێنێت لەسەر دۆخی سیاسیی ناوخۆیی کە لە میدیا و ڕاگەیاندندا باس ناکرێت.[ii]

---

[i] Donald E. Queller, *The Office of Ambassador in the Middle Ages* (Princeton, N.J.: Princeton University Press, ١٩٦٧), ٩٠.
[ii] Kenneth M. Jensen, ed., *Origins of the Cold War: The Novikov, Kennan, and Roberts "Long Telegrams" of ١٩٤٦* (Washington, D.C.: United States Institute of Peace, ١٩٩١).

بە هەمانشێوە، نێردەی سەربازیی بۆ وڵاتێک، تا ئەو ڕاددەیەی دەستیان بە ئەفسەرانی سەربازیی وڵاتە خانەخوێکەیان دەگات، دەتوانن زانیاری تێروتەسەل بەدەست بێنن لەبارەی دامەزراوە سەربازییەکان، وەک کەسایەتییەکان وە لێهاتوویی ئەفسەر پلەدارە سەربازییەکان، وە زانینی ڕێگاکانی بەڕێوەبردنی ئەو کەسایەتیانە کە چۆن بیردەکەنەوە، بۆچوونیان چییە لەمەڕ ڕێبازی سەربازیی، وە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سەرکردایەتی سڤیل چۆنە. هەروەها، ئەو کارمەندانە بانگهێشت بکرێن بۆ ئەوەی چاودێری مەشقی سەربازیی بکرێن یان بەژداربن لە بۆنەی تری سەربازییدا کە تیایدا کەرەستەی نوێی سەربازیی تیایدا نمایش بکرێت. هەروەها دەکرێت گەشت بکەن لە وڵاتی خانەخوێدا وە بەم شێوەیەش تێبینی فڕۆکەخانەی سەربازیی، بەندەر، وە شوێنی تری سەربازیی و مەدەنی پێویست بە کاری هەواڵگریی دەکەن.

## جۆرەکانی تری سەرچاوەی مرۆیی

دبلۆماتکاران و کارمەندانی باڵیۆزخانە تاکە لایەنی بیانی نین کە سەردانی وڵاتان دەکەن و چاودێرییەکانیان دەکەنە ڕاپۆرت. بۆ نموونە، ڕێککەوتنی ساڵی ١٩٨٧ لە نێوان ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەتی جاران لەمەڕ قەڵاچۆکردنی موشەکی مەودا سەرەتایی و کورت (the INF Treaty) وە، لەم دواییانەشدا، پەیمانی ستراتیژیی کەمکردنەوەی چەک (START) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەر لایەنێک پشکنەر دەنێرێت بۆ بنکەی تایبەتی سەربازیی لایەنی تر بۆ دڵنیابوون لەوەی ئایا وڵاتەکە پابەندی مەرجەکانی ڕێککەوتنەکەیە یان نا. پشکنەران باشتر دەستیان دەگات بەو

بنکانە بە بەراورد لەگەڵ کارمەندانی باڵیۆزخانە یان سەردانیکەرانی ئەو وڵاتە. ئاشکرایە، ڕاپۆرتەکانیان زانیاری بایەخدار دەربارەی هێزە سەربازییەکانی وڵاتی خانەخوێ لەخۆ دەگرێت.
بەهەمانشێوە، خاوەن کرا، زانا، گەشتەوەر زانیاری فێردەبن لەبارەی ئەو وڵاتانەی سەردانیان دەکەن، زانیاریگەلێک کە لەکاتێکدا بەشێوەیەکی فەرمی نهێنیی نین بەلام لە میدیای گشتیشدا بەردەست نین. پرسی ئەوەی ئایا ئەو زانیارییە دەگاتە دەستی حکومەتەکەی خۆی یان نا، لە وڵاتێکدا کە هاوڵاتیانی پێویستیان بە ڕێپێدانێکی تایبەتی نییە بۆئەوەی بۆ دەرەوەی وڵات گەشت بکەن، پشت بە ویستی ئەو گەشتیارانە دەبەستێت بۆ ئەوەی بە دەسەڵاتدارانی وڵاتی خۆی ڕابگەیەنن. بەلام بەرزبوونەوەی گشتی بازرگانی نێونەتەوەیی، گەشتکردن، وە توێژینەوە بەو واتایە دێت کە دەرفەت بۆ ئەم جۆرە زانیاری کۆکردنەوە ئاشکرا لەم ساڵانەی دواییدا بەشێوەیەکی بەرچاو پێشکەوتووە.

## شیکرنەوە چییە؟

شیکرنەوە بریتییە لە پرۆسەی گۆرینی هەموو ئەو زانیارییانەی کە کۆکرلونەتەوە، بە هەرشێوازێک بێت، بۆ شتێک کە بەکەڵک بێت بۆ دارێژەرانی سیاسەت و فەرماندە سەربازییەکان.[i] ئەنجامەکە دەکرێت بە

---

[i] بازنەی هەواڵگریی خۆی لە پێنج هەنگاوردا دەبینێتەوە:

یەکەم: پلانداتان و ئاراستەکرن: ئەمە گرنگترین قۆناغی دەستپێکردن و تەنانەت کۆتایی هێنانە بە کاری هەواڵگریی چونکە ئەگەر لەم قۆناغەدا نەتولنرا بە دروستی پێداویستیەکانی ئامانجێکی هەواڵگریی تایبەت پرکاتەوە، ئەوا تەواوی پرۆسەکە بە هەڵەدا دەروات.

دووەم: کۆکردنەوە: بریتییە لە کارکردن بۆ کۆکردنەوەی زانیاریگەلێک کە پێویستن بۆ تەواوکردنی ئەرکێکی هەواڵگریی. بە چەندین شێوازی جیاجیا دەتوانرێت ئەم زانیاریانە کۆبکرێنەوە- لەوانە، سەرچاوەی کراوەی وەک تۆمارە گشتییەکانی حکومەت، راپۆرتی میدیایی، ئینتەرنێت، گۆڤاری وەرزیی، و پەرتووک.

سێیەم: ئامادەکردن: بریتییە لە ئامادەکردن ئەو زانیاریە دەستهاتوانەی کە بەهۆی سەرچاوەی جیاجیاوە بەدەست هاتوون و گۆرینیان بۆ چەند فۆرمێکی تایبەت بۆ ئەوەی بە دروستی بەکاربێن لەلایەن شیکەرەوەکانەوە. ئەمەش بەوە مەیسەر دەبێت کە کەسانی شارەزا و لێهاتوو ئەو زانیاریانە پۆلێن بکەن و بیانخەنە ناو فایلی پێویست بە ئامانجێکی دیاریکراو.

فۆرمێکی یاداشتی کورت، راپۆرتی فەرمی شیکاریی، ڕێنمایی، یان هەر ئامرازێکی تری پێشکەشکردنی زانیاریی بێت. ئەم بەشە جەخت دەخاتە سەر فراوانی تەکنیکە شیکارییەکان. لە باسکردنی ئەم جۆرە چالاکیانەدا، وشەسازیی ئاسایی هەواڵگریی هەردەم بەکارنایەت؛ لەڕاستیدا، شیکردنەوە هەڵگریی هیچ جۆرە ستانداردێک نییە. سەرەڕای ئەمەش، ئەو کۆمەڵەیەی [illegible] هەن نە دەقیق و وردن نە بۆ هەردوو شێواز دەشێن. لێرە هەوڵێک دراوە بۆ ڕێکخستنی تەکنیکەکان بەپێی پێشکەوتووترینیان، وەک شکاندنی کۆدی ئەو پەیامانەی کۆدکراون، بۆ قەبڵاندنترین، وەک پێشبینیکردنی دۆخی سیاسیی و کۆمەڵایەتی داهاتوو. بەشی دوای ئەمیش

---

چوارەم: شیکردنەوە و ئەنجام: بریتییە لە گۆڕینی زانیاری سەرەتایی [illegible] هەموو سەرچاوەکانەوە بۆ زانیاری تەواوکراو. ئەم قۆناغە پێک دێت لە لێکدان، هەڵسەنگاندن، وە شیکردنەوەی هەموو داتا بەدەست هاتووەکان، کە زۆربەی جار ئەو زانیاریانە ناتەواون یانیش دژبەیەکن، وە ئامادەکردنیان بۆ بەگەڕخستنیان بۆ کاری هەواڵگریی.

پێنجەم: بڵاوکردنەوە: دوا قۆناغە، کە لە ڕووی زۆرییەوە پەیوەستە بە یەکەم قۆناغ، بڵاوکردنەوەی هەواڵگری تەواوکراوە بۆ بەکارهێنەرانی. وەرگرانی ئەم زانیاریە هەواڵگرییە تەواوکراوانە دواتر بڕیار دەدەن یان قۆڵی لێهەڵدەماڵن بە پشت بەستن بەو زانیاریانەی کە پێشکەشیان کراوە. ئەم قۆناغە دەبێت دەرفەتی تێبینیکردنی تیادا بێت لەلایەن وەرگرانیەوە، بۆ هەڵسەنگاندنی بەهای ئەو سەرەداوەی پێیدراوە. دەکرێت بڕیار، چالاکی، وە تێبینی ئەو کەسانە ببێتە هۆی پێویست بوون بە زانیاری زیاتر، بەم شێوەیەش دووبارە لە قۆناغی یەکەمەوە دەست بکرێت بە بەگەڕخستنەوەی بازنەی هەواڵگریی. (وەرگێڕ)

لە جۆری ئەنجامەکانی هەواڵگریی و ئەو ئەرکەی پێشکەشی دەکات دەکۆڵێتەوە.

## شیکردنەوەی تەکنیکی

ئێمە لێرەدا چەمکی "شیکردنەوەی تەکنیکی" بۆ ئاماژەدان بەو میتۆدە شیکاریانە بەکاردەهێنین کە داتای زۆر تایبەت دەگوازنەوە، واتە بۆ کەسانی ئاسایی ئەستەمە پەی پێ ببرێت مەگەر تایبەتمەند بێت لەم بوارەدا، بۆ داتاگەلێک کە شیکەرەوە هەواڵگرییەکانی تر دەتوانن بەکاری بهێنن. ئەو نموونانەی لێرەدا باسکراون بریتیین لە نمونەگەلی شیکردنەوەی کۆد[i] (کە نامەی هێمادار یان ژمارە دەگۆڕێت بۆ دەقی پەیامێک لە زمانێکی زانراودا)، شیکردنەوەی دوورمەودا[ii] (کە هێمای ڕادیۆیی دەگۆڕێت بۆ کۆمەڵێک لە زنجیرەی کات، تیایدا وەسفی ئاراستە و کاتی موشەکێک یان ئامێری تری تاقیکردنەوە دەکات)، وە لە کۆتاییشدا، شیکردنەوە و لێکدانەوەی وێنە (کە قەبارە و ناسنامەی ماددەیەک-مرۆڤ یان شتی تر- لە وێنەیەکدا دەکات).

*لێکدانەوەی کۆد* بریتییە لە چارەسەرکردن، یان "شکاندن"ی چەند کۆدێکی دوژمن، لە ئەنجامدا هاوکاری شیکەرەوەکان دەکات بۆ گۆڕینی پەیامێکی دەستبەسەرداگیراوی کۆدکراو بۆ ئەسڵی پەیامەکە، واتە بۆناو فۆرمێکی واتادار. لە زۆربەی هەرە زۆری کەیسەکاندا، ئەو پەیامە کۆدکراوە دەستبەسەرداگیراوانە پێک دێن لە وەرگرتن و بڕینی سیگناڵی ڕادیۆیی لەلایەن کەسێکەوە نەوەک ئەو وەرگرەی کە پەیامەکەی بۆ ئاراستەکراوە.

---

[i] cryptanalysis
[ii] telemetry

لە ڕووی چەمکەوە دوو وشە هەن کە دەبێت لێکیان جیابکەینەوە؛ کۆد (code) واتە وشەیەک یان بڕگەیەکی وشە (بۆ دەلالەت دان لە شتێک، بیرۆکەیەک، یان شوێنێک) کە بە کۆمەڵێک ژمارە یان پیتەوە شوێنیان گۆڕدراوە (کە دەکرێت یان ناکرێت وشەیەکی دروست پێک بهێنن) کە پێچەوانەی ئەو وشە یان بڕگەیە لەو نامەیەی کە کۆدکراوە. ئەگەر وشەیەک لەو نامەیەدا نەدۆزرایەوە، نێرەرەکە دەتوانێ یان پەیامەکە دوبارە وشەکانی جێگۆڕکێ پێبکات بۆ بەکارهێنانی وشە و بڕگەگەلێک کە تیایدا دەرناکەون یانیش بە هەڵە بینوسێت-واتە پیتێکی کەم بکاتەوە-بەبەکارهێنانی کۆمەڵێک کۆدی تایبەت بۆ نامەی کەسیی.

لەلایەکی ترەوە، چەمکەکەی تر بریتییە لە (cipher)، واتە شیفرە، ئەمە بەو واتایە دێت کە هەر پیتێکی پەیامە ئەسڵیەکە گۆڕدراوە، وە ئەو وشانەی لە جیاتی ئەمان بەکارهاتوون چەند فۆرمولەیەکی تایبەتن، بەم شێوەیە نامەیەکی پڕ لە شیفرە دروست دەکات.

بێگومان، ئاسانترین ڕێگا بۆ شکاندنی کۆدێک بریتییە لە دزینی کۆدەکە، یان بەدەستهێنانی کۆپییەکی پەرتووکی کۆدەکە بەبێ ئەوەی وا بکەین دوژمن پێی بزانێت. لەبەر ئەوەی بەدەستهێنانی و دروستکردنی پەرتووکێکی نوێی کۆد وە دابەشکردنی بەسەر هەموو ئەو کەسانەی پێویستیان پێیە و لەو بوارەدا کردەکان کارێکی ئاسان نییە، پێویستە شیفرەکە بۆ ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە، بۆ ئەوەی پەرە بە سوودمەندبوونی ئەو پەرتووکە گیراوەدا بدەن.

لەپێش وە لەکاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا، هەموو هێزە سەرەکیەکانی ئەوروپا نووسینگەی تایبەتییان هەبوو بۆ شکاندنی کۆدی پەیامە سەربازیی

و دبلۆماسییەکانی بیانیی. بۆ نموونە، لە سەرەتای جەنگی جیهانیی یەکەمدا، بەریتانیەکان توانیان چەند کۆپییەک(بەهۆی ژێرئاوکەوتنی کەشتیەک) لە پەرتووکی کۆدی کەشتیگەلی ئەڵمانی بەدەست بهێنن. ئەڵمانیەکان پێشوەختە حیسابی خۆیان کردبوو بۆ شیفرەدارکردنی پەیامی زیاتر، بەڵام بەریتانیەکان کۆدی ئەمانیشی شکاند.[i]

سەرەرای ئەمە، گرنگترین سەرکەوتنی شیکردنەوەی کۆدی بریتیی بوو لە کۆدی دبلۆماتکارە ئەڵمانەکان، نەوەک سەرکەشتیگەلیی. لە حەفدەی کانوونی دووەمی ساڵی١٩١٧، بەریتانیەکان کۆدی پەیامێکیان شکاند، کە لە مێژوودا بە "تەلەگرامی *زیمەرمان*" ناسراوە، کە تیایدا وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا باڵیۆزی ئەڵمانیای ناردە مەکسیک بۆ پێشنیارکردنی هاوپەیمانیەکی ئەڵمانی-مەکسیکی لەدژی ئەمریکا، لەحاڵەتێکدا ئەمریکیەکان کاردانەوەیان هەبوو بۆ دەستپێشخەرییەکانی کەشتیگەلی ئەڵمانیا (کە بۆ یەکی شوبات ئامادە کرابوو) بە جاڕدانی جەنگ بۆ سەر ئەڵمانیا. بڵاوکراوەکان لە ڕۆژنامە تەلەگرامەکان، کە [illegible] هۆی بەرچاوڕوونی مەکسیک بووە هۆی دروستکردنی گەردەلولێک کە وای لە بڕیارەکانی سەرۆک *ویدرۆ ولسن* کرد بچێتە جەنگەوە. بڵاوبوونەوەی تەلەگرامەکە بەشێوەیەکی والێهاتوو چارەسەرکرا کە ئەڵمانەکان گومانیان نەکرد کە کۆدەکەیان شکێنراوە.[ii]

---

[i] Patrick Beesly, *Room ٤٠: British Naval Intelligence ١٩١٤–١٨* (New York: Harcourt Brace Jovanovich, ١٩٨٢), ٣–٧, ٢٢–٣٣.

[ii] Barbara Tuchman, *The Zimmermann Telegram* (New York: Macmillan, ١٩٥٨, ١٩٦٦), for a full account of this incident.

بەپێچەوانەی ئەزموونی ئەورووپی، هونەری شکاندنی کۆدی ئەمریکی لە کاتی ڕوودانی جەنگی جیهانیی یەکەمدا لە سەرەتای پێشکەوتنیدا بوو. چیرۆکی هونەری کۆدشکاندنی ئەمریکی لەماوەی جەنگەکەدا و لە چەند دەیەیەکی دواتردا ئەوە ڕوون دەکاتەوە چۆن هێشتا بۆ کەسێک کردەیی بوو، کە بەتەنیا، یان لەگەڵ کۆمەڵێک کاری دەکرد، بۆ فێربوونی بنچینە سەرەتاییەکانی ئەو هونەرە و شکاندنی کۆدی چەندین پەیامی هەستیار. لەڕاستیدا، *هێربێرت یاردلی* بۆمان دەگێڕێتەوە کە چۆن ناوبراو توانی کۆدی پەیامێکی سەرۆک *وەدرۆ وڵسن* شیبکاتەوە کە لەلایەن کۆلۆنێل *ئێدوارد هاوس* (نوێنەری تایبەتی سەرۆک)ەوە بۆی نێردرابوو، دواتر بۆ ئەرکێکی دبلۆماسی لە ئەڵمانیا.[i] ئەم بەسەرهاتەی سەرکردایەتی *یاردلی* ئەمریکا لە یەکەی شکاندنی کۆد لەوکاتەی کە ئەمریکا چووە جەنگەکەوە، ئەوەمان پێدەڵێت کە تا چ ئەندازەیەک شکاندنی کۆد هونەر بووە، بەر لەوەی زانست بێت وە ئەم کارە چەندە بەندە بە بیرکردنەوە و ڕێکخستنی ئەو کەسانەوە کە بەتەنیا کار دەکەن.

لە زانستی شیفرە شکاندندا، هەروەک لە چەندین بواری تری چالاکی سەربازیی و هەواڵگرییدا، جەنگی جیهانی یەکەم قۆناغێکی هەستیاری ئەم زانستە بوو. بە گوێرەی وتەی یەکێک لە دیرۆکنانانی ئەم بابەتە،

> جەنگی جیهانیی یەکەم خاڵی وەرچەرخانە لە مێژوویی زانستی شکاندنی شیفرەدا. پێشتر، ئەوەندە بایەخی پێنەدەدرا وە زانستێکی بچووک بوو؛ بەڵام دواتر، بەشێوەیەکی بەرچاو پەرەی سەند. پێشتر،

[i] Herbert O. Yardley, *The American Black Chamber* (Indianapolis: Bobbs-Merrill, ١٩٣١; reprint, New York: Ballantine, ١٩٨١), ٤.

> زانستێک بوو لە سەرەتای سەرهەڵدانی؛ دواتر، بە تەواوی پێ گەیی.
> هۆکاری ڕاستەوخۆی ئەم پەرەسەندنە بریتیی بوو لە زیادبوونی بێ شوماری پەیوەندییە ڕادیۆییەکان.[i]

زیادبوونی شەپۆلی ڕادیۆیی بە واتای ئەوە بوو کە دەتوانرا کۆدی زیاتری دوژمنان بشکێنرێت، لە هەمانکاتدا، زیادبوونی ڕێژەی شەپۆلی ڕادیۆیی بەو واتایە دەهات کە، شیفرەی پەیامی نهێنی بۆ شارەزایان زیاتر موعەڕەز بوون بۆ شکاندن، چونکە تا ڕێژەی ئەو شەپۆلانە بەرزتر بوایە، ئەوەندە ئاسانتر دەیانتوانی لە مەبەستی ئەو کۆدانە تێبگەن و چارەسەرکردنیان ئەوەندە ئاسانتر دەبوو.

هەروەها، زیادبوونی ڕێژەی شەپۆلی ڕادیۆیی بەو واتایەش دەهات کە سیستەمە دەستییەکان بۆ کۆدکردن و شکاندنی کۆدی پەیامەکان زیاتر زەحمەتیان دەکەوتە سەر. ئەمە، بە ویستی هەبوونی سیستەمێکی سەلامەتەوە، بووە هۆی دەرچوون لەم قۆناغە و دەربازبوون بۆ قۆناغی دووەم، کە تیایدا ئامێری میکانیکی یان کارەبایی، وەک هاگلین (*Hagelin*)ی ئەمریکی، ئێنیگما (*Enigma*)ی ئەڵمانیی،[ii] بە

---

[i] Kahn, *The Codebreakers,* ٣٤٨.

[ii] **ئامێری ئێنیگما** (Enigma Machines)لە زنجیرەی ئامێری ڕۆتۆری کارەبایی میکانیکی تەشفیرە، بەکارهێنراوە لە سەرەتا بۆ ناوەندی سەدەی بیستەم، بۆ پاراستنی پەیوەندی سەربازیی و بازرگانیی و دیبلۆماسیی. لەلایەن ئەندازیاری ئەڵمانی ئارثەر شیبیەس (Arthur Scherbius)لە کۆتای جەنگی جیهانی یەکەمدا دروستکراوە. مۆدێلەکانی سەرەتای ئەم ئامێرە بۆ مەبەستی بازرگانی بەکارهێنراوە لە سەرەتاکانی سالآنی ١٩٢٠ و هەڵبژێردرابوو لەلایەن سوپا و خزمەتگوزاری حکومی

---

چەند ولاتێکەوە، بەشێوەیەکی دیار ئەڵمانیای نازی لە پێش و ماوەی جەنگی جیهانی دووەم. چەند مۆدێلێکی جیاواز لە ئێنیگما بەرهەمهێنرابوو، بەڵام ناسراوترینیان مۆدێلی سوپای ئەڵمانی بوو. ئێنیگما بەکاردێت بۆ نوسینی نامە یان پەیامێک پاشان ئەو نامەیە تێکەڵ دەکرێت بەبەکارهێنانی سێ ویل یان زۆرتر کە پیتی جیاوازی ئەلفابێت پیشان دەدات. وە وەرگری نامەکە پێویستە ڕێکخستنی ئەولوی ئەو ڕۆتۆرانە بزانێت بۆئەوەی تێکستە کۆدکراوەکان چاکبکاتەوە. لەماوەی چەند ساڵێکدا ئەم ئامێرە زۆر قورسکرا کە پسپۆرە ئەڵمانیەکان پلاک و سرکێتی کارەبابیان بۆی زیاد کرد. ئەم ئامێرە لەناو سندوقێکدا ڕێکخراوە کە کیبۆردێکی نووسین و کیبۆردێکی گلۆپی هەیە، کاتێک تۆ هەر پیتێک دادەگری لەسەر کیبۆردەکە ئەوە گلۆپی ئەو پیتە ئیش دەکات کە لەجیاتی دانراوە.

ئەڵمانیەکان بڕوایان وابوو کە ئێنیگما ناشکێندرێت، بۆیە بەکاریان دەهێنا لە هەموو شێوازەکانی پەیوەندیکردنیان لە مەیدانی جەنگ و ئاسمان و دەریاش بۆکارە نهێنیەکانیان. بەریتانیەکان باسیاندەکرد کە هەر هەواڵگریەک دەتوانێت سودێکی زۆر لە ئێنیگما وەرگرێت و دەیانوت کە زۆر نهێنیە.

پەیامە شفرەکراوەکانی (نهێنیکراوەکانی) سوپای ئەڵمانی بۆیەکەمجار ئاشکراکران لەلایەن نوسینگەی شفرەکردنی پۆلەندیەوە لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٢ ئەم سەرکەوتنە ئەنجامی هەوڵدانی سێ شفرەکاری پۆلەندی Marian Rejewski، Jerzy Rozycki، Henryk Zygalski بوو کە ئیشیان دەکرد بۆ دەزگای هەواڵگری پۆلەندی. ریفیسکی (Rejewski)هەستا بەپێچەوانەکردنەوەی یاساکانی ئامێرەکە، بەبەکارهێنانی بیردۆزەکانی بیرکاری و کەرەستەکانی بۆ دابینکرا لەلایەن دەزگای هەواڵگری فەرەنسیەوە. لەوەبەدوا سێ بیرکاریزانەکە ئامێرێکی میکانیکیان داڕشت بۆ شکاندنی (ئاشکراکردنی) شفرەکاری ئێنیگما. لە ١٩٣٨ بەدواوە بەبەردەوامی ئامێری ئێنیگما زیاتر ئاڵۆز دەبوو، ئاشکراکردنی زیاتر قورس دەبوو

ئامێری پێرپل (*Purple*)ی یابانیی (کە پێی دەوترا ئامێری نووسینی ئەلفابێ ۹۷)، بەکاردەهاتن بۆ شیفرەکردنی دەقی نووسین.
ئەم جۆرە ئامێرانە لە توانایاندابوو دەقی زۆر ئاڵۆزتر کۆد بکەن بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئامێرانەی پێشووتر بە دەست ئەم کارەیان دەکرد. هەر بۆ ئەم مەبەستە تەکنیکی شیکاری کۆد و پرۆسەی زیاتر ئاڵۆزی دەویست بۆ چارەسەرکردن و ئاشکراکردنی ئەم پەیامە هەواڵگرییانە. شکاندنی ئەم ئامێرانە پێویستی بە ئامێری پێشکەوتن و کۆمپیوتەری سەرەتایی هەبوو،

---

و کەرەستە و کەسی زیاتری دەویست زیاتر لەوەی کە پۆلەندیەکان بەرهەمیان ئەهێنا.
لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا بیرکاریزانی بەریتانی ئالان تیورینگ (*Alan Turing*) هەوڵەدات بۆ شکاندنی (ئاشکراکردنی کۆدی ئینیگما) کە بەهۆیەوە سوپای ئەڵمانی نامەکانیان پێ ئاڵوگۆڕ دەکرد بۆ ئەم مەبەستەش هەڵدەستێ بەدروست کردنی ئامێرێک، کە دوای چەند ساڵێک ئەم ئامێرە زیاتر پەرەی پێ ئەدرێت و دەبێت بەیەکەم کۆمپیوتەر لە مێژوودا.

سەرەڕای ئەمەش دەبوایە کە لێهاتوویەکی بێ ئەندازەی دەویست لەکاری ئامار و هاوکێشەی تیۆری بیرکاریی ئاڵۆز.[iii]

---

[i] ئەم جۆرە زانستە لە سەرەتای ساڵانی سییەکاندا لەلایەن بیرکاریوان و کۆدشکێنەرێکی پۆڵەندیەوە پەرەی پێدرا کە بووە هۆکاری سەرەکی بۆ شەرەکەوتنی پێشوەختەی پۆڵەندیەکان وە دواتر سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە بڕی ئامێری ئێنیگمای ئەڵمانیی. بۆ زیاتر، بڕوانە:
Jozef Garlinski, *The Enigma War* (New York: Scribner, ١٩٧٩), ٢٥،١٩٦-٢٠٤.

[ii] **بریکاری ئاسایشی نەتەوەیی** (NSA) لە ئەمەریکا بە گەورەترین خاوەنکار بۆ بیرکاریزانان لە جیهاندا دادەنرێت واتە زۆرترین ژمارەی بیرکاریزان کە لە دەزگایەکی حکومی یان ئەهلی کار بکەن بریتیە لە NSA. بیرکاری کاری سەرەکیە لە بریکاری ئاسایشی نەتەوەیی، و بیرکاریزانان ئیش لەسەر نیشانە هەواڵگریەکان و ئاسایشی زانیاری دەکەن کە دیارە مەبەست لەمە تەشفیر و بەدەستهێنانی زانیاری نهێنی وەلاتانی ترە لە کاتی ئاشتی و شەردا. هەروەها ڕەگەزنامەی ئەمریکی مەرجە بۆ ئیش کرد لەم دەزگایە (هەڵبەت ئاسانترین مەرجیشە). دەوترێت کە *NSA* نزیکەی پێنج هێندەی *CIA* گەورەترە ڕێکخراوێکی هەواڵگریە بەرپرسە لە چاودێریکردنی جیهان و زانیاری هەواڵگریەکان و پاراستنی ئاسایشی ئەمریکا.

لێرەدا پرسیارێک سەرهەڵدەدات کە ئەویش: بۆچی بریکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا ئەوەندە گرنگی بە بیرکاری دەدات؟

زۆرێک لە کردارەکان ئاسانن بۆ جێبەجێ کردن، بەڵام زۆرینەیان مەحاڵن بۆ پێچەوانە کردنەوە. بۆ نمونە، تێکەڵکردنی چەند قوتویەکی زەرد و سور، سوتاندنی پارچە کاغەزێک، یان شکاندنی پەرداخێکی شوشە، ناتوانین ئەم کردارانە پێچەوانە بکەینەوە.( پێچەوانە کردنەوە لێرە مەبەستمان کاغەزە سوتاوەکە بکەینەوە بە پارچە کاغەزەکەی پێش سوتان، یان پەرداخە شکاوەکە بکەینەوە بە پەرداخەکەی

پێش شکان). بەهەمان شێوەش زۆرێک لە کردارە بیرکاریەکان ئاسانن بۆ جێبەجێ کردن، بەڵام زۆر قورسن بۆ پێچەوانە کردنەوە. کریپتۆگرافی مۆدێرن (تەشفیرکردنی زانیاری) لەسەر ئەم ڕاستیەی سەرەوە بنیاتنراوە.

کردارەکانی یەک — ڕێگا

ئاسانترین نمونە بۆ هەژماری ناڕێکی بریتیە لە لێکدانی ژمارە خۆبەشەکان. لە بیرت بێ ژمارەی خۆبەش بە ژمارەیەک دەوترێت کە تەنها بەسەر خۆی و یەکدا دابەش دەبێت، وەک... ٢،٣،٥،٧،١١،١٣: تێبینی بکە ژمارە خۆبەشەکان ناتوانرێت بکرێن بە لێکدانی دوو ژمارەی بچوکتر. لێکدان کردنی نێوان ژمارە خۆبەشەکان کردارێکی ئاسانە، تەنها لێکدانی یەکتریان دەکەیت. بەڵام دۆزینەوەی دوو کۆلکەی خۆبەش بۆ ژمارەیەکی گەورە قورسە. بۆ نمونە، ئەو دوو ژمارە خۆبەشە کامانەن کە لێکدانیان دەکاتە ١٠٠٣؟ وەڵامەکەی پێویستی بە ماندوبونێکی زۆر زیاترە وەک لە دۆزینەوەی ژمارەکە خۆی. ئەو کردارە بیرکاریانەی کە ئاسانن بۆ هەژمار کردن، بەڵام قورسن بۆ پێچەوانە کردنەوە پێیان دەوترێت *کردارەکانی یەک — ڕێگا*.

بۆ تەشفیرکردن، دوو ژمارەی خۆبەشی زۆر گەورە وەردەگرین، کە هەریەکەیان سەدان ڕەنوسی هەبێت، و لێکدانی یەکتریان دەکەین. گەر بێتو ئەنجامەکەی درابێت، ئەو کۆلکانە ناتوانرێت بە ئاسانی بدۆزرێنەوە. هەرچەندە، ئەگەر یەکێک لەو کۆلکانە زانراوبێت، ئەوا کۆلکەکەی تریان بە دابەشکردنێکی سادە دەدۆزرێتەوە. هەبونی زانیاری یەکێک لە کۆلکەکان وەک دەرگایەکی نهێنی وایە، ڕێگە بەهەمو کەسێک دەدات کە بیزانێت، بۆ دۆزینەوە دەرگاکەی تر. کرداری یەک — ڕێگای نهێنی ئەتوانرێت پێچەوانە بکرێتەوە لەلایەن دیزاینەرێکەوە، کە کلیلەکەی هەبێت، و هیچ کەسێکی تر.

سیستەمی شفرەکردنی *RSA*

لە ساڵی ١٩٧٨ سێ قوتابی لە پەیمانگای ماسەچووستس بۆ تەکنەلۆجیا (*MIT*)، *ڕۆن ریڤیست*، *ئادی شەمیەر* و *لێن ئادەلمەن* سیستەمێکی کریپتۆگرافیان داهێنا،

---

لەسەر ئەساسی قورسێتی دۆزینەوەی فاکتەری ژمارە گەورەکان. و ئەلگۆریزمەکەیان ناونا *RSA* کە دەکاتە پیتی یەکەمی ناوی هەرسێکیانە.
ئەلگۆریزمی *RSA* یەکەمین سیستەمی کلیلی گشتی بوو. هەر بەکارهێنەرێک دوو کلیلی ژمارەیی پەیوەندیدار بەیەکتر دروست دەکات. یەکێکیان لە چوارچێوەی کلیلێکی ژمارەیی وەک دەلیلێک. ئەوەی تریان تایبەتە و تەنها خاوەنەکەی دەیزانێت. کەسی نێرەر کلیلە گشتیەکەی وەرگر بەکارئەهێنێت بۆ شفرەکردنی پەیامەکەی، و پاشان ئەینێرێت. دواتر کەسی وەرگر بە بەکارهێنانی کلیلە تایبەتەکە کە تەنها ئەو ئەیزانێت پەیامەکە ئاشکرا ئەکات.
درێژەی تەکنیکی سیستەمی *RSA* لەهەمان کاتدا ئاسان نیە قوتابی بەشەکانی بیرکاری زیاتر لە قۆناغی چوارەم دەیخوێنین، مەرجە ئەو کەسەی لەم جۆرە تەشفیرانە دەخوێنێت جۆرێک لە پاشخانی هەبێت لە تیۆری ژمارەکان (*Number Theory*)، بەشێوەیەکی ڕێژەیی ڕوونە. کە ئیعتیماد دەکاتە سەر ئەنجامێک کە پێی دەوترێت تیۆرمە بچکۆلەکەی فێرمات، کە لەلایەن بیرکاریزانی فەرەنسی پیەر *فێرمات* لە ساڵی ١٦٤٠ دانراوە، و لە ساڵی ١٧٣٦ لەلایەن بیرکاریزانی سویسرایی *لیۆنارد ئۆیلەر* سەلمێنراوە. ئەنجامێکی گشتیتری تیۆرمەکەی فێرمات-ئۆیلەر بریتیە لە بەردی بناغەی سیستەمی ئاسایشی کۆمپیوتەری نوێ.
کریپتۆگرافی مۆدێرن ئیعتیماد دەکاتە سەر ئەو گریمانەیەی کە هیچ کەسێک ناتوانێت کۆلکەی ژمارە خۆبەشەکان بە ئاسانی بدۆزێتەوە. بەڵام پێویستە بپرسین ئایا ئەمە گریمانەیەکی سەلامەتە؟ زەحمەتی ئەم پرسە هەتا ئێستا بەوردی لەلایەن بیرکاریزانانەوە نەسەلمێنراوە، بەڵام سەدان ساڵە هەوڵەکان شکست ئەخۆن لە دۆزینەوە ئەلگۆریزمێکی کارامە. کریپتۆگرافی و تیۆری کۆد دوو مەیدانی چالاکن بۆ توێژینەوە لەم بابەتە، لەگەڵ لێکۆڵینەوە قوڵەکان لە بیرکاری وەستاو، جەبر، ئەندازەی جەبری، و تیۆری ژمارەکان.

بۆ ئەم مەبەستە، لەکاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا، وزەیەکی زۆر تەرخانکرا (بە نووسین و باسکردنی ئەم بابەتە و نووسینی چەندن پەرتووک لەم بوارەدا) بۆ دۆزینەوەی چارەسەری ئەو ئامێرە کۆدشکێنەرانەی کە پێویست بوون بۆ شکاندنی کۆدی "ئێنیگما" وە "پێرپل." ئێمە لەم سەردەمەدا لە قۆناغی سێیەمداین، کە تایبەتمەندیەکەی بریتییە لە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بۆ هەردوو ئەرکی کۆدکردن و شکاندنی کۆدی پەیامەکان وەهەروەها بۆ هاوکاریکردنی هەوڵەکانی شیکاریی کۆد-یش بایەخێکی بێ ئەندازەی بۆ ئەم بوارە خستۆتە ڕۆژەڤی هەگبەی ئەم بابەتە. بەهۆی چەند هۆکارێکی ئاشکرا، ئەم بابەتە زۆر هەستیارە، وە زانیاریەکی زۆر بۆ ڕای گشتی نەخراوەتەڕوو، وە ئێمەش ناتوانین هەروا بە ئاسانی بچینە بنج و بناوانی بابەتەکە. سەرەڵدانی "هونەری شکاندنی کۆد (*cryptography*)" هەندێ زانیاری خستۆتە بەر دیدی خوێنەران و ڕای گشتیش بێ بەش نییە لە زانینی چۆنیەتی کارکردنی ئەم ئامێرانە. سەرەڕای ئەمەش، بە هیچ شێوەیەک ناکرێت لە سەرچاوەی نهێنیەوە بڕیاری ئەوە بدەین کە چۆن دەرکەوتنی

---

ڕێگەیەکی هاوشێوەی *RSA* چەند ساڵێک زووتر دۆزرابونەوە لە بنکەی پەیوەندیەکانی حکومەتی بەریتانیا لە *چلتنهام*، بەڵام ئاشکرا نەکرابوو هەتا ١٩٩٧. بە ڕوانین لەو باگراوندە، لەوانەیە سەرسوڕمان ببی کە چی دۆزراوەتەوە لە بریکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا؟ ئەگەر ڕێگایەکی خێرا بۆ شکاندنی ژمارە خۆبەشە گەورەکان دۆزرابێتەوە، کە لەوانەیە گوێمان لەوەنەبێت سەبارەت بەوە بۆ هەندێ کات، بەڵام توشبون بە پێشکەوتنی لەو شێوە کاریگەر دەبێت.

ئەم زانستە بۆ ڕای گشتی بەراورد بکرێت لەگەڵ ئەو تەکنیکانەی کە دەزگا هەواڵگرییەکان بەکاری دەهێنن.
لەگەڵ ئەوەشدا، دەکرێت شتگەلێکی کەم بوترێت دەربارەی نرخی ئێستا و مەودای پێشکەوتنی ئەو زانستە لە وڵاتە جیاجیاکاندا. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییەی کە ئەمریکا مەڵبەندی کۆمپیوتەرە، دەکرێت بڵێین کە ئەو وڵاتە لەم بوارەدا پێشکەوتووترین وڵاتە لە شکاندن و کۆدکردنی پەیامدا؛ دەکرێت بڵێین لە هەندێ حاڵەتدا، ڕەنگە ئامێرەکانی ڕووسیا لەم بوارەدا بتوانن ڕکابەری بکەن، ئەمەش بەهۆی پێشکەوتوویی زانستی تیۆری بیرکاریدا.
لەهەمانکاتدا، پێدەچێت کە پێشڤەچوونەکان لەهێزی کۆمپیوتەردا (لەڕووی خێرایی لە مامەڵەکردن لەگەڵ زانستی ژمارەناسییدا) زیاتر مەیلی بەرگریی هەیە. بە واتایەکی تر، هەرچەندە زیادکردنێک لە هێزی کۆمپیوتەردا دەبێتە هۆی بەتوانایی هەردوو دانەری کۆدی بۆ بەکارهێنانی کۆدی زیاتر ئاڵۆز و شیکەرەوەکانی کۆد بۆ شکاندنی کۆدی ئاڵۆزتر، بەڵام ئەو لایەنەی پەیامێک کۆد دەکات زیاتر سوودمەند دەبێت لەم تەکنەلۆژیایە: زیادبوونی هێزی کۆمپیوتەر ڕێگاخۆشکەرە بۆ پەیامی ئاڵۆز بۆنەوەی بە جۆرە کۆدێک بکرێت کە هەمان هێزی کۆمپیوتەر نەتوانێت ئاشکرای بکات.
ئەگەر ئەمە بەو شێوەیەیە، دەرفەتی درێژخایەن بۆ شیکردنەوەی کۆدەکان، بە لایەنی کەم چونکە هەوڵدەدات کۆدی هێزە گەورەکان بشکێنێت بە بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو، لە ڕووی پرەنسیپەوە زۆر باش نین. بێگومان، لە ڕووی پراکتیکەوە، بەهۆی چەند هەڵەیەک لە بنیاتنانەکەی، کۆدێک دەکرێت سوودی تەواو لەو تەکنەلۆجیە

کۆمپیوتەرییە بەردەستە نەبینێت و بەم شێوەیەش لاوازتر بێت لەوەی کە دەبێت ببێت.[i] لە کۆتاییدا، سیخوڕەکان دەکرێت پەرتووکی کۆد یان دەقی کۆدکراو دوژمنێک بەدەست بهێنن و پێشکەشی دەزگایەک بکەن، بەم شێوەیەش ڕێگا خۆشکەر بن کە دەزگایەکی هەواڵگریی چەند پەیامێکی کۆدکراو ئاشکرا بکات کە لەلایەن سیاسیەمی کۆدکردنەوە کۆدکراون کە شیکردنەوەی کۆد نەیتوانیوە بیان شکێنێت.[ii]

***لاوازی لێکدانەوەی کۆد***[iii] لێکدانەوەی کۆد یەکێکە لە میتۆدە لاوازەکانی هەواڵگریی چونکە وڵاتێک دەتوانێت سیستەمی کۆدەکەی بگۆڕێت هەرکە درکی بەوەکرد کە دوژمنەکەی دەتوانێت پەیامە شیفرەکراوەکانی بخوێنێتەوە. بەم شێوەیە، جێگای سەرسوڕمان نیە کە سەرکەوتنەکانی شیکردنەوەی کۆدی هەردوو وڵاتی بەریتانیا و ئەمریکا لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا بە یەکێک لە نهێنیە هەرگرنگەکانی ئەو جەنگە دادەنرا، بەشێوەیەک کە چەند کەسێکی دانسقە ئاگاداری چۆنیەتی کۆدکردن و شکاندنی کۆدی ئەو پەیامانە بوون کە بۆ هاوپەشکرەکانیان دەیانناردن. سەرکەوتنی بەریتانیەکان لە شکست پێهێنانی ئامێری "ئێنیگما" بۆ ماوەی نزیکەی سی ساڵ بە نهێنی هێڵرایەوە، سەرەڕای ئەوەی ژمارەیەکی زۆری کەسیش دەستیان لەو ئۆپەراسیۆنەدا هەبوو.

---

[i] Gordon Welchman, *The Hut Six Story: Breaking the Enigma Codes* (New York: McGraw- Hill, ١٩٨٢), ٥٩_٧٣

[ii] Christopher Andrew and Oleg Gordievsky, *KGB: The Inside Story of Its Foreign Operations from Lenin to Gorbachev* (New York: HarperCollins, ١٩٩٠), ٥٢٤_٣١.

[iii] Cryptanalysis

ئەزموونی ئەمریکیەکان زۆر جیاواز بوو لە هی ئەمان. گۆڤاری "شیکاگۆ تریبیون" لە حەوتی حوزەیرانی ١٩٤٢دا وتارێکی بڵاوکردنەوە لەسەر سەرکەوتنی ئەمریکا لە جەنگی میدوەی (*Midway*)، ئەمە دەکرێت بە یەکێک لە خەراپترین ئاشکرابوونی ئاسایشی جەنگ دابنرێت. ئەم گۆڤارە هەواڵەکەی لەژێر ناونیشانی "هێزە دەریاییەکانی ئەمریکا توانیوایە کۆدی پەیامی یابانیەکان بشکێنن بۆ هێرشکردنە سەر دەریا." ئەو پەیامە نەک تەنیا ناوی کەشتیەکانی یابانی بڵاوکردبووەوە بەڵکو ئەو بەڵەمە بچووکە جەنگیانەشی باس کردبوو کە بڕیاربوو پشتیوانی داگیرکارییە چاوەڕوانکراوەکە بکەن. هەروەها، هەمان گۆڤار ئەوەشی بڵاوکردەوە کە کاتێک کەشتیگەلی یابانیەکان بەرەوە میدوەی جووڵان، "هەموو هێزە ئەمریکیە ئامادەباشەکانی دوور لە دەریاکە ئاگادارکرانەوە."[1]

شارەزایەکی هەواڵگری یابانی دەیتوانی بەم شێوەیە لە پەیامەی وتارەکە بگات کە ئەمریکا توانیویەتی شیفرەی پەیامەکانی کەشتیگەلی یابانی بە تەواوی بخوێنێتەوە. ئەم مەسەلەیە بردرایە دادگای باڵای شیکاگۆ؛ بەڵام جێگای سەرسوڕمان بوو کە هیچ کەسێک تاوانبار نەکرا. وادیارە کە بەرپرسە باڵای ئەمریکا لە دژی ئەو جێبەجێکردنی ئەو یاسایە بوون لەسەر ئەوە بنەمایەی کە دادگاییکردنێک تەنیا سەرنج دەخاتە سەر وتارێک وە دەکرێت پێویست بەوەش بکات حکومەتی ئەو وڵاتە بەشێوەیەکی فەرمی ئەو هەواڵە پشتڕاستبکاتەوە کە ئەمریکا خەریکی خوێندنەوەی پەیامە کەشتیگەلیەکانی یابان بووە لەکاتی جەنگەکەدا.(لە سێزدەی ئابی

[1] Kahn, *The Codebreakers*, ٦٠٣; Ronald Lewin, *The American Magic: Codes, Ciphers and the Defeat of Japan* (New York: Farrar Straus Giroux, ١٩٨٢), ١١٣.

١٩٤٢دا، یەکێک لە کۆنگرێسمانەکان ئەم بابەتەی گۆڤارەکەی هێنایە مەجلیس وە پێی وابوو کە "ئەمە خەراپ بەکارهێنانی ئازادی رۆژنامەگەرییە").

دەربارەی ئەوەی ئایا یابانیەکان سوودیان لەم درزەکردنەی هەواڵی دادگاکە وەرگرت یان نا، ئەمە هێشتا یەکلایی نەبۆتەوە. دروستە کە لە چواردەی ئابی ١٩٤٢دا، هێزە دەریاییەکانی یابانی توانیان شێوازێکی نوێی کۆدکردن بەکاربهێنن (بە JN-٢٥d لەلایەن شیکەرەوە ئەمریکیەکان وەرگێردراوە). دەرکەوتنی شێوازی نوێی کۆد هەر زوو دوای شێوازی پێشوو (JN-٢٥c) ناسێنرا (لە یەکی حوزەیران) بەڵام جێگای گومان بوو.[i] سەرەڕای ئەمە، شێوازی نوێی کۆدەکە دوای ماوەیەکی کەم لەلایەن ئەمریکیەکانەوە ئاشکراکراو و دووبارە توانیان بە شێوەیەکی ئاسانتر بچنەناو سیستەمی نوێی پەیامە کۆدکراوەکانی یابان. سەرەڕای ئەو ڕاستیەی باسکرا، نزیکەی چوار مانگی پێچوو تا ئەمریکیەکان وەک کۆدی JN-٢٥d شارەزایی پەیدا بکەن لەگەڵ شێوازەکانی پێشوو.

با بەریتانیەکان وەک نموونەیەکی ڕوونتر وەربگرین کە لاوازی سیستەمی شیکردنەوەی کۆد لە ساڵی ١٩٢٧ دەردەخات. لەکاتی ساڵانی پێشوودا نووسینگەی شیکاری کۆدی بەریتانیی توانیبووی چەند پەیامێک بشکێنێت لەنێوان بارەگاکانی شیوعی نێودەوڵەتی و حکومەتی سۆڤیەت لە مۆسکۆ، لەلایەک، وە نوێنەرە جیاجیاکانی سۆڤیەت لە لەندەن- باڵیۆزخانەی سۆڤیەت وە وەفدێکی بازرگانی- لەلایەکی ترەوە. بەم پێیە،

---

[i] Lewin, *The American Magic,* ١١٦–١٧. See also Edwin T. Layton, *"And I Was There": Pearl Harbor and Midway Breaking the Secrets* (New York: Morrow, ١٩٨٥), ٤٥٣–٥٦

حکومەتی بەریتانیا توانی شوێن پێی چالاکیەکانی دبلۆماتکارەکانی سۆڤیەت و نوێنەرە بازرگانیەکان هەڵبگریت، چالاکیگەلێک کە خۆی لە سیخوڕیی و تێوەگلان لە کاروباری یەکێتی بازرگانی بەریتانیدا دەبینیەوە.
لەساڵی ١٩٢٧دا، کاتێک پەیوەندییەکانی ئەو وڵاتە لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت پچڕا وە نوێنەرایەتیان کشایەوە، بەریتانیەکان ئەم باسەیان ورووژاند بۆ رای گشتی. کاتێک لە پەرلەمانی ئەو وڵاتە فشار خرایە سەریان بۆ بەرگرییکردن لە کردەوەکانیان، وەزیرە بەریتانیەکان بە ئاشکرای دانیان بە تواناکانیان دانا بۆ خوێندنەوەی پەیامە شیفرەدارکراوەکانی سۆڤیەت.
ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە سۆڤیەت بە سیستەمی شیفرەکردنەکەیدا بچێتەوە وە هەڵسێت بە دانانی سیستەمێکی نوێی شیفرەکردن، کە بەریتانیەکان نەیانتوانی بیشکێنن.[i]
لە کەیسێکی هاوشێوەدا، کە تیایدا حکومەتێکی بەدیموکراتی هەڵبژێرراو زانیاری هەستیاری تواناکانی شکاندنی کۆدی ئاشکرا کرد بۆ ئەوەی پشتیوانی بەدەست بهێنێت بۆ سیاسەتەکەی وە لە ئەنجامدا چیتر نەیتوانی دەستی بە پەیامی شیفرەدار بگات، لە ساڵی ١٩٨٦دا لە ئەمریکادا ڕوویدا. بۆ پۆزش هێنانەوە بۆ بڕیاری کۆتایی بۆردومانکردنی کۆگا حکومیەکان لە تەرابلوسی لیبیا،

سەرۆک *ڕۆناڵد ڕەیگان* (بەپێی ڕاپۆرتەکانی واشنتۆن پۆست) وە ڕاوێژکارە پلەباڵاکانی هەڵسان بە ئاشکراکردنی زانیاری هەواڵگری

---

[i] Christopher Andrew, *Her Majesty's Secret Service: The Making of the British Intelligence Community* (New York: Viking, ١٩٨٦), ٣٣١–٣٢.

> زۆر هەستیار... بۆ نیشاندانی ئەوەی کە ئەمریکا بەڵگەی کەمەرشکێنی هەیە کە لیبیا... بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆی بەرپرسیار بووە لە بۆردومانکردنی یانەیەکی شەوانەی بەرلینی ڕۆژئاوا...
> ئەم زانیارییە هەستیارەی کە لەلایەن سەرۆکەوە ئاشکرا کرا [،]... سەرچاوەکان ئاماژەیان بەوەدا، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەمریکا توانای هەیە پەیامە دبلۆماسییە هەستیارەکانی لیبیا ببڕێت و دواتریش شیفرەکانیان ئاشکرا بکات.[i]

ئەنجامە چاوەڕوانکراوەکە لەڕاستیدا دەرکەوت: بەرپرسانی ئیدارەکە وتیان کە، "ئاشکراکردنی ئەو کێبلە دبلۆماسیەی لیبیا بۆ ڕای گشتی وای لە شیکەرەوە هەواڵگرییەکانی ئەمریکا کرد کە سەرچاوەیەکی بەهاداری زانیاری لەدەست بدەن کە ڕەنگە چەندین هەفتە یان مانگی ویستبوایە بۆ ئەوەی شوێنی بگرنەوە."[ii]

ئەم نموونانە خاڵێکی گشتی دەربارەی هەواڵگریی ڕوون دەکەنەوە، خاڵێک کە لەسەر تەکنیکەکانی کۆکردنەوە زانیاری و شیکردنەوە جێبەجێ دەبێت: تا باشتر زانیارییەکان بەردەست بن، زیاتر ڕێگریی دەکات لە بەکارهێنانی وە ڕەنگە ببێتە هۆی ئاگادارکردنەوەی دوژمنەکەش کە توانای هەواڵگریی ئەو چییە و بایی چەندە. ئەم گرفتە لە وڵاتە دیموکراسیەکاندا زیاتر بوونی هەیە چونکە دەزگا هەواڵگرییەکان ناچاردەکرێن هەڵسن بە ڕازیکردنی ڕای گشتی بەشێوەیەک کە بیسەلمێنێت سیاسەتەکانی

---

[i] Bob Woodward and Patrick E. Tyler, "Libyan Cables Intercepted and Decoded," *Washington Post*, April ١٥, ١٩٨٦, A١.
[ii] Stephen Engleberg, "U.S. Aides Worried over Libya Cables," *New York Times*, April ١٧, ١٩٨٦, A٢٤.

مەعقولن. بەلام هەمان گرفتێک بۆ هەر حکومەتێک دێتە ڕێژەف، لەژێر هەر باروبۆخێکدا، هەرکاتێک زانیاری هەواڵگریی تایبەتی بەدەست هێنا کە لەسەر بنەمای ئەو زانیاریانە دەیەوێت کاری هەواڵگریی خۆی بکات. ئەم جۆرە گرفتانە زیاتر لە کاتی جەنگدا سەرهەڵدەدەن، کاتێک بە تەواوی پشت بە سەرچاوەکانی هەواڵگریی دەبەسترێت بۆ ئەنجامدانی پلانی سەربازیی. بۆ نموونە، لەکاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا بەریتانیەکان، بەهۆی بڕین و شکاندنی پەیوەندی گەیاندن، زانیان کەی کەشتیەکانی ئەڵمان کەلوپەل دەهێنن بەناو دەریای ناوەڕاستدا بۆ هێزەکانی جەنەڕاڵ *ئێروین ڕۆمێل* لە ئەفریقیای باکوور. بەمشێوەیە، بۆ ڕێگاگرتن لە ئەڵمانەکان بۆ ئەوەی گومانیان نەبێت دەربارەی ئاسایشی پەیوەندیەکانیان، بەریتانیەکان یاسایەکیان پەیڕەو کرد کە هیچ کەشتیەک هێرشی ناکرێتە سەر پێش ئەوەی فڕۆکە چاوەدێریە هەواڵگرییەکان بەسەریدا نەفڕن، بەم شێوەیەش ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئەڵمانەکان هەست بەوە بکەن کە چۆن بەریتانیەکان ئەو کەشتیانە دەکەنە ئامانج.
هەر لەم بارەوە چیرۆکێکی تریش جێگای تێڕامانە کە کاتێک سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا *ونستن چێرچل* لە پێشدا دەربارەی هێرشێکی وێرانکەری هێزە ئاسمانیەکانی ئەڵمانیای زانی بۆسەر شاری *کۆڤێنتری* ئینگلیزی بەلام هیچی نەکرد بۆ ئاگادارکردنەوەی هێزی بەرگری ئاسمانیی یان دەزگای حاڵەتی فریاکەوتن بەهۆی ئەوەی نەوەک ترسێک دروست ببێت، وەک توانای بەریتانیا لاواز بکات بۆ خوێندنەوەی پەیامی ئەڵمانەکان. توێژینەوەی مێژووییەکان دەڵێن کە گوایە ئەم چیرۆکە دروست نییە: ئەوە پەیوەندییە گەیاندنەی هەبوو ڕێگای بە بەریتانیەکان

ئەدا کە بزانێت شاری کۆڤێنتری ئامانجی هێرشە ئاسمانیەکان بووە.[i] هەرچۆنێک بێت، ئەم گێڕانەوەیە ڕوونکردنەوەیەکی دراماتیکی ڕووندەکاتەوە لەسەر گرفتی ئەخلاقی و ستراتیژی کە حکومەتێک ڕووبەڕووی دەبێتەوە لە بڕیاردان لەوەی ئایا سەرچاوەیەکی هەواڵگری بخاتە مەترسییەوە بە کارکردن لەسەر بنچینەی ئەو زانیارییەی دەستکەوتووە یان نا.

**شیکردنەوەی دووریپێو**(*Telemetry Analysis*) تێلێمەتری بریتییە لە گواستنەوەی ڕادیۆیی زانیاری لە ئامێرێکەوە بۆ بنکەیەکی سەرەکی-زانیاریی لەسەر تۆپەڕاسیۆنی ئامێرێکی بزۆک (بۆ نموونە، خێرایییەکەی یان ڕێژەی کارکردنی بزوێنەرەکەی)، دۆخەکەی (وەک پلەی گەرمی پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی یان ژمارەی ئەو لەرینەوانەی کە هەیەتی)، یان چەند تایبەتمەندییەکی تر. مەبەستەکە بریتیی لە پێدانی داتاگەلێک کە ئەندازیاران تاقیکردنەوەیەک ئەنجامدەدەن بۆ هەڵسەنگاندنی ئەدای ئەو ئامێرە یان، لەکاتی لەکارکەوتنی، بۆ ئەوەی هۆکارەکەی بزانن. بە بەکارهێنانی ئەم زانیارییە، ئەندازیاران دەتوانن دووبارە بنیادی گرفتەکان بکەنەوە و دڵنیایی بدەن بدەن کە ئەو ئامێرە شایانی بەکارهێنانە یان هەر گۆڕانکارییەکی تیادا بکەن.

---

[i] Lewin, *Ultra Goes to War*, ٩٩–١٠٣. See also F. H. Hinsley, et al., *British Intelligence in the Second World War: Its Influence on Strategy and Operations* (New York: Cambridge University Press, ١٩٧٩) ١, app. ٩ ("Intelligence in Advance of the GAF Raid on Coventry, ١٤ November ١٩٤٠"), ٥٢٨–٤٨.

هەمان هێمای ڕادیۆیی، دەکرێت لەلایەن هەواڵگرییەکی بیانییەوە ببڕدرێت بەهۆی جۆرێک لە زانیاری کۆکەرەوە کە بە هەواڵگریی دووربێو ناسراوە.[i] شیکردنەوەی دووربێو پرۆسەیەکە کە بەهۆیەوە داتا دووربێوەکان بەکاردێن بۆ زانینی تایبەتمەندی سەرەکی ئامێرێکی تاقیکردنەوە. بێگومان، کاتێک ئەندازیاری تاقیکردنەوە دەست دەکەن بە لێکدانەوەی ئەو داتایە، ئەوان پێشتر دەزانن؛ بەهۆی دیزاینی سیستەمی تێلێمەتری، کە بەتەواوی بۆ کامە تایبەتمەندی موشەک بۆ هەر بەشێکی داتاکە دەگەڕێتەوە. ئەو شیکەرەوە تێلێمەتریانەی بۆ دەزگایەکی هەواڵگری بیانی کاردەکەن، بە هیچ یەکێک لەم زانیاریانە کارەکەیان دەست پێناکەن؛ دەبێت ئەوان بزانن، بەهۆی خودی داتای ڕادیۆ، کامە تایبەتمەندی موشەکێک لەلایەن هەر کەناڵێکەوە پێوانەکراوە. هەر کە شیکەرەوەکان هەموو ئەمانەیان زانی، ئەوکات دەتوانن هەوڵبدەن داتاکە بەکاربهێنن بۆ دروستکردنی مۆدێلێکی کۆمپیوتەری موشەکەکە، کە لێیەوە ئەم جۆرە تایبەتمەندیانە وەک قورساییەکی سەرەتایی دەتوانرێت لێیەوە هەڵێنجرێت.

شیکردنەوەی تێلێمەتری بەتایبەتی ئامرازێکی گرنگ بوو بۆ ئەوەی هەموو زانیاری گرنگی پێشکەوتنەکانی سیستەمی سۆڤیەت بپارێزن لە بەرنامەی چەکی ئەو وڵاتە وە بۆ چاوەدێریکردنی پابەندبوونی مۆسکۆ بە ڕێککەوتنەکانی کۆنترۆڵی چەک. هەرچەندە، وەک شیکردنەوەی شیفرە، تێلێمەتریش لاوازیی تیادایە. هەر کە حکومەتێک لە بەهای تێلێمەتری دوژمن گەیشت لە شیکردنەوەی بەرنامەی چەکەکانی وە تێگەیشت کە

---

[i] telemetry intelligence

چۆن دەکرێت خودی تێلێمەتریەکە بشکێنرێت، ئەو دەتوانێت هەنگاوی پێویست بگرێتەبەر بۆ پاراستنی ئەو زانیاریانە. بۆ نموونە، لەکاتی گفتوگۆیەک دەربارەی بەستنی پەیمانی(SALT II) لە ساڵی ١٩٧٩دا، ئەوە ڕوون بووەوە کە ئەمریکا بە توندی پشتی بەستبوو بە تێلێمەتری سۆڤیەت بۆ چاوەدێریکردنی بەرنامەی موشەکی سۆڤیەت بۆ ئەوە پشتڕاست بکاتەوە کە تا چ ئەندازەیەک سۆڤیەت پێگیری دەکات بە ڕێککەوتنەکە. سەرەڕای ئەمەش، بۆ کۆتایی ساڵانی حەفتاکان، هەواڵگری سۆڤیەت توانی بەهۆی کاری سیخوڕییەوە تێگەیشتنێکی تاڕادەیەک باش بەدەست بهێنێت لەوە چۆن ئەمریکا دەتوانێت زانیاری تێلێمەتری موشەکی سۆڤیەت بەهۆی ئاسمانەوە بدەست بهێنێت. هۆکارە دروستەکان هەرچییەک بووبن، لەو کاتە بەدواوە، یەکێتی سۆڤیەت بەتوندی زانیارییە تێلێمەتریەکانی شیفرەدار کرد لە تاقیکردنەوەی ستراتیژیی موشەکەکان، وە بەم شێوەیەش ئەو داتایانەی لە هەواڵگریی ئەمریکا شاردەوە.[i]

ڕوون نییە ئەوە چ ڕێگایەکە بۆ سەرکەوتنی شیکردنەوەی کۆدی پەیامی کۆدکراوی تێلێمەتری. لە هەر کەیسێکدا بێت، چەند میتۆدێک هەن جگە لە شیفرەکردنێک کە بەکاربێت بۆ دزەنەکردنی زانیاری تێلێمەتری بۆ دەزگایەکی هەواڵگری دوژمن. هەروەک لە بەشەکانی پێشوودا تێبینی کرا، دەکرێت داتاکان لەسەر شریتێک لەناو چەند کەپسولێکی پڕ لە ئاڵۆزیی تۆمارکرابن.

---

[i] Robert Lindsey, *The Falcon and the Snowman* (New York: Simon and Schuster, ١٩٧٩).
Curtis Peebles, *Guardians: Strategic Reconnaissance Satellites* (Novato, Calif.: Presidio, ١٩٨٧), ٢٠٠–٢٠١.

**لێکدانەوەی وێنەیی**[i] سەرەڕای پێشکەوتوویی ئەو ئامێرەی کە وێنەکان لە قوڵایی و دوورییەکی زۆرە دەگرێت، هیچ بەدیلێک تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە بۆ چاوی مرۆڤ کاتێک باس لە دیقەی وێنەکان دەکەین بە بەراورد لەگەڵ مرۆڤدا. ئەمە، بێگومان، کارێکی ئاسان نییە هەروەک دەبینرێت؛ لەکاتێکدا کە زۆرجار دەوترێت کە وێنە شێوازێکی قابیلکەری هەواڵگرییە (بەو پێیەی کە بەرپرسە باڵاکان زیاتر هەست بە متمانە دەکەن دەربارەی ئەو هەواڵگرییەی ئەو بەدەست دەهێنن کاتێک دەتوانن "خۆیان ببینن"). تەنیا دوای ئەوەی شیکەرەوەی وێنەیی ئاماژە بە گرنگیی و تایبەتمەندی وێنەکە دەدات کە کەسانی ئاسایی دەتوانن تێبگەن چی دەبینن.[ii]

هەروەک لەسەرەوەدا بە کورتی ئاماژەیەکی لابەلای پێدرا، کوالیتی سیستەمی چاوەدێری وێنەیی زۆر گرنگە، بەڵام چۆن بزانین کە بە چ پێوەرێک ئەم کوالیتییە دەپێورێت؟ ئەمە لە زانستی هەواڵگرییدا بە "مەودای ڕوونی وێنەی سەرئەرز" دەپێورێت. لەکاتێکدا مانای دروستی ئەم چەمکە زۆر تەکنیکییە، دەکرێت وا لێکبدرێتەوە کە بە واتای قەبارەی بچوکترین ماددە دێت کە ئەو کامێرایەی وێنەی پێ دەگیرێت بتوانێت نزیکی بکاتەوە. هەرچەندە چەندین هۆکاری تر دەبێت بخرێنە بەرچاو بۆ بڕیاردان لە سەر ئەو مەسەلەیەی بە چ ئاستێکی باش دەتوانرێت وێنەکە لێکبدرێتەوە، مەودای ڕوونی وێنەی سەرئەرز "سەرەڕای ئەمەش... بە پێوانەیەکی قابیلکەری بەسوود دادەنرێت لە هەڵسەنگاندنی وێنەکەدا." هەرکە ئەو پێوانەیە بە تێپەڕبوونی کات و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا زیاتر

---

[i] Photo Interpretation
[ii] Brugioni, *Eyeball to Eyeball: The Inside Story of the Cuban Missile Crisis* (New York: Random House, ١٩٩١), ٢٣٠.

پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی، ئەوا بە هەمان شێوەش بڕی ئەو زانیارییەی کە دەکرێت لە وێنەیەکەوە دەستبکەوێت زیاد دەکات. بەشێوەیەکی گشتی، کوالێتی وێنەیەک بە پشتبەستن بە ڕێژەی شیکردنەوەیەک دەبەستێت کە دەگیرێتەبەر سەبارەت بە ئامانجێکی دیاریکراو. بۆ وێنە، کاتێک کامێرایەک وێنەی فڕۆکەیەک لەمەودایەکی دوور دەگرێت- بەشێوەیەکی گشتی- وەک هەر فڕۆکەیەکی ئاسایی شیدەکرێتەوە، بەڵام کاتێک کوالێتی ئەو کامێرایە بەرز بێت، بەئاسانی دەتوانرێت جۆر و قەبارەی ئەو فڕۆکەیە بزانرێت، وە بەم پێیەش شیکردنەوەیەکی وردی بۆ بکرێت لە ڕووی هەواڵگرییەوە.

ئەوەی لێرەدا گرنگە بزانرێت ئەوەیە کە ناکرێت زانیاری کوالێتی کامێرای دەزگایەکی هەواڵگریی لە ناو دەزگاکەدا-تەنانەت لەناو دەزگاکەش تەنیا چەند کەسێکی تایبەتمەند دەبێت ئەو زانیارییەی هەبێت- دزە بکاتە دەرەوە و دوژمن پێی بزانێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە لایەنی بەرامبەر بێ ئاگا بێت لەو زانیارییە بەهۆی ئەو وێنانەوە دەستی دەزگاکە کەوتوون، وە بەم پێیەش، لەسەر بنەمای ئەو وێنانە بڕیاری هەواڵگریی بدرێت. سەرەڕای ئەمەش، دزەکردنی ئەو جۆرە زانیارییانە بۆ پلاندارێژەرانی سەربازیی دوژمن هۆکارێکە بۆ زانینی کون و کەلەبەری دەزگاکە. پلاندارێژەرانی هەوڵە فێڵاوییەکان ئەم زانیارییە بەسوود دادەنێن چونکە پێیان دەڵێت کە تا چ ئەندازەیەکی نزیک دەتوانن فێڵ لەو کامێرایە چاوەدێرییە بکەن و بەلاڕێیدا بەرن.

ڕوونی وێنەکە چەندە باشیش بێت، ناتوانرێت هەموو جۆرە زانیارییەک بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە وێنەیەکەوە وەچنگ بکەوێت. ئەو کەسە

تایبەتیانەی ئەو کارە دەکەن دەبێت لەسەر چەند ئاستێکی تایبەت کارەکانیان وەربێ بکەن واتە، لەسەر بنەمای ناوەڕۆکگەلێک کە، لەسەر بنەمای ئەزموون و زیرەیی، پەیوەستن بە چەند ئامێرێک، چالاکی دیاریکراو، بە نیازی چەند هەنگاونانێکی تایبەت لە داهاتوو، و ئەو جۆرە تایبەتمەندیانە. بۆ نموونە، درێژی مەدرەجی فڕۆکەخانەیەک بەو واتایە دێت کە جۆرە فڕۆکەیەکی نوێی مەزنتر لەو مەدرەجە دەبێت بوەستێت تا مەدرەجەکە درێژ دەکرێتەوە بۆ ئەم جۆرە فڕۆکەیە؛ لە ڕووی ئەزموونەوە، دەبێت ئەو کەسەی وێنەکە دەگرێت بزانێت کە درێژیی مەدرەجێک بە توندی پەیوەستە بەو جۆرە فڕۆکەیەی کە بۆ ئەو مەدرەجە دەشێت ئەو جۆرە فڕۆکەیەی دادەنیشێت دەبێت لەڕووی قەبارەوە بگونجێت.[i]

## داتا بانک[ii]

هەروەک پێشتر لە بەشی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی بەهۆی سەرچاوەی کراوەوە باسکرا، یەکێک لە ئەرکە بەردەوامە سەرەکییەکانی دەزگایەکی هەواڵگریی بریتییە لە کۆکردنەوە و بەڕێوەبردنی داتابەیسێکی مەزن کە چەندین بابەتی بەهادار لەخۆی بگرێت بۆ حکومەتێکی بیانیی و سیاسەتی سەربازیی ئەو حکومەتە. ئەم کارە، بێگومان، کات و وزەیەکی بێ شوماری پێویستە بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر هەموو ئەو دەوڵەتانە

---

[i] مەدرەج: ئەو شوێنەی لە فڕۆکەخانەیەکدا کە فڕۆکەی لێ دەفڕێت و دەنیشێتەوە (وەرگێڕ)

[ii] Data Banks

کۆبکرێتەوە کە تیایاندا چالاکی سەربازیی ئەنجام دەدرێت.[i] مەبەست لە دیزاینکردنی ئەم جۆرە داتابەیسە بۆ ئەوەیە کە هاوکاری پلاندانەرێکی

[i] Sherman Kent, *Strategic Intelligence for American World Policy* (Princeton, N.J.: Princeton University Press, ١٩٤٩; reprint, ١٩٦٦), ١٢–١٣.

لەم پەرتووکەی سەرەوەدا، شێرمان کێنت کۆکردنەوەی زانیاری بەم شێوەیە پۆلێن دەکات:

- پێشخانی گشتی: شوێن، سنوورەکان، ناوچە، مێژوو، پێکهاتەی حکومی و ئیدارەیی.
- کارەکتەری وڵاتەکە: شێوازی پێکهاتەی حکومەت، خاک، کەشوهەوا، دابینکردنی ئاو.
- خەڵک: رەگەزنامەکان، زمان، رەفتار، دابەشبوونی دانیشتوان، نیشتەجێبوون، تەندروستی، پێکهاتەی کۆمەڵگا.
- ئابووریی: کشتوکاڵ، پیشەسازیی، بازرگانیی، کانزاکاریی، راوەماسیی.
- گواستنەوە: رێگای شەمەندەفەر، رێگا، بەندەر، بنکەی ئاسمانیی، ئاراستەی رووبارەکان.
- جوگرافیای سەربازیی
- دامەزراوەی سەربازیی: سوپا، رێکخستنی جەنگ، بەرگری جێگیر، بنکە سەربازییەکان، هێزی دەریایی: رێکخستنی جەنگ، کەشتیگەلی، بنکەی کەنار دەریایی، هێزی ئاسمانی دەریایی، ئاسمانیی: رێکخستنی جەنگی، فڕۆکەی سەربازیی، بنکە ئاسمانییەکانی دەریایی.
- هەندێ شتی تایبەتی وەک: داتای پاشخانی بەرپرسە باڵاکانی حکومەت، ناوی جوگرافی خۆجێیی، وەسفی رووبار، دەریاچە، وە کەندلاوەکان، لیست و تایبەتمەندیەکانی هەموو وێستگەکانی بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا، وەسفی رێگاکان.

سەربازیی بکات، کە وەک ڕۆنی جەنگ، وە بەم پێیەش زانیاری پرواوپڕی سەربازیی، گواستنەوە وە کۆگا سەربازیی، وە جوگرافیای سەربازیی لەخۆ گرتبێت... ئەمە سەرەڕای زانیاری ورد دەربارەی سیاسەتی وڵاتەکە، ژمارەی دانیشتوان، پیشەسازیی، کشتوکاڵ، و ئەم جۆرە تایبەتمەندیانە.

هەرچەندە ئەو کێشانەی پێوەندییان بە شیکردنەوەی داتاوە هەیە لە کۆکردنەوەی ئەو جۆرە ئینسایکلۆپیدیایە زۆر دەگمەنن، بەڵام ئەرکێکی سەرەکییە بۆ ئەوەی هەوڵبدەن چارەسەری ئەوە بکەین چ جۆرە زانیارییەک گرنگە و کامەیان سوودی نابێت. بڕیاردان لەسەر ئەوەی کامە وڵات دەبێت سەرنجی بخرێتە سەر وە تا چ ئەندازەیەکی قوڵ ئەم سەرنجە سەر بکێشێت، بڕیاردانێکی زۆر قورسە. بۆ نموونە، پلانی داگیرکردنی *گرینادا* لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٣ لەلایەن ئەمریکا وە وڵاتانی ڕێکخراوی خۆرهەڵاتی کاریبی زۆر بەخێرایی پەرەپێدرا. یەکێک لە سەرئەنجامەکانی بریتیی بوو لەوەی کە نەخشەی سەربازیی تێروتەسەل بۆ ئەم ئامانجە نەبوو. بەگوێرەی وتەکانی ئەدمیرال *وێسلی مکدۆناڵد*، سەرلەشکەری هێزەکانی ئەمریکا لە دەریای ئەتلانتیک، "سوپاکە، بەتایبەتی ئەو هێزە زەمینیەکان، سەرەتای لەنەخشەی ڕێگا یان جۆرەکانی تری نەخشە ئۆپەراسیۆنیان دەستپێکرد کە کارەکەی زۆر قورس کرد بۆ ئەوان بۆ

---

لیستی فڕۆکەخانەکان وە گرنگترین ئەو بنکانەی فڕۆکەکانی تیایاندا دەنیشنەوە.
لیستی هێڵ و تەلەفۆن و تەلەگرافی سەرەکی ناوچەکە. پارە. کەنار دەریاکان.

ئەوەی خۆیان یەکلایی بکەنەوە لە... خاڵی سەر نەخشە. ئەمە یەکێک بوو لەو وانانەی فێری بوون."[i]

جۆرەکانی تری داتا بانک سوودی بۆ خودی شیکەرەوە هەواڵگرییەکان هەیە. بۆ نموونە، هەروەک پێشتر خرایە بەر باس، کۆکردنەوە و لێکدانەوەی ژمارەیەکی زۆری داتای نهێنیی دەکرێت ببێتە بەرچاوڕوونیەک بۆ کۆمەڵگایەکی داخراوی وەک یەکێتی سۆڤیەتی جاران، یە کوبا و کۆریای باکوری ئیمڕۆ. بۆ نموونە، فایلی داتای بایۆگرافیا (وەک هەموو ڕۆژنامەکانی پارتێک و بەرپرسەکانی حکومەت، پێگەکانیان، تەرقیە، گەشت، وە تا دوایی) دەتوانرێت شیبکرێتەوە بۆ ئەوە ببێتە ڕێ خۆشکەر بۆ پەیوەندی لە نێوان بەرپرسان، کێشەی کوتلەکاریی لەناو سەرکردایەتی، وە لەم جۆرە بابەتانە.

### ئەنجامی هەواڵگری تەواوکراو

ئەو جۆرە شیکردنەوانەی لەسەرەوە خرانە بەرباس بریتیین لە هەنگاوی سەرەتایی پێویستی پرۆسەی شیکردنەوە؛ بۆ بەشێکی هەرە زۆری، ئەنجامەکانی ئەم کارە وەک سەرچاوەکانی شیکەرەوە هەواڵگرییەکانی تر خزمەت دەکات بەڵام بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ درێژ نابێتەوە بۆ داڕێژەرانی سیاسەت یان فەرماندە سەربازییەکان (کە خۆی لەخۆیدا ئامانج لە کۆکردنەوەی زانیاری لە کۆتاییدا لەلایەن ئەمانەوە تەرجەمە دەکرێتە سەر کردار و پەرچەکردار). ئەم برگەیە لە جۆرەکانی ئەو زانیارییە هەواڵگرییە

---

[i] House of Representatives, Committee on the Armed Services, *Lessons Learned as a Result of the U.S. Military Operations in Grenada: Hearing*, ٩٨th Cong., ٢d sess., ١٩٨٤, H. Rept. ٩٨-٤٣, ٢٤.

ـەکۆڵێتەوە. ئەو تەکنیکە شیکەرەوەییانەی نە بەشێوەیەکی تەکنیکی وەک شیکردنەوەی کۆد یان تێلێمەتری بەکاردێن، نە ئاوازەن بۆ کاری هەواڵگریی. لە هەندێ حاڵەتدا، وەک بەئەنجامگەیاندنی هەواڵگری بەرهەمهێنانی ئابووریی یان سیاسیی، تەکنیکەکان جیاواز نین لە ی زانستی کۆمەڵایەتی.

***هەواڵگری زانستی و تەکنیکی*** لەساڵانی پێش و کاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا، هەنگاوەکانی بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای سەردەم بەشێوەیەکی بەرچاو پەلیان خزاندە ناو پیشەسازی چەکەوە. توانای نەتەوەیەک بۆ ڕکابەریکردنی سەربازیی لەو ساتەوە پشتی بە ئاستی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا، وە تواناکەی بۆ بەپیشەسازیکردنی سیستەمی چەک لە تەکنەلۆژیاوە دەبەست بەم پێیەش، تەکنەلۆژیا خزایە ناو توانای بەرهەمهێنانی چەک، قەبارەی هێزی سەربازی وڵاتێک، وە بەشەکانی تری توانا سەربازییەکان. ئەمە بۆ کاروبارەی جەنگی ئاسمانیش هەر دروست بوو، کە تیایدا پێشکەوتنێکی بەرچاو لەم بوارەشدا کەوتە ڕۆژەڤ لەمەودای دروستکردنی ڕاداری بەرگریی، سیستەمی پێشکەوتووی دەریایی بۆ ڕێنماییکردنی ئاراستەی بۆمبی فڕۆکەکان بۆسەر ئامانجەکەی، فڕۆکەی جێت، موشەکی بالیستی و کروس، وە لە هەمووشیان گرنگتر، بۆمبی ئەتۆمی. تێگەیشتن لە سیستەمی نوێی چەک کە دوژمن پەرەی پێدەدا بوو بە بەشێکی گرنگی دەزگا هەواڵگرییەکانی هەر نەتەوەیەک. لە چەندین کەیسدا، گرنگ بوو زانیاری تێروتەسەل بەدەستبهێنن دەربارەی ئەو

ڕێگایانەی کە بەکاردێن لە چۆنیەتی کارکردنی سیستەمێک بۆ ئەوەی ئەوانیش پەرە بەڕێگاکانی بەرپەرچدانەوەی بدەن.

ئەمە بووە هۆی زیادبوونی ئەرکێکی نوێ بۆ سیستەمە هەواڵگرییەکان: بۆ پێشبینیکردنی دەرکەوتنی چەکی نوێ وە تێگەیشتن لەوە کە تا چ ئەندازەیەک پێشکەوتووە کاتێک سەرهەڵدەدەن بۆ ئەوەی توانای هێزە چەکدارەکانی وڵاتێک بۆ بەرگریی لەدژی وە بەرپەرچدانەوەیان بزانن. ئەمە پێویستی بەوە بوو کە دەزگا هەواڵگرییەکان دەستیان بە زانیاری تەکنیکی و زانستی تایبەتمەند بگات وە ئەم زانیارییە تێکەڵ بکرێت بۆناو پرۆسەی هەواڵگریی.

کۆکردنەوەی ئەو پێویستیانە بۆ هەواڵگری زانستی وە تەکنیکی دەبێت زیاتر ورد بێت بە بەراورد لەگەڵ جۆرەکانی تری هەواڵگریی؛ ڕوون نیە بۆ کەسێک کە شارەزایی نەبێت لەگەڵ تەکنەلۆژیای نوێ کە دەبێت سەرنجی بخاتە سەر گەڕان لە چ شتێک وە لە کوێ. ئەمەش بەو واتایە دێت کە هەماهەنگی نزیک پێویستە لە نێوان شیکەرەوەکان وە ئەو کەسانەی زانیاری کۆدەکەنەوە. بەجۆرێک لە جۆرەکان، پرۆسەکە بە هەمانشێوەی میتۆدە زانستیەکە بێت، کە ئەگەرەکەی تیادا تاقیکراوەتەوە، هەڵبەتە بەهۆی چاودێری ڕاستەوخۆ نەوەک تەنیا تاقیکردنەوەیەک بێت بۆ زانینی ئاستی دروستی و نادروستی زانستی ئەو بابەتە. بۆ نموونە، *ئار ڤی جۆنس*، سەرۆکی بەشی هەواڵگری وەزارەتی ئاسمانی بەریتانی لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا، دەگێڕێتەوە کە چۆن تیرۆرەکەی دەربارەی سروشتی یەکەم هێمای (سیگنال) سیستەمی ڕادیۆیی کە ئەڵمانەکان بەکاریان دەهێنا وەک هێرشێکی دەریایی بۆ فرۆکە بۆمبهاوێژەکان

دووپاتکرایەوە کاتێک فڕۆکەیەک دەکەوتە داوی سیستەمەکەی یان لەسەر سیستەمەکەی کاریان دەکرد.
شیکردنەوە لە بواری هەواڵگری تەکنیکی و زانستی پێویست بە تێکەڵکردنی شارەزایی تایبەتی زانستی و هەواڵگریی یان تەکنیکی هەیە. هەرچەندە خودی پرەنسیپە زانستیەکان، بێگومان، لە سروشتیدا جیهانین وە شارەزایان سەروکارێکی باشیان لەگەڵیدا هەیە لە سەرتاسەری جیهاندا، بەڵام ئەو رێگایانەی کە بەکاری دەهێنن لە پێشکەوتنە تەکنەلۆژیەکاندا دەکرێت بەشێوەیەکی فراوان لە نێوان وڵاتاندا جیا بن. بەم شێوەیەش، ئەم جۆرە شیکردنەوەیە پێویستی بە شارەزایی پێویست لەگەڵ پێشکەوتنە تەکنیکی و زانستیەکان هەیە بۆ تێگەیشتن لەوەی دوژمنێک خەریکی چییە، وە دەبێت ئەمەش لەبەرچاو بێت کە دەکرێت ئەو دوژمن بتوانێت ئەو کیشە تەکنیکیانە چارەسەر بکات کە شیکەرەوەکانی ئەو وڵایە نەیان توانیوە چارەی بکەن، یان دەکرێت بگەن بە چارەسەرێکی جیاواز، لەگەڵ ئەوەشدا گونجاو، بۆ ئەو گرفتانە.

***هەواڵگری سەربازیی*** هەواڵگری سەربازیی زانستێکە کە لە زانیاریی دەکوڵێتەوە دەربارەی دامەزراوە سەربازییە بیانیەکان وە پێویستە بۆ پلاندانانی هێزە سەربازییەکان وڵاتێک لەکاتی ئاشتیدا یان ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی سەربازیی لەکاتی جەنگدا. سەرەتاییترین هەواڵگری سەربازیی ئەوەیە کە بە "فەرمانی جەنگ" ناسراوە، بەو واتایەی کە زانیاری سەرەتایی دەربارەی هێزە سەربازییەکانی نەتەوەیەک پێویستە ژمارەی سەرباز، جۆرەکانی چەک، پێکهاتەی دامەزراوەیی، وە داتای لەم

جۆرە. زانینی ئەم زانیاریانە بەو واتایە دێت کە کارێکی ئاسانە ئاست و جۆری هێزی یەدەگ یان پاڵپشتی بزانین. بژارکردن و پێداچوونەوەی ڕێکخستنی کۆریای باکوور لەلایەن هەواڵگری ئەمریکاوە لە کۆتاییەکانی ساڵانی حەفتاکان جۆرێکە لەم کەیسە؛ بەدرێژایی زیاتر لە یەک ساڵ، خەمڵاندنی هەواڵگریی ژمارەی هێزە پیادەکانی کۆریای باکوور بە سێ قات زیادی کرد. هەمان ڕێژە بۆ ژمارەی تانک، ڕۆکێت، وە تۆپهاوێژیش خەمڵێنرا.

زانینی بەشێکی ڕێکخستنی جەنگەکە بە تەنیا بەس نییە، بەڵکو دەبێت زانیاری پێویستیش کۆبکەینەوە لەسەر لایەنی "چۆنیەتیی" دامەزراوەی سەربازی وڵاتێک؛ لەڕووی ئەوەی مەشقەکەیان تا چ ئەندازەیەک چاکە، چ جۆرە سەرکردایەتیەکی هەیە، وە ورەی سەربازەکان چۆنە، تا چ ئەندازەیەک نیشتیمانپەروەرن، ئایا ئەزانن بۆچی ئەجەنگن.

دوای ئەم هەنگاوە، ئیتر هەنگاوێکی باڵاتر دەست پێدەکات، ئەویش بریتییە لە بەدەستهێنانی زانیاری دەربارەی ئەوەی ئەو هێزانە چۆن چاوەڕوان دەکرێت بجەنگن: چ جۆرە تەکتیکێک بەکاردەهێنن وە مەشقیان لەسەر کردووە، ئەوان چۆن پێشبینی سروشتی جەنگەکە دەکەن، وە چ جۆرە ستراتیژیەتێک دەگرنەبەر بو شەڕکردن. زانیاریە کۆکراوەکان بۆ ئەم هەواڵگرییە دەکرێت لەڕێگای سەرچاوەی کراوەوە بن (وەک بڵاوکراوە سەربازییەکان)، پەیوەندی ئاشکرای کارمەندانی باڵیۆزخانە یان دبلۆماتەکان لەگەڵ سوپای دوژمن، چاوەدێری (جا چ بەڕاستەوخۆ یان بەهۆی سیستەمی کۆکردنەوەی تەکنیکی) جێگیرکردنی سەربازیی وە مەشقەکان، یان سەرچاوەی کۆکردنەوەی زانیاری لە ڕێگای مرۆییەوە کە

دەتوانن بەڕاستەوخۆ دەستیان بە پلانە سەربازییەکان بگات (سیخوڕی ناو سەربازگەیەک). دووبارە، تێکەڵکردنی ئەو زانیاریانە لەگەڵ شارەزایانی شیکردنەوەی قۆناغێکی گرنگترە بۆ زانینی ئاستی بەهێزیی هێزەکانی دوژمن.

بەڵام لەسەرووی هەموویانەوە، بیرفراوانی زۆر پێویستە بۆئەوەی بتوانن وابیربکەنەوە کە دوژمن ڕێگای جیاوازی چارەسەری گرتۆتەبەر بۆ کێشە باوە سەربازییەکان وە دەکرێت چارەسەرەکانی گونجاو بێت بۆ دۆخ و سەرچاوەکانی خۆی یان تەنانەت سەروی خۆی. بە کورتی، "پلاندانەرە ستراتیژیەکان پێویستیان بە زانیاریی هەیە لەسەر ئەوە دەکرێت دوژمن میتۆدی سەربازیی لایەنی تر بگرێتەبەر- ئەو جۆرە زانیارییە بۆ ئەوە پێویستە کە دەبێتە هۆی ئاشکراکردنی میتۆدەکانی ئۆپەراسیۆنی دوژمن، ناکۆکی ناوخۆیی، وە ئەو ڕێگایانەی کاری پێ دەکەن، ئەمە سەرەڕای ئەو ڕێگایانەش کە تیایدا دوژمن لەناوخۆیاندا لەیەکتر جیاوازن."[i]

یەکێک لە نموونە سادەکانی، بەڵام گرنگ، پێویستی (وە شکست) بۆ تێگەیشتن لە "جێبەجێکردنی پلانی وڵاتانی تری دوژمن" بریتییە لە فەڕەنسا لە هەمبەر ئەڵمانەکان کە لە کۆتاییەکانی جەنگی جیهانیی یەکەمدا جێبەجێی کرد. *ستراتیژیەتی ئەڵمانی* (the Schlieffen Plan) بریتیی بوو لە خۆبەدوورگرتن لە هێرشی ڕووبەڕوو لەدژی فەڕەنسا بە ئەنجامدانی هێرشێکی لایی بەناو بەلجیکادا وە ئینجا بەدرێژایی بەشی هەرەزۆری سنووری نەپارێزراوەی فرانکۆ-بەلجیکی. سەرەڕای ئەمەش، بۆ

---

[i] Eliot Cohen, "Analysis," in *Intelligence Requirements for the ١٩٩٠s: Collection, Analysis, Counterintelligence and Covert Action*, ed. Roy Godson (Lexington, Mass.: Heath, Lexington, ١٩٨٩), ٨٢

جێبەجێکردنی ئەم پلانە، ئەڵمانەکان دەبوایە یەکەی یەدەگ بەکاربهێنن لە هێڵەکانی پێشەوەدا؛ ئەگەرنا هێزی پێویستیان نەدەما بۆ هەڕدوو هێرشی لایی و پێگەی بەرگریی بەدرێژایی ئەو سنوورە. فەرەنسیەکان راپۆرتی هەواڵگرییان هەبوو کە ئەڵمانیا بە نیازی چی بووە، بەڵام ئەوان وایان زانی کە ئەم میتۆدە هەرگیز رێی تێناچێت و پشتگوێیان خست: لەبەر ئەوەی ئەوان خۆیان هێزی یەدەک بەکارنامێنن وەک هێزی بەرەی پێشەوە لەکاتی سەرهەڵدانی جەنگدا، ئەوان بڕوایان وانەبوو سوپای ئەڵمانیا بەو کارە هەڵدەستێت. بەم شێوەیەش، فەرەنسیەکان بەهەڵە حوکمیاندا لەو شوێنەی ئەڵمانەکان هێرش دەهێنن- نەک لەبەر نەبوونی زانیاری هەواڵگریی بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەوان شکستیان هێنان لە تێگەیشتن لەوەی کە سوپای ئەڵمانیا ڕەنگە بەشێوازێک جموجۆڵ بکات کە لە هی خۆی جیاواز بێت.[1]

لە کۆتاییدا، کاتێک ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان نزیک دەبنەوە یان خەریکە ڕوودەدەن، دەبێت جۆرە زانیارییەک هەبێت دەربارەی جوڵەی هێزە سەربازییەکان. ئەم جۆرە زانیارییە، داتای سەرەکین بۆ ئەوەی کە لە زانستی سەربازییدا بە "ئاماژە و ئاگادارکردنەوە" ناسراوە، کە مەبەست لێی ڕزگاربوونە لە ستراتیژیەتی لەناکاو.

[1] Jan Karl Tanenbaum, "French Estimates of Germany's Operational War Plans," in *Knowing One's Enemies: Intelligence Assessment before the Two World Wars*, ed. Ernest May (Princeton, N.J.: Princeton University Press, ١٩٨٤), ١٥٠_٧١.

***هەواڵگری سیاسیی*** هەواڵگری سیاسیی بریتییە لە کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی پرۆسە سیاسییەکان، بیرۆکەکان، وە نیازی وڵاتە بیانییەکان، لایەنەکان، وە سەرکردەکان. ئەو شیکردنەوەی کە ئەم هەواڵگرییە بەرهەمی دەهێنێت بریتییە لە هەموو نووسینە ئەکادیمیی و ڕۆژنامەڤانیەکان وە خەمڵاندنی هەردوو سیاسەتی نێونەتەوەیی و ناوخۆیی وڵاتە بیانییەکان. بێگومان، جیاوازییەکی هەرە دیار خۆی لە بوونی سەرچاوەی هەواڵگریی نهێنییدا دەبینێتەوە، مرۆیی یان تەکنیکی (بەشێوەیەکی سەرەکی هەواڵگری گەیاندن)، کە ئەو زانیاریانە دەبەخشێت کە بۆ ڕای گشتی میللەت بەردەست نین.

دەربارەی ئەوەی کە چۆن بزانین ئەم سەرچاوە زیادانە گرنگن، ئەوە پشت دەبەستێت بە هەردوو تایبەتمەندی سروشتی ڕژێمی ئەو وڵاتەی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت وە ژمارە و چۆنیەتی سەرچاوەی ئەو هەواڵگریانەی کەسێک هەیەتی دەرباری ئەو وڵاتە. تا زیاتر وڵاتێک دیموکراسی بێت، ئەوا ئاسانترە لە ژیانی سیاسیی ئەو وڵاتە بکۆڵینەوە بەبێ ئەوەی پەنا بۆ سەرچاوەی هەواڵگریی ببردرێت. بە پێچەوانەشەوە، بۆ ئەو وڵاتانەی کە تیایدا بڕیاری یەکلاییکەرەوەی سیاسیی لەلایەن یەک کەسەوە دەدرێت (یان بنەماڵە، یان حیزب)، سەرچاوە هەواڵگرییەکان هەم زیاتر گرنگ دەبن وە هەمیش بەهەموو ئەگەرەکان زیاتر قورس دەبن بۆ بەدەستهێنانیان. سەرەڕای ئەمەش، تەنانەت لە کەیسی کۆمەڵگا داخراوەکانیشدا، دەکرێت داتای کراوە هەبن کە، بەڕێکی شیکرابنەوە، زۆر زیاتر ئاشکرا دەکەن دەربارەی ژیانی سیاسیی بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی پێمان وایە بەدەستهێنانی زانیاری لەو کۆمەڵگایە قورسە. بۆ نموونە،

هەروەک لە باسی کۆکردنەوەی زانیاری مرۆیی باسکرا، داتای بایۆگرافی دەربارەی سەرکردەکانی وڵاتێک دەکرێت شیبکرێتەوە بۆئەوەی زانیاری ورد دەربارەی ناکۆکی ناوخۆیی ناو نوخبەی سیاسیی بزانین؛ تەنانەت لە رژێمێکدا کە خۆی وا نیشانی جیهانی دەرەوە دەدات کە لەناو خۆیاندا یەکگرتوون، دەکرێت لە ناکۆکی ناوخۆیی تێبگەین بەوەی ئایا کوڕی سەرکردەیەک بۆتە خاوەنەی پێگەیەک لەسەر حیسابی کوڕانی کەسانی تردا.

سەرەڕای پرسی بوونی سەرچاوەی ناکراوەی زانیاریی، یەکێکی تر لە جیاوازییە گرنگەکانی تر(وە ڕەنگە گرنگتریش بێت) لە نێوان شیکردنەوەی هەواڵگری سیاسیی وە ئەکادیمی یان کاری رۆژنامەڤانیی سەروکاری هەیە لەگەڵ مەبەستی جیاواز و کاری هەریەکەیان. بۆ نموونە، شیکەرەوە هەواڵگرییەکان لەکاتی خۆیدا چارەسەر بدۆزنەوە و وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە. کارەکەیان بە مفایە مەگەر بکاتە داڕێژەرانی سیاسەت بەرلەوەی بەهۆی دۆخێکی تایبەتەوە ناچاربکرێن شتێک بکەن. بە پێچەوانەوە، نووسەرە ئەکادیمیەکان بەگشتی ئەو مافەیان هەیە کاتی پێویستیان پێبدرێت کە پێیان وایە پێویستە بۆ گەیشتن بە دەرئەنجامێکی شایستە. بە هەمانشێوە، ئەکادیمیەکان بەزۆری بە تەنیا کاردەکەن لەسەر ئەم بابەتانەی ئەوان هەڵیدەبژێرن؛ شیکەرەوە هەواڵگرییەکان، بەزۆری بژاردەی بابەتەکەیان بەهۆی داواکاری ئەوانی ترەوەیە، بۆیە دەبێت کارەکان بە هەماهەنگی بێت لەگەڵ ئەوانی تردا بەر لەوەی کۆتایی پێ بهێنن.

جیاوازیی و نیاز و پرۆسەش کاریگەریی خۆیان هەیە لەسەر ناوەڕۆکی شیکردنەوەکانی ئەکادیمی و هەواڵگریی. شیکردنەوەی هەواڵگریی بەهۆی

چەندین هۆکار دەبێت سەرنج بخاتە سەر لایەنەکانی بارودۆخێک کە دەبێتە هۆکار و بنچینەی گرفتی جیددی بۆ داڕێژەرانی سیاسەت؛ سەرنجەکە لە کارێکی ئەکادیمیدا وا دادەنرێت کە بەهۆی ئەو لایەنە بڕیاری لەسەر دەدرێت کە توێژەرەکە پێی وایە گرنگترین و گەوهەریترین خاڵی توێژینەوەکەیەتی. ئەم پرسە لە بەشی شەشەمدا بە تێروتەسەلی باسی لێوە دەکرێت.

***هەواڵگری کۆمەڵایەتیی و ئابووریی*** هەواڵگریی کۆمەڵایەتی و ئابووریی زانستێکە لە هەمان ئەو دیاردانە دەکۆڵێتەوە کە زانستە کۆمەڵایەتیە هەمەجۆرەکانی تر لێی دەکۆڵنەوە، هەر هیچ نەبێت لەو ڕووەوەی ئەوان پەیوەستن بە پرسی هەنوکەیی گرنگ لە ڕۆژەڤی کۆمەڵگادا. هەروەک لە هەواڵگری سیاسییدا، سەرنجی سەرەکی شیکردنەوەی هەواڵگریی دەبێت بەهۆی ئەو زانیارییە یەکلایی بکرێتەوە کە داڕێژەرانی سیاسەت پێویستیان پێی هەیە. لێرەدا شیکردنەوەی هەواڵگریی بەزۆری کەمتر پێشکەوتووە- بەشێوەیەکی تیۆریی و ژمارەیی- بەبەراورد لەگەڵ لێکۆڵینەوە ئەکادیمیەکاندا، وە پێناچێت کێشەکە لە ڕووی نرخ و ئامانجی کارەکەوە بێت.

نەک تەنیا میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیی و هەواڵگریی لەم نێوەدا هەمان شتن (هیچ نەبێت لە پرەنسیپدا)، بەڵکو پسپۆڕان زیاتر لەو بوارەدا، بەبەراورد لەگەڵ هی بوارەکانی تر، دەتوانن وەک شیکەرەوەی هەواڵگریی دەستیان بەهەمان داتا بگات، چونکە کەمێک لەو داتایانە بەهۆی میتۆدە هەواڵگرییەکان بەدەست دێن. بەم پێیەش، ئەو پێشبینیەی لەلایەن

شیکەرەوەیەکی هەواڵگریی دەکرێت دەربارەی داهاتووی وڵاتیک زۆر جیاوازیی نییە لەگەڵ ئەو ئەنجامەی کە پسپۆڕێکی زانکۆیەک یان بیرمەندێک پێی دەگەن. سەرەڕای ئەو ڕاستیەی باسکرا، هەندێ جار میتۆدی هەواڵگریی پێویستە. بۆ نموونە، داتای ئابووریی زۆر گرنگتر دەربارەی یەکێتی سۆڤیەتی جاران بەنهێنی هێڵرایەوە؛ کە پێکهاتبوو لە تەبارەی یەدەگی زێڕ و فرۆشی ساڵانەی هەمان ماددە لە بازاڕە جیهانییەکاندا. لەکاتێکدا شیکەرەوە هەواڵگرییەکان بەزۆری ناچار دەکرێن ئەم ژمارانە پێشبینی بکەن بەهەمان ئەو ڕێگایەی هەر ئابووریناسێکی تر دەتوانێت، سەرچاوەیەکی هەواڵگریی ڕەنگە بتوانێت سەرەداوی گرنگ یان خودی ژمارەی بەرپرسە سۆڤێتیەکان بداتە دەزگاکان. بەشێوەیەکی گشتی، سوودی سەرچاوە هەواڵگرییەکان بۆ شیکردنەوەی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی کەمە، لە ڕووی پراکتیکەوە، دەزگا هەواڵگرییەکان ناتوانن پێشبینی زۆر مەزن لە شیکەرەوەکانی ئەم دوو بوارە بکەن. ئازادی ژیانی ئەکادیمی زیاتر پەیوەستە بە کەسانی لێهاتووی تری کۆمەڵایەتی، تەنانەت ئەگەر موچەکانیشیان کەمتر بێت. سەرەڕای ئەمە، دامەزراوە نێونەتەوەییەکان، بانکەکان، دەلالی کۆمپانیاکان دەتوانن بەئاسانی سوودی زیاتر ببەخشن لە دەزگا هەواڵگرییەکان بۆ ئەو خزمەتەی کە ئابووریناسێکی لێهاتوو دەیبەخشێت. بەگشتی، هیچ هۆکارێک نییە بۆ ئەوەی پێشبینی بکرێت کە شیکەرەوە هەواڵگرییەکانی بواری ئابووری زیاتر گرنگیان هەیە لەدەست گەیشتن بە داتای ئابووری نهێنیی بە بەراورد لەگەڵ ئابووریناسانی جیهانی کاردا. بێگومان، ژمارەیەکی نۆری ئەو شیکردنەوە ئابووریانەی لەلایەن ئابووریناسانی جیهانەوە مامەڵەی لەگەڵ

دەكرێت بەردەست نین بۆ داڕێژەرانی سیاسەت لە حكومەتەكەدا، بەڵام هیچ نەبێت دەكرێت هەندێ لەو زانیارییە بەدەست بهێنرێت، لەڕێگای خزمەتگوزاری ڕاوێژكاریی و ڕۆژنامەكانەوە.

## ئەنجامی هەواڵگریی

ئەنجامی پرۆسەی هەواڵگریی دەكرێت هەر ئامرازێك بێت، لە ڕاپۆرتێكی فەرمییەوە بۆ گفتوگۆیەكی سەرپێیی، كە لێیانەوە شبكەڕەوەیەكی هەواڵگریی ئەم زانیارییە تەحلیلكراوانە دەگوازێتەوە بۆ داڕێژەرانی سیاسەت یان فەرماندەی سەربازیی كە پێویستی پێیە وە دەتوانێت بەكاری بهێنێت. لەم برگەیەدا ئێمە هەڵدەستین بە باسكردنی چەندین شێوازی ئەنجامی هەواڵگریی وە ئەو وەزیفانەی كە ئەنجامی دەدەن. پۆلێنكردنەكە گشتییە وەك لەوەی ورد بێت؛ ئەو چەمكانەی تێیدا بەكارهاتووە بریتیین لەوانەی كە دەزگای هەواڵگرییەكانی ئەمریكا بەكاریان دەهێنێت.

بەشێوەیەكی گشتی، ئێمە ئەنجامی هەواڵگریی بۆ سێ كۆمەڵە دابەش دەكەین:

- هەواڵگری هەنووكەیی
- هەواڵگریی بنچینەیی
- خەمڵاندنی هەواڵگریی

لەمەودوا ئێمە ئەو ڕێگایە بەكاردەهێنین كە *شێرمان كێنت* گرتوویەتیەبەر، واتە هەمان ئەو وشانەی بەڕێزیان بەكاریهێناوە لەو بوارەدا؛ "فۆرمی

مەنووکەیی راپۆرتەوانی" هەواڵگریی، "فۆرمی سەرەتایی ناوەڕۆکیی"، و "فۆرمی هەڵسەنگاندن و خەمڵاندن". ناوبراو ئەو چەمکانە بە گرنگ دادەنێت بۆ زانیاریی دەربارەی ئێستا، رابردوو و داهاتووی هەواڵگریی.[i] ئێمە بەشێوەیەکی سەرەکی هەڵدەستین بەبەکارهێنانی نموونەی ئەمریکا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەنجامە جیاوازەکانی هەواڵگریی، چونکە زانیاری تێروتەسەلی زیاتر بەردەستن بەبەراورد لەگەڵ هی هەر نەتەوەیەکی تردا. سەرەڕای ئەمەش، ئەو جیاوازییە راست و ڕەوایە، هەرچەندە ئەو سەرنجەی خراوەتە سەر ئەنجامی جیاوازی هەواڵگریی لە دەزگایەکی هەواڵگریی بۆ یەکێکی تر جیاوازییان هەیە.

## هەواڵگریی مەنووکەیی

دەزگا هەواڵگرییەکان خاوەنی چەندین ئەنجامن کە دیزاینکراون بۆ ئاگادارکردنەوەی داڕێژەرانی سیاسەتی بابەتی گرنگی نوێی زانیاریی کە دەکرێت کاریگەرییان هەبێت بۆسەر سیاسەت. لەم ڕووەوە، دەزگاکان ئەرکێکی وا نیشاندەدەن کە هاوشێوەیە لەگەڵ هەواڵە میدیاییەکان.[ii] مەودای ئەو زانیاریانەی کە دەبێت بخرێنەبەر رووی دەزگایەک پشت بە مەودای ئارەزووی دەزگای هەواڵگری نەتەوەیەک دەبەستێت. بێگومان،

---

[i] Kent, *Strategic Intelligence*, ٧–٨.

[ii] هەندێجار ئاژانسە هەواڵگرییەکان وەک ڕکەبەری میدیای هەواڵ دادەنرێن، ئەمە بەزۆری لە زیانی ئاژانسەکاندایە. بۆ نموونە، چەند ڕیپۆرتێکی هەواڵ بڵاویان کردەوە کە کاربەدەستانی ئەمریکا پشتیان بە هەواڵێک بەست لە دەزگای هەواڵی سی ئێن ئێن کە کودەتای پەنامای لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٩ شکستی هێناوە؛ بەمەش هەردوای ماوەیەک کەناڵەکە بڵاوی کردەوە کە دەزگای هەواڵگریی ئەمریکا شکستی هێناوە.

ڕوونە کە دەبێت هەندێ بابەت پێش هی تر بکەوێت، هەروەک کێنت ئاماژەی پێدەدات، ئەمەش بەپشت بەستن بەو کێشانەی کە ئێستا نەتەوەیەک تووشی دەبێت یان ئەو کێشانەی دەزگاکە پێی وایە لە داهاتوودا ڕوودەدەن. لەکاتێکدا سیستەمێکی فەرمی ئەولەویەت دەکرێت هەبێت، دەبێت بەهۆی شارەزایانی هەواڵگرییەوە بڕیاری لەسەر بدرێت دەربارەی ئەوەی تا چ ئەندازەیەک جێگای بایەخ و گرنگیپێدانە. ئەم بڕیاردانەش، تەنیا پشت بە بیری شیکەرەوە هەواڵگرییەکان نابەستێت بەڵکو لەسەر نزیکی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ داڕێژەرانی سیاسەتیش بەندە.

لە ئەمریکادا، باشترین ئەنجامی ئەم جۆرە بریتییە لە *ئاگادارکردنەوەی ڕۆژانەی سەرۆک*. مەبەست لەم کارە بریتییە لە ئاگادارکردنەوەی سەرۆک لە "گرنگترین بابەتی هەواڵگری کە جێگای بایەخ بێت بۆ سەرۆک بۆ ئەوەی ئەرکی ئاساییشی نیشتیمانی لە نووسینگەکەیدا ئەنجام بدات" وە "ئەم ڕاپۆرتەش تەنیا بۆ سەرۆک، جێگری سەرۆک، وە چەند کەسێکی نزیک لە سەرۆک دابەش دەکرێت."[1] بەگوێرەی وتەکانی کۆرد مەیەر، کارمەندی پێشووی دەزگای هەواڵگری ناوەندیی (سی. ئای. ئەی)، کە لەساڵی ١٩٨٠دا دەنووسێت،

> ئەم ڕاپۆرتە دەبێت لە دە یان پانزە خولەکی سەرەتای هەر ڕۆژێکی کارکردنی سەرۆک بخوێنرێتەوە. ئەم ڕاپۆرتە هەوڵ نادات سەرنج بخاتە سەر دووبارەکردنەوەی ئەو هەواڵانەی لە میدیاوە لەماوەی

[1] CIA Directorate of Intelligence Website (accessed March ١٠, ٢٠٠١) www.odci.gov/cia/di/work/daily.html.

بیست و چوار کاتژمێری ڕابردوودا بڵاوکراونەتەوە، بەڵکو پوختەی ئەو ئەنجامە گرنگانە باس دەکات کە سەرچاوە نهێنییەکانی پێیان وایە کاریگەرییان لەسەر پێشکەوتنە جیهانییەکان هەیە.[1]

جاریەجار دەوترێت کە دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکا کات و هەوڵێکی زۆر تەرخان دەکەن بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم ئەرکەی "هەواڵگری هەنوکەیی،" بۆ ئەوەی دۆخەکە بەشێوەیەکی قوڵتر شیبکەنەوە. بۆ نموونە، ڕاپۆرتێکی لیژنەی ئەنجومەنی پیران کە لە لقی شیکردنەوەی سی ئای ئەی دەکۆڵێتەوە، بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری، ئەم چەند سەرنجەی خستەڕوو لەژێر ناونیشانی "نیشانەکانی ڕووداوە هەنووکەییەکان":

ئەرکی بەرهەمهێنانی ئەنجامی هەواڵگری هەنوکەیی- شیکردنەوەی ڕووداوە ڕۆژانەکانە بۆ ئەوەی بەخێرایی زانیاریەکان بڵاوبکەنەوە- بۆ ئیمڕۆ بەزۆری پشت دەبەستێت بە سەرچاوەکانی بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگریی. وەڵامدانەوەی داواکاریەکان بۆ زانیاری گرفتی هەنوکەیی لەلایەن داڕێژەرانی سیاسەتەوە بۆ چارەسەرکردنی بابەتی زیاتر، بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری پێویستی بە ڕێگەی شیکردنەوەی "ڕوودلوە هەنوکەیەکان"ە بۆ زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی. کەمتر ئارەزوو هەیە وە سەرچاوەی کەمتریش تەرخانکراون بۆ شیکردنەوەی قوڵی کێشەکان کە گرنگیەکی دووری هەبێت بۆ داڕێژەرانی سیاسەت... بەگوێرەی وتەکانی هەندێ چاوەدێر، ئەم نیشانەیە کاریگەرییەکی نەویستراوی هەیە لەسەر چۆنیەتی گرفتەکان و ناسینی کێشەی

[1] Cord Meyer, *Facing Reality: From World Federalism to the CIA* (New York: Harper and Row, ١٩٨٠), ٣٥٢.

> درێژخایەن. ڕێگای "ڕووداوە هەنووکەییەکان" بۆتە هۆی گرتنەخۆی زیادبوونی "کێشەی شیکردنەوە"ی چارەسەرکردنی سەرنج خستنەسەر ئەو کێشانەی لە داهاتوودا ڕووبەڕووی وڵات دەبنەوە. شیکەرەوەکان لەوم بوارەدا بەڵگە پێویستەکانی بەپەلە کۆدەکەنەوە، بە بەم شێوەیەش ئەو هۆکار و پەیوەندیانە لەیاد دەکەن کە پەیوەست بوون بە ڕوودانی گرفتێکی لەم شێوەیەدا.

بەردەوامی ئەم ڕەخنەیە بەدرێژایی چەندین ساڵ دەکرێت ئاماژەیەک بێت بۆ ئەوەی کە فشارەکە بۆ ئەم ڕێگای ڕووداوی هەنووکەیی بەشێوەیەکی دامەزراو بەهێزە وە بەزۆری دەست بەسەر ویستی خودی شیکەرەوە هەواڵگرییەکاندا دەگرێت بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ لەم بابەتەدا.[1] هەمان فشار دەکرێت ببینرێن لە دەزگا هەواڵگرییەکانی وڵاتانی تریش جگە لە ئەمریکا.

### ئاماژە و ووریاکردنەوە

یەکێک لە گرنگترین ئەو ئەرکانەی دەزگایەکی هەواڵگریی دەتوانێت ئەنجامی بدات بریتییە لە پێدانی ئاگاداریی کردەوە سەربازییەکانی دوژمن "لەکاتی گونجاودا"؛ لە سەردەمی چەکی ناوەکیدا، گرنگی ئەم ئەرکە لە هەموو کاتێک پێویستترە. لە ڕاستیدا، کارەکتەری سیستەمی هەواڵگری ئەمریکای دوای جەنگی جیهانیی دووەم بەشێوەیەکی گشتی زیاتر شکست بوو لە زانینی هەواڵگریی پێویست لەکاتی گونجاو و نەبوونی

---

[1] Thomas L. Friedman, "In Quest of a Post–Cold War Plan," *New York Times*, November ١٧, ١٩٨٩, A٢٢.

دامەزراوەیەکی لەبار بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەمریکیەکان لە هێرشی یابانیەکان بۆسەر *پێرل هاربەر*.

## هەواڵگری بنچینەیی

یەکێکی تر لە ئەنجامەکانی هەواڵگریی بە "راپۆرتی هەواڵگری بنچینەیی" ناسراوە. ئەم جۆرە راپۆرتە هەوڵدەدات وێنەیەکی تەواو لەو نۆخێکی دیاریکراو بیەخشێت، وە وێنەیەکی داتا بەردەستەکان و زانیاری پەیوەستدار لە هەموو سەرچاوە هەواڵگرییەکانەوە بکێشێت. بۆ نموونە لە گۆرەپانی سەربازییدا، دەکرێت ئەم جۆرە ئەنجامانە لە جەنگدا بین بە فەرمانی سەربازیی. بەهەمان شێوە، راپۆرتی بنچینەیی هەواڵگریی لەسەر سیستەمی سیاسی نەتەوەیەکدا دەکرێت هەموو هێزە سیاسیی و کەسایەتیە گرنگەکان، بۆچوون و ویستەکانیان بگرێتەوە، رێگایەک کە تیایدا ئەوان بەیەکەوە پەیوەستن.

## راپۆرتی خولیی

لەکاتی جەنگی سارددا هەواڵگری ئەمریکا هەڵسا بە ئەنجامدانی راپۆرتی نیمچەساڵانەیی لەسەر وابەستەیی سۆڤیەت بە رێککەوتنەکانی ستراتیژی چەکی ناوەکی؛ ئەم راپۆرتانە باشترین بریاردانی هەواڵگریی دەخنەڕوو دەربارەی هێزە ستراتیژیە ناوکیەکانی وڵاتێک لە وابەستە بووە بە رێککەوتنێک. لە ساڵی ٢٠٠١دا، بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری *سی ئای ئەی* لەسەر پێگە ئەلیکترۆنیەکەی هەڵسا بە نیشاندانی ئەم راپۆرتە خولیانەی دەزگاکەی:

- پوختەی هەرێمیی. خەملاندنێکی خولیی بوو (لە ڕۆژانەوە بۆ مانگانە) دەربارەی سیاسەت، ئابووری، سەربازیی، وە کۆمەلایەتی گرفتە بیانیەکان کە پەیوەست بوون بە بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا... لە ڕووداوە نیشتیمانیەکان لە ئەفریقیا، ئەورووپا، ئەمریکای لاتین، ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، ئاسیا، ولاتانی سلافک و ئەو ولاتانەی سەربە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بوون.
- پوختەی تیرۆریزم. بلاوکراوەیەکی مانگانە بوو کە لە چالاکی و میتۆدەکان هەنوکەیی تیرۆریزمی نێودەولەتی دەکۆلێیەوە... ئەمە سەرەڕای ڕووداوە تیرۆرستیە نێودەولەتیەکان.
- چاوەدێری ماددە هۆشبەرەکان، [کە] لە هەموو ئەو بابەتانەی دەکۆلێیەوە کە پەیوەندیان بە بەرەوپێشەچوونە جیهانیەکانی ئەم بابەتەوە هەبوون.
- راپۆرتی بازرگانی چەکی نێوەدەولەتی، کە هەر دوو مانگ جارێک دەردەچوو.

## خەملاندنی هەوالگریی

یەکێک لە گرنگترین جۆرەکانی ئەنجامی هەوالگریی بریتییە لەوەیە کە نەک تەنیا وەسفی دۆخی هەنوکەیی دەکات بەلکو هەولی ئەوەش دەدات پێشبینی چۆنیەتی سەرهەلدانی دۆخەکە لە داهاتووش بکات. ئەم جۆرە کارانە لە هەوالگری ئەمریکا بە *خەملاندن* ناسراوە. بەتایبەتی، *خەملاندنی هەوالگری نیشتیمانی* بەگرنگترین دامەزراوەی دەزگا هەوالگرییەکانی ئەمریکی دادەنرێت.

ئەم خەملاندنانە دەبێت سەرنجی تەواویان بخرێتە سەر لەم بوارەدا بۆئەوەی بەپشت بەستن بە دۆخی ئێستا بتوانن پێشبینیەکی گونجاو بۆ داهاتوو بکەن. لە ئەمریکادا، ئەم خەملاندنانە لە لایەن ستافێکی تایبەتەوە بەرهەم دێت، بێگومان بەپشتیوانی کۆمەلێک شیکەرەوەی لێهاتوو لەناو

دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەو وڵاتەدا. خەمڵاندنەکان دەبێت بەپشت بەستن بێت لەگەڵ بۆچونی هەموو دەزگا پەیوەندیدارەکان بە کاری کۆمەڵگای هەواڵگرییەوە. هەوڵێکی باش تەرخان دەکرێت بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێک کە هەموویان لەسەری کۆک بن، بەڵام کاتێک ئەمە کردەیی نەبوو، ئەوکات، بێگومان، دەنگی ناڕەزایی لەلایەن بەشێک لەوانەی بەژدارن بەرز دەبێتەوە، بەم شێوەیەش دەکرێت بڕیاردانەکە قورس بێت.

بەپێچەوانەی ئەمریکاوە، خەمڵاندنەکان لە ئیسرائیل لەماوەی کاتی پێش جەنگی "یۆم کاپور"ی ساڵی ۱۹۷۳، هەواڵگری جەنگیی بەتەواوی دەستی بەسەر هەموو بڕیارەکاندا گرتبوو. هەرچەندە دەزگا هەواڵگرییەکانی تر بوونیان هەبوو-دەزگای ناوەندی بۆ هەواڵگریی و ئاسایش (مۆساد)، کە بەنهێنی لە وڵاتە بیانیەکاندا کاری دەکرد؛ شین بێت (Shin Beth)، کە بەرپرسیار بوو لە دژەهەواڵگریی وە دژەسیخوڕیی؛ بەشی لێکۆڵینەوەی نووسینگەی بیانی- تەنیا هەواڵگری سەربازیی دەیتوانی دەستی بە هەموو زانیارییە هەواڵگرییەکان بگات وە بەرپرس بوو لە شیکردنەوە و دابەشکردنی ئەو زانیاریانە بەسەر بەشە پێوستەکانی حکومەتەکەدا. هەروەها، ستافی کابینەی حکومەتی ئەوکات هیچ شارەزایەکی هەواڵگرییان نەبوو، وە هیچ میکانیزمێکیش لەکۆڕێدا نەبوو کە بەهۆیەوە سەرکردایەتی سیاسی ئەرک بۆ هەواڵگری سەربازیی دیاری بکات بۆ ئەوەی خەمڵاندنەکانی لەسەر چەند بابەتێکی تایبەت پێشکەش بکات. ئەم سەرنج خستنە سەر هێزە دواتر بە توندی ڕەخنەی لێگیرا وەک شکستهێنانی هەواڵگری ئیسرائیل بۆ وشیارکردنەوەی حکومەت لە هێرشی میسری

سوری لە جەنگی شەشی ئۆکتۆبەری ١٩٧٣ (ئەم بابەتە تێروتەسەلی لە بڕگەی "شکستی هەواڵگریی" لەم بەشەدا باسکراوە).[i]

## جیاوازیی لەنێو دەزگا هەواڵگرییەکاندا

لەکاتێکدا ئەرکی ئێستا و بنچینەیی هەواڵگریی وەک بەشێکی گرنگ لە پێکهاتە و کاری دەزگای هەواڵگریی هەر نەتەوەیەک دادەنرێت، بەڵام دەبێت ئەوەش بپرسین کە ئایا تا چ رادەدەیەک ئەو خەمڵاندنە لەناو دەزگا جیاجیاکانی ئەو بوارە لە پرۆسەی هەواڵگرییدا یەکگرتوون؟ گرنگی ئەم بابەتە لە نەتەوەیەکەوە بۆ یەکێکی تر وە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر جیاوازە. بۆ نموونە، لە ئەمریکادا، ئامادەکردنی خەمڵاندنەکان وەک سەرەرمی پرۆسەی هەواڵگریی سەیر دەکرێت. لە یەکێتی سۆڤیەتی جارانی ساڵانی سییەکاندا، بەپێچەوانەوە، ستالین ویستی ئەرکی خەمڵاندن لەژێر دەستی خۆیدا بهێڵێتەوە؛ ناوبراو فەرمانی بە دەزگای هەواڵگریی ئەوکات (*NKVD*)[ii] کرد کە بەهیچ جۆرێک خەمڵاندن و هەڵسەنگاندنی خۆیان بۆ نەنێرن دەربارەی نۆخی دەرەوە بەڵکو هەموو سەرنجی خۆیان بخەنە سەر کۆکردنەوەی نهێنیەکان و بەدەستهێنانی زانیاری هەواڵگریی.[iii]

---

[i] Avi Shlaim, “Failures in National Intelligence Estimates: The Case of the Yom Kippur War,” *World Politics* ٢٨, no. ٣ (April ١٩٧٦): ٣٦٨–٦٩.

[ii] دەزگای هەواڵگریی سۆڤیەت لە سەردەمی جۆزێف ستالین، واتە، بەر لەوەی ناوەکەی بگۆڕێت بۆ (KGB). وەرگێڕ

[iii] ستالین لەدوای جەنگی دووەمی جیهانیدا هەڵسا بە دروستکردنی نووسینگەیەکی خەمڵاندنی هەواڵگریی یەکگرتوو لە ترسی سیستەمی ئەمریکا.

ئەم بابەتە لە بەشی شەشەمدا لە پەیوەندی نێوان ئەرکەکانی هەواڵگریی و داڕێژەرانی سیاسەتی حکومەتێکدا بە تێروتەسەلی باسی لێوە کراوە.

## شکستی هەواڵگریی و نۆخی لەناکاو

### جۆرەکانی شکست

***هێرشی لەناکاو*** شکستی هەواڵگریی بۆ خەمڵاندنی نۆخێکی بەدروستی مەترسیەکە کە هاوچەرخە لەگەڵ خودی هەواڵگرییدا. لەم برگەیەدا، ئێمە هەڵدەستین لە لێکۆڵینەوە لە شکستی هەواڵگریی کە تووشی دەزگایەکی هەواڵگریی دەبێت؛ لە بەشی پێنجەمدا، ئێمە لەوە دەکۆڵینەوە کە چۆن شکست دەکرێت بەهۆی قەناعەت پێکردن لەلایەن هەوڵە تەڵەکەبازەکانی دوژمنەوە ڕوویدات.

مەزنترین، وە تێکدەرترین، شکستی هەواڵگریی لەوکاتەدا سەرهەڵدەدات کاتێک هێرشێک ڕوویدات بەبێ ئاگاداری پێشوەختە، وە هێزە سەربازییەکانی نەتەوەیەک لەناکاو هێرشی بکرێتەسەر. لەڕاستیدا، هەروەک پێشتر باسکرا، کۆمەڵگای هەواڵگری ئەمریکا بەشێوەیەکی بەرچاو هەڵساوە بە ڕێکخستنەوە و بەهێزکردنی تەواوی بەشەکانی دەزگاکەی دوای شکستە لەناکاوەکەی هێرشی یابانییەکان لە *پێرل هاربەر* لە حەوتی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤١.

لە لاپەڕەکانی مێژوودا ئەو بابەتانە پڕن کە باس لە سەرکەوتنی هێرشی لەناکاوی نەتەوەیەک دەکەن بۆسەر یەکێکی تر. ئەڵمان لە بیست و دووی حوزەیرانی ١٩٤١دا، هێرشی کردە سەر یەکێتی سۆڤیەتی جاران، هێرشی سوری-میسری بۆ سەر ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٧٣(کە بووە هۆی

هەڵگیرسانی جەنگی یۆم کاپور)، سەرەڕای هێرشی پێرل هاربەر، بریتین لەو کەیسە سەردەمیانەی کە بە زۆری باسیان لێوە دەکرێت لە شکستی هەواڵگرییدا.[i] تەنانەت لەکاتی جەنگیشدا، کاتێک هێزە سەربازییەکان لە ئینزارێکی ئاست بەرزدا بە بەراورد لەگەڵ کاتی ئاشتیدا دەبن، دەکرێت نموونەگەلی بەرچاو لەم ڕووەوە ببینین. نموونەکانیش بریتین لە هێرشی ئەڵمان لە ئاردێنیس(*Ardennes*) لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٤(کە بە جەنگی بولژ"*Bulge*" ناسراوە)، وچوونی چینیەکان بۆ ناو جەنگی کۆریا لە تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠، هێرشی ڤێتنامی باکور و ڤیتکۆنگ(*Vietcong*) بەدرێژایی ڤێتنامی باشوور لە کۆتایی کانوونی دووەمی ١٩٦٨.[ii]

---

[i] Barton Whaley, *Codeword Barbarossa* (Cambridge: MIT, ١٩٧٣); Shlaim, "Failures in National Intelligence Estimates," ٣٤٨–٨٠; Michael I. Handel, *Perception, Deception and Surprise: The Case of the Yom Kippur War* (Jerusalem: Leonard Davis Institute of International Relations, Jerusalem Paper ١٩, ١٩٧٦); Eliot Cohen and John Gooch, *Military Misfortunes: The Anatomy of Failure in War* (New York: Free Press, ١٩٩٠), chap. ٥ ("Failure to Anticipate: Israeli Defense Forces on the Suez Front and the Golan Heights, ١٩٧٣"), ٩٥–١٣١; Roberta Wohlstetter, *Pearl Harbor: Warning and Decision* (Stanford, Calif.: Stanford University Press, ١٩٦٢); Edwin T. Layton, *"And IWas There": Pearl Harbor and Midway—Breaking the Secrets* (New York: Morrow, ١٩٨٥); Gordon W. Prange et al., *At Dawn We Slept: The Untold Story of Pearl Harbor* (New York: McGraw-Hill, ١٩٨١); and, in general, Klaus Knorr and Patrick Morgan, eds., *Strategic Military Surprise: Incentives and Opportunities* (New Brunswick, N.J.: Transaction, ١٩٨٣).

[ii] Harvey de Weerd, "Strategic Surprise in the Korean War," *Orbis* ٦, no. ٣ (Fall ١٩٦٢): ٤٣٥–٥٢, and Eliot Cohen, "'Only Half the Battle':

هۆکاری هەرە سەرەکی ئەم جۆرە شکستە بریتییە لە بەهەڵە خەملاندنی دەزگا هەواڵگرییەکان لە هێرشێک، وە ڕەنگە زۆرجار بشزانن هێرشەکە دەکرێت بەڵام بەهۆی بەهەڵە خەملاندنەوە نازانن لەکوێ و چۆن ئەو هێرشە ڕوودەدات، بەم پێیەش بەهەڵە وەڵامی ئەو هێرشە دەدەنەوە. یەکێک لە نموونە سەرنجڕاکێشەکانی ئەم جۆرەی شکستی هەواڵگری بریتییە لە کاردانەوەی ئەڵمان بۆ جێگیربوونی هێزە هاوپەیمانەکان لە *نۆرماندی* لە بەرواری شەشی حوزەیرانی ١٩٤٤. ئەڵمانەکان بەدڵنیاییەوە پێشبینی هێرشێکیان دەکرد، بەڵام ئەوان زۆر لەوە دڵنیابوون کە هێرشی سەرەکی لەدژی ناوچەی *پا دێ کالێ* (*Pas de Calais*) دەبێت کە ئەوان گاڵتەیان بەوە دەهات هێرش بکرێتەسەر *نۆرماندی* وە بە دەرفەتێکی باشیان زانی هێرشێکی پێچەوانە بکەن، لەکاتێکدا بنکەی لەشکریی لەسەر ڕۆخی دەریادا دەبوایە هێرشی بکرێتەسەر.

***جۆرەکانی تری حاڵەتی لەناکاو*** هەرچەندە هێرشێکی پێشبینی نەکراو دەکرێت زۆرترین زیانی هەبێت بۆ نەتەوەیەک، بەڵام هێرشی لەناکاو تاکە زەرەمەند نییە لەم بوارەدا. بۆ نموونە، ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراوی سیاسیی (وەک گۆڕانکارییەک لە هاوپەیمانەکان یان کودەتایەک کە ببێتە

American Intelligence and the Chinese Intervention in Korea, ١٩٥٠," *Intelligence and National Security* ٥, no. ١ (January ١٩٩٠): ١٢٩–٤٩. On the Battle of the Bulge, see Charles B. MacDonald, *A Time for Trumpets: The Untold Story of the Battle of the Bulge* (New York: Morrow, ١٩٨٥), ١٧–٩٢, and Hinsley et al., *British Intelligence in the Second World War*, vol. ٣, pt. ٢, ٤٠٢–٣٨. For the Tet offensive, see James J. Wirtz, *The Tet Offensive: Intelligence Failure in War* (Ithaca, N.Y.: Cornell University Press, ١٩٩١).

هۆی ڕوخاندنی دەسەڵاتێکی دۆستی بیانیی) دەکرێت وەک شکستێکی جددیی بۆسەر بەرژەوەندی سیاسەتی بیانی نەتەوەیەک لەقەڵەم بدرێت. بەکەمگرتنی کێشە سیاسیەکانی شای ئێران لە ساڵی ۱۹۷۸ و قووڵبوونەوەی بەهێزی ئۆپۆزسیۆنی ئەو وڵاتە لە دژایەتیکردنی دەسەڵاتەکەی یەکێکە لە دیارترین ئەو نموونانەی کە شکستی هەواڵگری ئەمریکا دەردەخەن.

بەهەمانشێوە، غیابی ئاگادارکردنەوەی گۆڕانێکی لەناکاوی گرنگی ئابووریی وەک شکستی دەزگا هەواڵگرییەکان لە پێشبینیکردنی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت لە جیهاندا، یەکێکی ترە لە نموونەی شکستی هەواڵگریی. هەروەک تێبینی کرا، ڕۆڵی هەواڵگریی لە پرسە ئابووریەکاندا کەمتر بایەخی پێدەدرێت وە بەبەراورد لەگەڵ پرسە سەربازیی و سیاسییەکاندا ئاڵۆزترە. بەرزبونەوەی لەناکاوی نرخی نەوت لەساڵی ۱۹۷۳ نموونەیەکە لە ئاڵۆزیی ئەم جۆرە کێشەیە، چونکە هۆکارە گرنگەکانی بریتیین لە هۆکاری ئابووریی(نزمی نرخی نەوتی پێشوو بووە هۆی زیادبوونی بەکارهێنان وە کەمبوونەوەی گەڕان و بەرەوپێشبردنی ئەو کەرتە)، لەکاتێکدا هۆکاری ڕاستەڕاست بریتیی بوو لە سیاسەت(پشتیوانی وڵاتە عەرەبە بەرهەمهێنەرەکانی نەوت بۆ میسر و سوریا لە جەنگی ئۆکتۆبەری ساڵی ۱۹۷۳ی یۆم کایپور).

لەکاتێکدا ئەو کارەساتانەی کە دەبنە هۆکاری شکستێکی مەزن لە جەنگدا ڕوون و دیارن، ئەو ئازارەی کە بەهۆی شکستی پێشبینیکردنی ڕووداوی سیاسیی یان ئابووریی زۆر قورسترن بۆ پێشبینیکردن. لە بەشێکی زۆریدا، ئەمە پشت بەوە دەبەستێ کە ئایا حکومەت ئامادەکرای کردووە بۆ ئەوەی

بەرپەرچی ئەو مەترسیانە بداتەوە کە لێی ئاگادارکراوەتەوە یان نا وە ئایا ستراتیژیەتیان هەبووە کە ڕووداوەکە پێچەوانە بکاتەوە یان هەر هیچ نەبێت زیانی دەرئەنجامەکانی کەم بکاتەوە یان نا.
بۆ نموونە، ڕوون نیە کە ئەمریکا چی دەکرد ئەگەر ئاگاداری بەرزبوونەوە لەناکاوەکەی نرخی نەوت بوایە لەساڵی ١٩٧٣. بەهەمانشێوە، کاری خەملاندنی دروستی کێشە سیاسیەکانی شای ئێران زۆر جیاوازە لەوەی کە چ بڕیارێک دەدرا دەربارەی ڕێگرتن لەو شکستە. سەرکەوتن لە یەکەمیاندا نابێتە هۆی دڵنیایی لە سەرکەوتن لەمەی دواییدا.

***جۆرەکانی تری شکست*** زۆربەی هەرەزۆری کەیسە بەناوبانگەکانی شکستی هەواڵگریی کەم یان زۆر پەیوەندییان بە حاڵەتی کتوپڕەوە هەیە، چونکە بۆچونێکی هەڵەی جیهانی دەرەوەی دەکرێت ببێتە هۆی ناڕەحەتیەکی چاوەڕواننەکراو لە کاتێکی دیاریکراو و بەشێوازێک لە شێوازەکان. (سەرەڕای ئەمەش، چەندین کەیسیش هەیە کە تیایدا، لە ڕێگای هەواڵگری هەڵەوە، سوپایەک یاخود وڵاتێک، بەبێ ئاگاداربوون لە لاوازی دوژمنێک، دەرفەتێکی زێڕینی لەدەستداوە بۆ سوود وەرگرتن لەو نرخە لاوازەی تیایدا بووە. بێگومان لەم جۆرە کەیسانەدا، شکست بوونی هەیە بەڵام "حاڵەتی لەناکاو" نییە). لە هەر کەیسێکدا بێت، بیرۆکەی "حاڵەتی لەناکاو" دەکرێت بوترێت کە سوودمەندترین هۆکار نییە بۆ تێگەیشتن لە هۆکاری شکستی هەواڵگریی.
لەڕاستیدا، هۆکاری سەرەکی شکستی هەواڵگریی بریتییە لە بەهەڵەلێکدانەوەی بارودۆخێک کە دەبێتە هۆی ئەوەی حکومەتێک (یان

هێزە سەربازییەکانی) لە بەرامبەردا چەند کارێک بکات کە گونجاو نین ـ دژە بە بەرژەوەندییەکانی خودی خۆیەتی. ئەگەر ئەم بڕیارە چ بەهۆی بۆچوونی چەند کەسێکەوە بێت بەپشت بەستن بەوە چی قەوماوە ئەو کەمتر جێگای گرنگیی پێدانە بەبەراورد لەگەڵ ئەو ڕاستییەی ـ حکومەتێک یان سوپای وڵاتێک ئەو کارە بکات یان بەردەوام بێت لەسەر ئەنجامدانی شتێکی خەراپ. بۆ نموونە، شکستی سوپای ئەڵمان لە بەهەڵە خەمڵاندنی ئەو وڵاتەوە ڕوویدا لە هەمبەر هاتنی هێزەکانی دوژمن بۆ کەنار دەریای *نۆرماندی* بۆنەوەی غافڵ بن لە هێزەی داگیرکەری "ڕاستەقینە" لە ناوچەی "*پا دی لێ*".[i] بەهەمانشێوە، هۆکاری سەرەکی شکستی چینیەکانی هێزەکانی لە کۆریا لە کانوونی یەکەمی ١٩٥٠ زیاتر بریتیی بووە لە تێنەگەشتین لە خوێندنەوەیەکی باش بۆ ڕێبازی چینی و تاکتیکەکانی وەک لەوەی پەیوەست بێت بە "حاڵەتی هێرشی لەناکاو" هەروەک بەشێوەیەکی گشتی والێکدەدرێتەوە.

سەرەڕای ئەمەش، نموونەگەلی هێرشی لەناکاو خۆی دەبینێتەوە لە شکستی پێشبینیکردنی ئەوەی کە چ کردەوەیەک لەلایەن هێزێکی نەیارەوە دەگیرێتەبەر یان بە چ شێوازێک دەتوانێت بەسەر وڵاتێکدا سەرکەوێت کە بەرگریی دەکات، لە ڕووی ستراتیژیی و تەکتیکیەوە. ئەو وڵاتەی لە هێرشبشدایە، زۆرجار شکستی مەزنی پێدەگات بەهۆی بەهەڵە خەمڵاندنی هێزەکانی ڕکابەر یان تێنەگەیشتن لە هەندێ هۆکاری پەیوەست بەم لایەنەوە. بۆ نموونە، هێرشی هاوپەیمانان بۆسەر پردێک لە شاری *ئارنهێم*(Arnhem)ی هۆڵەندا لە ئەیلولی ١٩٤٤ سەرکەوتوو نەبوو،

---

[i] Handel, "Technological Surprise in War," ١٤–١٥.

ئەمەش بەزۆری بەهۆی شکستی هەواڵگرییەوە بوو، بەهۆی زیادلەپێویست بڕوابەخۆبوون وە شکیردنەوەیەکی لاوازی ئەو زانیارییە بەردەستانە بوو، بۆ درک کردن بەوەی کە دوو بەتاڵیۆنی پڕچەکی ئەڵمانی لەو شوێنەدا ئامادە بوون.[i]

لەکۆتاییدا، ئەو شکستە هەواڵگرییانەی لەسەرەوە گەنگەشەی لەسەر کرا پێکدێت لە تێنەگەیشتنێک کە سەرهەڵدەدات کاتێک لایەنێک یان لایەنی بەرامبەر دەست هەڵدێنێت. جۆرێکی تری شکست بریتییە لە خەملاندنی هەڵەی پرۆسەیەکی بەردەوام یان هەماهەنگیەک کە تیایدا، چونکە هیچ شتێک دیار نابێت بۆ ئاشکراکردنی ڕاستی و دروستی داتخەکە، دەکرێت بۆ ماوەیەکی درێژتر لەهەڵەدا بمێنێتەوە. بۆ نموونە، لە خەملاندنی قەبارەی جبەخانەی ستراتیژی یەکێتی سۆڤیەتی جاران، کۆمەڵگای هەواڵگری ئەمریکا هەم زیادلەپێویست خەملاندنی ئەنجامدا وە هەمیش لە هەیبەتی هێزەکانی ئەو وڵاتەی کەم کردەوە کە بووە هۆی سەرلێشێوانی بۆچونی ستراتیژی ئەمریکا بۆ ماوەی چەندین ساڵی یەک لە دوای یەک.

## هۆکارەکانی شکست

جگە لەو نمونانەی کە تیایدا تایدا بەهیچ شێوەیەک ناتوانرێت زنیاری پەیوەست بەدەست بهێنرێت، شکستی هەواڵگریی ئاماژەیە بۆ ناڕێکی پرۆسەی شیکردنەوەی کە دەبێتە هۆی ئەوەی داتاکان فەرامۆش بکرێن یاخود بەهەڵە لێکبدرێنەوە. هەربۆیە، ئەمە هاوشێوەیە لەگەڵ هەڵەیەک لە هەر بوارێکی تری لێکۆڵینەوەدا. بۆ نموونە، هەڵەیەک لەلایەن

---

[i] Lewin, *Ultra Goes to War*, ٣٤٧_٥١.

دیرۆکڤانێکەوە لە لێکدانەوەی دەقێکی کۆن، کە ببێتە هۆی وەسفێکی نادروستی بۆ بەشێک لە مێژووی ئارکیۆلۆژیا؛ یان هەڵەیەک لەلایەن کەسێکی پسپۆڕ لە بواری کەشوهەوا لە خەمڵاندنی گرنگی سیستەمی فشاری نزم، دەبێتە هۆی پێشبینییەکی نادروست دەربارەی کەشوهەوای ڕۆژی داهاتوو.

سەرەڕای ئەمەش، هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی پرۆسەی شیکردنەوەی هەواڵگریی دەبێتە هۆی سەرچاوەی هەڵەی زیاتر. لەکاتێکدا شیکردنەوەی هەواڵگریی چالاکیەکە کە پەیوەستە بە کەسانی پسپۆڕ و لێهاتوو، کارێکە کە، بەپێچەوانەی کاری ئەکادیمی کەسێکەوە، لەناو دامەزراوەیەکدا ڕوودەدات وە ئەم ڕوودانە بەهۆی چەند هەنگاوێکی تایبەتمەند بەو بوارە دەبێت، بەم پێیەش، ئەنجامی کۆتایی زیاتر بەرهەمی سیستەمێکە نەوەک کەسێک. ئەم بڕگەیە باس لە هۆکارەکانی شکستی هەواڵگریی دەکات، سەرەتا دەچێتە بنج و بناوانی کاری دامەزراوەیی وە دواتر لەو هۆکارانە دەکۆڵێتە کە زیاتر بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەستن بۆ ناوەڕۆکی لێهاتوویی کاری هەواڵگریی.

***بەپاشکۆکردنی هەواڵگریی بۆ سیاسەت*** ئەو ئەگەرەی کە بڕیاردانی هەواڵگریی لێیەوە دروست دەکرێت بۆ بەرهەمهێنانی ئەنجامی مەزن و گەورە لەجیاتی ئەوەی کە بەڵگەیەک هەیە ڕەنگە هۆکاری سەرەکی بێت بۆ هەڵە و نادروستی شیکردنەوەی هەواڵگریی. سەرەڕای ئەمە، ئەمە هۆکاری دەرەکییە بۆ خودی پرۆسەی شیکردنەوەی هەواڵگریی (بە واتایە وا دابنرێت کە شیکەرەوەکە درک بەوە دەکات پێچەوانەی باشترین بڕیاری

خۆی دەوەستێتەوە). بەم پێیە، ئەمە بابەتێکە کە دەکرێت بە بەڕێوەبردنی هەواڵگریی ناوی بنێین؛ ڕێگایەک کە تیایدا هەواڵگریی پەیوەستە بەو سیاسەتانەی کە کاریان بۆ دەکەن؛ ئەمە لە بەشی شەشەمدا بە تێروتەسەلی باسکراوە.

***نەبوونی زانیاریی لە شوێن و کاتی پێویست*** بەپشت بەست بەو ڕاستیەی کە دەزگایەکی مەزن هەڵدەستێت بە کۆکردنەوە و شیکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی، دەکرێت سەرچاوەی زۆربەی گرفتەکانی لە نەبوونی زانیاریگەلێک بێت کە لەناو سیستەمن بۆ ئەوانەی پێویستیان پێی هەیە، کاتێک پێوسیتیان بەو زانیاریانە هەیە. ئەم نەبوونە چەندین هۆکاری هەیە: بۆ نموونە، یاساوڕێسای ئەمنی کە دەبێتە هۆی سنووردارکردنی بڵاوکردنەوەی زانیاری هەستیار، چڵێسی بیرۆکراتی لەو زانیاریانە وە ململانێی دەسەڵات کە تیایدا کۆنترۆڵکردنی زانیاری دەبێتە چەکێک، یان نەبوونی ئاگاداریی لەو نووسینگەیەی داتاکانی تێدایە لە پێویستی ئەو نووسینگەیەی کە پێویستی بەو زانیاریانەیە.
بەهەمانشێوە، دەکرێت گرفتەکە سەرهەڵبدات ئەگەر هیچ نووسینگەیەکی مەرکەزی بەرپرسیارەتی نەبێت بۆ ئەنجامدانی شیکردنەوەکە لە شوێنێکی دیاریکراو وە دەست گەیشتن بە هەموو ئەو زانیاریانەی پەیوەستن بەو بابەتە. لەم بارەدا، لەکاتێکدا نووسینگەی جیاجیا کار لەسەر بەشی جیاوازەکانی کێشە دەکەن، دەکرێت زانیاری هەرە گرنگ فەرامۆش بکرێت ئەگەر گرنگیەکەی تەنیا لە چوارچێوەی داتا بەردەستەکاندا تەسک بکرێتەوە.

بۆ نموونە، شکستی هەواڵگریی پێرل هاربەر لە نەبوونی پەیوەندی بوو لە نێوان هەواڵگری هەمەچەشن وە ئەو بەشە کردارییانەی کە بەژداربوون. دەکرێت هەندێ کێشەی پەیوەندی گەیاندن هەبێت لە نێوان سوپا و فەرماندەی هێزەکانی دەریایی لە شاری هاوای، ڕوون نییە کە کێشەی پەیوەستدار بەم بابەتە هەبووە لە نێوان هەردوو دەزگاکە لە واشنتۆن یان نا. یەکێکی تر لە کێشەکان لەوەوە سەرهەڵدابوو کە نووسینگەیەکی ناوەندیی شیکردنەوە نەبوو لەگەڵ سەرچاوە و بەرپرسیارێتی بۆ شیکردنەوەی هەموو زانیارییە هەواڵگرییەکانی پەیوەست بەم بابەتەوە. لەجیاتی ئەمە، واپێدەچوو کە زانیارییە هەواڵگرییەکان تەنیا لەلایەن چەند کەسێکی کەم هەبوون کە بەڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە کەسانی پلەبالای داڕێژەری سیاسییەوە هەبوو.

***بۆچوونی وەرگیراو*** سەرکەوتنی هەر هەوڵێکی زرنگ(بۆ نموونە، توێژینەوەیەکی زانستی وە شیکردنەوەیەکی هەواڵگریی) دەکرێت بەهۆی هێزی بۆچوونی وەرگیراوەوە چارەسەر بکرێت، کە زۆربەی جار بە "ژیریی ئاسایی" دەناسرێت- ئەو بۆچوونانە دەربارەی بابەتێکن کە بەشێوەیەکی گشتی، بەبێ لێکۆڵینەوەیەکی پێویست، بەڕاست دادەنرێن. لەکاتێکدا بەدڵنیاییەوە ئێمە ناتوانین هیچ بکەین بەبێ ئەم تایبەتمەندییە(ئێمە ناتوانین هەموو ڕۆژێک دووبارە لە بۆچوونێک بکۆڵینەوە یان دووبارە بیری لێبکەینەوە)، پشت بەستن بە بۆچوونی وەرگیراو دەبێتە هۆی مەترسیەکی مەزن کە ئێمە یان بەهەڵە تێی دەگەین یانیش دەکرێت ئەو بەڵگەیە فەرامۆش بکەین کە پێی وایە ڕاستیەکە پێچەوانەکەیەتی.

بۆ نموونە، ژیری ئاسایی لەناو شیکەرەوەکانی هەواڵگری ئەمریکا و دبلۆماتکارەکاندا لە هاوینی ساڵی ١٩٩٠ بریتیی بوو لەوەی کە عێراق کوەیت داگیر ناکات. هەرچەندە وێنەی سەتەلایەت نیشانی دەدا کە قەبارەیەکی زۆر لە بەتالیۆنە سەربازییەکانی عێراقی لەسەر سنووری کوەیت لە کۆتایی تەممووزدا جێگیرکراون، بۆچوونی هەرەزاڵ لەناو کۆشکی سپیدا بریتیی بوو لەوەی کە سەرۆکی عێراق، *سەدام حسێن*، تەنیا مەبەستی ئەوە بووە هەڕەشە لە سەرکردە کوەیتیەکان بکات بۆ دەستگرتن بەسەر بەرهەمهێنانی نەوت لەو وڵاتەوە و بەرزبوونەوەی نرخی نەوت لە بازاڕەکانی جیهاندا. ئەم هەڵسەنگاندنە لەسەر ئەو بۆچوونە ڕۆنرابوو کە عێراق بەهۆی جەنگی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێراندا زۆر شپرزە ببوو لە گرتنەبەری ئۆپەرسیۆنێکی مەزنی سەربازیی کە شتێکی نەکردەیی بوو بۆ نەتەوەیەکی عەرەب بۆ داگیرکردنی وڵاتێکی تری عەرەبی. بەڵام لە دووی ئابدا، عێراق کوێتی داگیرکرد.[i]

وەک نموونەیەکی تر لە هێزی وەرگیراو و بۆتە هۆی شکستی خەمڵاندنی وردی دوژمن، بە وردی لە پێشبینیەکەی بەریتانیان دەکۆڵینەوە لە ساڵانی سییەکاندا کە پڕچەککەردنەوەی ئەڵمان سنووردار دەبێت لە ڕووی قەبارەوە. بەگوێرەی وتەکانی *وێسلی کەی وارک*،

[i] H. Norman Schwarzkopf, *It Doesn't Take a Hero: The Autobiography* (New York: Bantam, ١٩٩٢), ٢٩٣; Bob Woodward, *The Commanders* (New York: Simon and Schuster, ١٩٩١), ٢٠٥–٢٠٨, ٢١٥; and Bruce W. Jensen, *With Friends Like These: Reagan, Bush and Saddam, ١٩٨٢–١٩٩٠* (New York: Norton, ١٩٩٤), ١٧٣–٧٤.

پێشبینی گشتی بەریتانیەکان بریتیی بوو لەوەی کە هێزە چەکدارەکانی ئەڵمان بە ئاستێکی باش بەهۆی پەیمانی *ڤێرسای* پرچەک دەبنەوە بەڵام بەرادەیەک کە تەنیا ببێتە هۆی پاراستنی ئاسایشی نیشتیمانی ئەو وڵاتە. هەربۆیە، هیچ نیازێکی توند لە هەمبەر ئەو وڵاتە پێشبینی نەکرا، ئەمەش بەهۆی ئەو بەڵگانەی لە بەردەستیان بوو لە پەیمانی ڤێرسایەوە. هاوتا لەگەڵ ئەو خەملاندنەی گشتیەی ئامانجەکانی پرچەککردنەوەی ئەڵمانیا لە ئەساسدا سنووردارن وە لە هەمانکاتیشدا تەنیا بۆ مەبەستی بەرگرین، وازانرا کە ئەم هەنگاوەی ئەڵمان بەتەواوی دەتوانرێت چاوەدێری بکرێت، وە ئەگەر زیاد لە پێویست یاساکانی رێککەوتننامەکەی شکاند، ئەوا دەتوانرێت بوەستێنرێت. ئەمە لەبەر چاوی بەریتانیەکان بریتیی بوو لەوەی کە پرچەککردنەوەی ئەڵمان بە هەنگاوی مامناوەندی بەردەوام دەبێت بۆ ئەوەی وەک وڵاتێکی ستانداردی بەهێز دەرکەوێت لە مەیدانی ئەوروپادا و واینیشانبدات سیستەمێکی چاکی چەکی لەبەردەستە. ئەم ئەم بۆچوونە پارێزکارییە لەسەر مەسەلەی پرچەککردنەوە، کە بووە هۆی نیشاندنی تێگەیشتنێکی کەم لە هێزی نازیەکان، دەکرێت بە یەکێک لە زەقترین هەڵەکان دابنرێت لە مێژووی بەریتانیا کە تیایدا هێزی سەربازیی ئەڵمانەکانی داهاتوو بەکەم خەملێنرا.[i]

***حوکمدان لەسەر تێڕوانینێکی نەناسراو لەسەر بنەمای تێڕوانینێکی ناسراو***[ii] ئەو دوو گرفتانەی لەسەروە باسکران بەزۆری لەسەر ئەو شیکردنەوەی

[i] Wesley K. Wark, *The Ultimate Enemy: British Intelligence and Nazi Germany,* ١٩٣٣–١٩٣٩ (Ithaca, N.Y.: Cornell University Press, ١٩٨٥), ٢٢٨–٢٩.

[ii] *Mirror-Imaging*

هەواڵگرییانەدا جێبەجێ دەبن کە پڕن لە یاساوڕێسا و دەستوەردانی کارمەندانی پلەباڵای وڵاتێک. یەکێکی تر لە سەرچاوەکانی هەڵە لە شیکردنەوەی هەواڵگرییدا زیاتر پەیوەستە بە شکستێکی باوی پەیوەستدار بە تێگەیشتنێکی قوڵ کە نەبەستراوەتەوە بە شوێنێکەوە کە تیایدا شیکردنەوەکە ئەنجام دەدرێت. لە کەیسی هەواڵگرییدا، ئەمە بە واتای خەملاندن یان پێشبینیکردنی هێرش و چالاکیەکانی حکومەتێکی بیانی دێت بەهۆی لەیەکچوونی چالاکیەک کە شیکەرەوەکانی هەست دەکەن ئەو (یان حکومەتەکەی) دەبێت هەمان هەڵوێستی پێشووی هەبێت چونکە ئەزموونێکی هاوشێوەی ئەمیان لە پێشدا بینیوە.

بۆ نموونە، شکستی دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل لە پێشبینیکردنی هێرشی سوریا و میسر کە لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٣لە جەنگی یۆم کاپور دەستی پێکرد، دەکرێت بەشێکی هۆکارەکەی بۆ ئەم دیاردەیە بگەڕێتەوە؛ دەزگا هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل وایان نەبینی کە عەرەبەکان جەنگێک بەرپادەکەن کە وابزانن بدۆڕێنن. بۆ نموونە، کەمتر لە دوو مانگ بەر لە سەرهەڵدانی جەنگەکە، موشی *دایان* بە هێزە بەرگرییەکانی ئیسرائیلی ڕاگەیاند کە "هاوسەنگی هێز زۆر لە بەرژەوەندی ئێمەدایە کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئەگەر و ورەی عەرەب بۆ نوێکردنەوەی دەستبەجێی نەیاریی لەگەڵ ئیسرائیل."

ئەگەر سەیرێکی ئەو کاتە بکەینەوە وادەردەکەوێت کە *ئەنوەر ساداتی* سەرۆکی میسر ویستی لە جەنگەکە ئەو گێژاوە بشکێنێت کە بۆتە هۆی بەرەپێشبرنی پەیوەندیەکانی ئیسرائیل و عەرەب وە ئەو نەیکرد، وە لەڕاستیدا، پێی وابوو دەیباتەوە. سەرکەوتنی دەستپێکی

عەرەب (بەتایبەتی کاتێک میسریەکان لە کەناڵی سوێس پەرینەوە وە لەلایەکەی تریشەوە هێزە بەرگرییەکانی ئیسرائیلیان شکست پێهێنا)، هەرچەندە لەسەر ئەرزی واقیع دواتر لە جەنگەکەدا، بووە هۆی وزەیەکی چاک بۆ گێڕانەوەی یەکجارەکی نیمچە دوورگەی سینا. ئەرامۆشکردنی ئەگەری ئەم جۆرە هێرشە توندە پرمەترسیەی میسریەکان، نامۆ بۆ ئەزموونی ئیسرائیل و سوپای ئەمریکا، دەکرێت وەک نموونەیەکی ئەم جۆرە شکستە لەقەڵەم بدرێت.

یەکێکی تر لە فۆرمەکانی ئەم شکستە بریتییە لەوەی کە کاریگەری هەیە بۆسەر توانای خەمڵاندنی زانستی دروست یان پێشکەوتنە تەکنەلۆژیەکان لەناو دامەزراوەی سەربازیی دوژمندا. ئەم نیشانەیە بەوە دەناسرێتەوە کە دەزگایەکی هەواڵگریی نایەوێت هیچ ئەگەرێکی جیددی بگرێتە بەر چاو کە دوژمنێک هەڵساوە بە پەرەپێدانی چەکێک یان ئامێرێک کە دامەزراوەی تەکنەلۆژی و سەربازیی لایەنی بەرامبەر هەر بیریشی لێنەکردۆتەوە، وایانزانیوە ئەو توانایەی نابێت، یان حوکمدانەکەی بۆ ئەوە بابەتە لەسەر بنەمایەکی واقیعی بنیادنەناوە. بێگومان، ئەم جۆرە کارە لە دوژمنێک دەوەشێتەوە کە ئێمە پێمان وایە لەڕووی تەکنەلۆژیەوە پاشکەوتوو و خەراپە.

*ئار فی جۆنز* ئەم دیاردەیە لە گێڕانەوەکەی دەربارەی هەواڵگریی زانستی و تەکنیکی لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانیی باس دەکات. لە کۆتایی راپۆرتێکی هەواڵگریی دەربارەی ڕۆکێتی بالیستی فی ٢، کە ئەڵمانەکان پەرەیان پێدا لە کۆتایی جەنگەکەدا وە یەکەمجار لەدژی لەندەن لە هەشتی ئەیلولی ١٩٤٤ بەکاریان هێنا، جۆن چوار ئەگەری باسکردووە کە دەکرێت

بوونیان هەبێت سەبارەت بە پێشکەوتنێکی تەکنیکی: لەم کەیسەدا، بەریتانیەکان سەرکەوتوون لەم بوارەدا، وە ئەڵمانەکانیش بە هەمان شێوە سەرکەوتن یاخود نا. ئەم دیاردەیە کاتێک دەردەکەوێت کە:

> پسپۆڕانی ئێمە شکست دەهێنن یاخود هەوڵ نادەن، [وە] ئەڵمانەکان سەرکەوتن. ئەمە یەکێکە لە سەرنجڕاکێشترین کەیسەکانی هەواڵگری، بەڵام قورسە بتوانین سەرکەوین بەسەر لادانێکدا کە وەک ئەوە بێت میچمان نەکردبێت، ئەمە نەکردەییە یانیش گەمژانەیە. پسپۆڕانی ئێمە لە خوێندنەوەی پێشکەوتنەکانی ئەڵمانیا چیتر پسپۆڕ نین بەڵکو کەسانی نەشارەزان، وە بەم هۆیەشەوە خەمڵاندنەکانیان گەمژانەبوو بە بەراورد لەگەڵ هەواڵگریی کە هیچ نەبێت توانای ئەوەیان هەیە زیاتر نزیک بن لە نیازەکانی دوژمن.

چارەسەرەکەی (جۆن) بۆ ئەم گرفتە بۆ شیکرەوەکانی هەواڵگرییە کە دەبێت وریای بۆچوونی پسپۆڕانی تەکنیکی بن، لەو کاتەی هەوڵ بدەن سوود لە پسپۆڕییەکەیان وەربگرن:

> لە بۆچوونی هەواڵگرییەوە، دەبێت هەردەم ئەوە لەبەرچاو بێت کە ئامۆژگاریی و ڕاوێژ لە لایەنی بەریتانیەوە بێت نەوەک پسپۆڕە ئەڵمانیەکان. ئەگەر ئەم جیاوازییە بە بەردەوامی لەبەر چاو نەگیرێت، ئەوا خوێندنەوەی هەڵەی زۆر جدی دەکرێن. لە بواری تەکتیکیدا، ناپلیۆن بەباشی هەستی بەم مەترسییە دەکرد: ناوبراو پێی دەوت، "دروست کردنی وێنەی دوژمن." لە بواری تەکنیکیشدا هەمان مەترسیی بوونی هەیە.

## چارەسەری کێشەکانی شکستی هەواڵگری

**شکست چییە؟** شکست بریتییە لە بەهەڵە خەملاندنی ڕووداوێک لەلایەن دەزگایەکی هەواڵگری دیاریکراوەوە کە ڕاپۆرت و شیکردنەوەکانی بە ئاراستەیەکی هەڵە دۆخێک هەڵدەسەنگێنن، ئەمەش سەردەکێشێت بۆ شکستێک لە ئاستی نیشتیمانیی و نەتەوەییدا. زۆربەی جار لە گفتوگۆکانی ئەم جۆرە وادادەنرێت کە ئەدای هەواڵگری دەبێت لەدژی پێشبینیەکی داهاتووی نمونەیی بپێورێت. ئەوە لەیاد دەکرێت کە لە بەشێکی زۆریدا، هەواڵگری لە کێشمەکێشمێکی خوازەیی لەگەڵ سروشت پێک نایەت بەڵکو کێشمەکێشمێکە لەگەڵ نەیارێکی مرۆڤ.

بۆ نموونە، شکستی قوریانیەکە بۆ پێشبینیکردنی هێرشێکی لەناکاو بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی سەرکەوتنی هێرشبەرەکە لەم بوارەدا وێنا دەکات. لە کاری هەواڵگرییدا، ڕکابەرێک زۆربەی جار هەوڵدەدات هەوڵەکانی دوژمنەکەی تووشی بێورەیی بکات بۆئەوەی بە وردی لە دۆخەکە بگات. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، هەموو جۆرە تەکنیەکەکانی هەواڵگری، بە هەڵخەلەتاندنیشەوە، بەکاردەهێنێت. ئەم بابەتە بە تێروتەسەلی لە بەشی پێنجەمدا باسی لێوە کراوە.

بەم پێیە، ناکرێت ئێمە هەڵسین بە بەراوردکردنی تەکنیکی هەواڵگری بە پێشکەوتنەکانی بواری کیمیا. ئەنجامی پێشکەوتن لە بواری لێکۆڵینەوەی کیمیادا، وە بڵاوکردنەوەی زانست بەم پێیە، دەکرێت ئەوە بێت کە کیمیاگەرەکان لەسەرتاسەری جیهاندا ئەنجامی باشتریان لە کارەکانیان دەست دەکەوێت. ناکرێت لە بواری هەواڵگرییشدا هەمان بۆچوون هەبێت؛ پێشکەوتن و بەدەستهێنانی زانیاری ورد لەلایەن دەزگایەکی هەواڵگری

یان بەرپرسە پلەبلاکانی وڵاتێک بەشێوەیەکی گشتی بەو واتایە دێت کە دەزگا هەواڵگرییەکانی دوژمن هەروەک رابردوو بە دروستی کاری خۆیان ئەنجام نەداوە وە لەکارەکەیاندا پاشکەشەیان کردووە. ئەم بێگومان دروستە سەبارەت بە پرسی هێرشی لەناکاو، بەلام بەشێوەیەکی گشتیتر جێبەجێ دەبێت.[1]

شکستی هەواڵگریی وەک شکستی یاری شەترەنج وایە. بۆ ئەوەی پەرە بە تواناکانی یاری شەترەنجمان بدەین، دەبێت ستایلی یاریکردنمان، و جوولە تاکەکەسیەکان، بگۆڕین تا رادەیەک وا کە زۆر قوڵتر بێت لە یاریکەری بەرامبەر بۆ ئەوەی لە جوولەی یاریکردنمان تێنەگات. ئێمەش وەک هاوڵاتی، کێشەی ئێمە نییە بزانین تا چ ئەندازەیەک هەواڵگریی پێشکەوتووە، ئەوەی ئێمە دەمانەوێت تەنیا ئەنجامە، ئەنجامێک کە گەرەنتی سەلامەتی ئێمە بدات لە بەرگرییکردن لەو هەڕەشانەی دوژمنان دەیهێننە سەر وڵاتەکەمان، هەر بۆیە، زۆر گرنگە تەکنیکە هەواڵگرییەکان بگۆڕین نەوەک لەسەر یەک ئاراستە جوولە هەواڵگرییەکان بەردەوامی پێ بدەین.

***چارەسەری دامەزراوەیی*** لەنێو پرپاستترین چارەسەرە دامەزراوەییەکاندا چارەسەرێک کە پێویستی بە دووبارە بنیادنانەوەی چوارچێوەی دامەزراوەیی هەبێت کە تیایدا شیکردنەوەی هەواڵگریی ئەنجام دەدرێت

---

[1] John J. Dziak, *Chekisty: A History of the KGB* [Lexington, Mass.: Heath, Lexington, ١٩٨٨], ٤٨.)

بریتین لە شیکردنەوەی ڕکەبەریی و دامەزراندنی *دامەزراوەیەکی فێڵاوی و پڕ لە تەڵەکە*.[i]

"شیکردنەوەی ڕکەبەریی" بریتییە لە گرتنەخۆی چەند ناوەندێکی جیای شیکردنەوە لەناو حکومەتێکدا، هەریەکەیان مافی ئەوەی هەیە خەمڵاندنی هەواڵگرییەکانی لەسەر بنەمای تێگەیشتنی خۆی ئەنجام بدات. لە پرەنسیپدا، هەر ناوەندێک بەشێوەیەکی یەکسان لەمانە توانای دەستگەیشتن بە داتایان هەیە، جا هەر دەزگایەکی هەواڵگریی ئەم داتایانەی کۆکردبێتەوە. (لە پراکتیکدا، بەهۆی هەستیاریی چەند جۆرێکی زانیاری هەواڵگریی- بۆ نموونە، زانیاریی سەرچاوەی مرۆیی- ئەم دۆخە تا ڕاددەیەک زۆر بەدەستهێنانی قورسە).

هەندێک یان هەموو ئەم ناوەندانەی کە پێکهێنەری سەرەکین، بەشە گرنگەکان و دەزگاکانی حکومەت یان دەزگا سەربازییەکانن وە بەزۆری لەبەر ئەوە بوونیان هەیە کە خزمەتی پێویستیە تایبەتیەکانی هەواڵگریی خۆیان بکەن. بۆ نموونە، لە ئەمریکادا، دەزگای هەواڵگری بەرگریی بەشێکە لە وەزارەتی بەرگریی، وە ڕاستەوخۆ ڕاپۆرتەکانی بەرز دەکاتەوە بۆ سەرۆکی ئەرکان و وەزیری بەرگریی؛ هەر دەزگایەکی سەربازیی خاوەنی فەرماندەیی هەواڵگریی خۆیەتی؛ وە وەزارەتی دەرەوەش نووسینگەی هەواڵگریی و لێکۆڵینەوەی خۆی هەیە.

---

[i] devil's advocate ئەم دەربڕینە لە کاتێکدا بەکاردێت کە کەسێک وانیشان بدات لەگەڵ بۆچوونی کەسی بەرامبەردا نییە تەنیا بۆ ئەوەی درێژە بە گفتوگۆکە بدات بۆ ئەوەی زانیاری زیاتر لێوە چنگ بکەوێت. (وەرگێڕ)

***چارەسەری ئەقڵی***[i] چارەسەریە ئەقڵیەکان ئەو سوودەیان هەیە کە هەموو کارمەندەکان بۆچوونی خۆیان هەبێت بەڵام دەبێت لە ڕێگای بەڕێوەبەرەوە پارفەبکرێن؛ بەڵام ئەمە چارەسەری بنەڕەتی کێشەی شکستی هەواڵگریی ناکات. لەکاتێکدا ڕەنگە بکرێت هەندێ یاسا دابڕێژین کە ببێتە هۆی ڕێنماییکردنمان بۆ شیکردنەوەی دروستی زانیاری هەواڵگریی، سوودیشی هەیە هەوڵ بدەین هەڵە دیارەکان یان کەموکورتیەکان دیاری بکەین کە دەکرێت تایبەتمەندی پرۆسەیەکی شیکردنەوەیی بن، جا چ بەشێوەیەکی گشتی یاخود هەروەک چۆن لە کات و شوێنێکی تایبەتدا هەیە. لە ئەنجامدانی ئەم کارەدا، ئێمە دەتوانین ئاگاداری ئەو خواستە بین وە لەکۆتاییدا هەوڵ بدەین ڕاستیان بکەینەوە. گفتوگۆی پێشووی هۆکارە ئەقڵیەکانی شکستی هەواڵگریی سەیرکردنی ڕووداوی ڕابردوو وە جێبەجێکردنی لەسەر شیکردنەوەی ئێستا بە هەمان پێودانگ وەک هەڵەیەکی گرنگ لەقەڵەمدرا کە دەبێت ڕێگەی لێ بگیرێت. لەکاتێکدا هەر شیکەرەوەیەکی هەواڵگریی موعەڕەزە بۆ ئەم هەڵەیە، هۆکاری کولتوری دەکرێت بۆ کۆمەڵگای هەواڵگری ئەمریکا ببێتە کێشەیەکی تایبەتی. ئەمریکیەکان لە بیروباوەڕدا زیاتر کراوەن لە یەکسانی مرۆڤ لە سەرتاسەری جیهاندا، ڕەنگە یەکێک لە هۆکارەکان ئەوە بێت کە ژمارەیەکی زۆری کۆچبەری وڵاتانی تری لەخۆ گرتبێت لە باکگراوند و کولتور و ئایینی جیاجیا. بەم شێوەیە، شیکەرەوە هەواڵگرییەکانی ئەمریکا زیاتر موعەڕەزن بۆ تێگەیشتن و پێشبینیکردنی کردەوەی

---

[i] Intellectual Solutions

فێرەوەن لەلایەن ئەوانی ترەوە لەسەر بنەمای ئەوەی ئەو کۆچبەرانە چ کارێک دەکەن.

هەربۆیە، کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر کولتور و کۆمەڵگای بیانی هۆکارێکی گرنگە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم هەڵەیە. شارەزایانی ئەم بوارە دەبێت زیاتر هەوڵی فێربوونی زمان و مێژووی وڵاتان بدەن، وە هەوڵی زیاتر بدەن بزانن ئایین و دابونەریتی ئەو وڵاتە لە چ ئاستێکدان.

چالاکی پەنهانی[i] بەتایبەت کاتێک کردەی ناوازە ئەنجام دەدرێت، وەک ڕوخاندنی حکومەتێک یاخود کوشتنی سەرکردەکەی لەناو هزری خەڵکیدا دەمێنێتەوە کە هەواڵگری چییە؛ بۆ کەسانی پرۆفێشناڵ و قوتابیانی ئەم بوارە، مشومڕێکی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی کە هەر بە ڕاستی چالاکی پەنهانی وەک بەشێک لە هەواڵگریی لەقەڵەم بدرێت یان نا. هۆکاری بەرزبوونەوەی ئەم پرسە بریتییە لەوەی کە چالاکی پەنهانی لەو چالاکیانە پێک دێت کە پەیوەستن بە سیاسەتی بیانی نەتەوەیەک، لەکاتێکدا کۆکردنەوە و شیکردنەوە سنووردارە بۆ پێدانی زانیاریی کە لەسەر بنچینەوەی ئەو زانیارییە سیاسەتی ئەو نەتەوەیە دادەڕێژرێت.

## چالاکی پەنهانی چییە؟

چالاکی پەنهان (شاراوە)، لە وشەسازی هەواڵگری ئەمریکادا، بریتییە لەو هەوڵەی کە لەلایەن حکومەتێکەوە دەدرێت بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجێکی دیاریکراوی سیاسەتی دەرەوە بە ئەنجامدانی هەندێ چالاکی نهێنیی بۆ کاریگەریی خستنەسەر ڕەفتاری حکومەت یان سیاسەتێکی بیانی، یاخود سەربازیی، ئابووریی، یان ڕووداوێکی پەیوەستدار بە کۆمەڵگا لە وڵاتێکی بیانیدا. هەروەک لە خودی چەمکەکەوە دیارە، تایبەتمەندی تایبەتی چالاکی پەنهانی بریتییە لەوەی کە حکومەتێک چالاکیەکانی خۆی

---

[i] Covert action

بەشێوەیەکی پەنهان و شاراوە ئەنجام دەدات. سەرەڕای ئەمەش، لێرەدا پرسیاری ئەوە دێتە گۆڕێ کە مانای تەواوی پەنهان چییە، ئەوە لە دۆخێکی بۆ دۆخێکی تر دەگۆڕێت، واتە بەپێی ئەو چالاکییەی ئەنجامی دەدەن.

لە هەندێ کەیسدا، ڕێژەی نهێنیی دەبێت کامل بێت، وە حکومەتەکان هەوڵدەدەن چالاکی بکەن بۆ ئەوەی ناوەڕۆک یان تەنانەت بوونی ئەو جۆرە چالاکیانە بۆ دەرەوە بە نەزانراوی بمێنێتەوە، ▪ چەند کەسێکی کەم و تایبەت ئاگاداری ئەم چالاکیانە بن. بۆ نموونە، دەکرێت ئەمە دروست بێت ئەگەر ئەو چالاکیە شاراوەیە پێک هاتبێت لە یارمەتیدانی کۆمەڵێک پیلانگێڕ بۆ ئامادەسازیی کودەتایەک ▪ وڵاتێکی بیانی بەهۆی بەقاچاغ هێنانی چەک و تفاق بۆناو وڵاتەکە بۆ ئەم مەبەستە. لە کەیسی تردا، خودی چالاکیەکان بۆ ڕای گشتی خەڵک زانراوە، بەڵام حکومەتەکان دەستوەردانی خۆیان تیایدا ڕەتدەکەنەوە. یەکێک لە نموونەکانی ئەم جۆرە بریتییە لە تەمویلکردنی نهێنیی حکومەتێک بۆ ڕۆژنامەیەک یان ڕادیۆیەک کە پشتیوانی سیاسەتەکانی کردووە یان نەیاری دوژمنەکانیەتی. لە کۆتاییدا، دەکرێت چەند جۆرە کەیسێکیش هەبن کە تیایاندا زانیارییەکی بەرچاو دەربارەی ئۆپەراسیۆنەکان بۆ ڕای گشتی خەڵک زانراو بن، بەڵام بەهۆی هۆکاری دبلۆماسیی و چەند هۆکارێکی تایبەتی تر، حکومەتەکان خۆیان بەدوور دەگرن لە دانانان لە بوونی پەیوەندیەکی فەرمی بەم جۆرە چالاکیانەوە.

لە ئەمریکادا، چالاکی پەنهانی بە یاسا کراوە وە بەم شێوەیە پێناسە کراوە، "بریتییە لە چالاکیەک یان چەند چالاکیەکی حکومەتی ویلایەتیە

یەککگرتووەکانی ئەمریکا بۆ کاریگەری خستنەسەر دۆخی سیاسیی، ئابووریی یان سەربازیی لە دەرەوە، لە وڵاتی بەئامنجگیراودا نیاز وایە کە ڕۆڵی [حکومەت] بە هیچ شێوەیەک دیار نەبێت یان بەئاشکرایی دانی پیانەنرێت، بەڵام پێک نایەت لە چالاکی... دژە هەواڵگریی تەقلیدی... دبلۆماسی... سەربازیی... [یان] جێبەجێکردنی یاسا."[i]

بەم پێناسەیەوە بێت، چالاکی پەنهانی جیاکراوەتەوە لە کۆکردنەوەی و ئەنجامی زانیاری هەواڵگریی، ئەمەش بەو واتەیە دێت کە، لەئەمریکادا چالاکی پەنهانی بە دڵی کاری هەواڵگریی دادەنرێت. جیاوازییەکە بریتییە لەوەی کە ئامانجی چالاکی نهێنی بریتیی نییە لە زانین بەڵکو بریتییە لە پێشڤەبردنی ڕاستەوخۆی ئامانجی سیاسەتی دەرەوەی نیشتیمانیی. بەم پێیە، زیاتر ئەو پشت بە ئامرازی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتانی تر دەبەستێت، وەک دبلۆماسیەت یان هێزە سەربازیی، نەوەک چالاکی تری هەواڵگریی.

لەکاتێکدا ئەم پێناسەیە ڕوونە بۆ زۆربەی مەبەستە کردارییەکان، بەڵام بە تەواوی ورد نییە. بۆ نموونە، هەرچەندە یاسا بەتەواوی چالاکی تەقلیدی، دبلۆماسیی، سەربازیی، دژە هەواڵگریی وە جێبەجێکردنی یاسا لە چالاکی نهێنی دەردەخات، نە پێناسەی ئەو چالاکیانە دەکات نە هێڵی لێکجیاکردنەوە لە نێوان ئەم چالاکیانە و چالاکی پەنهانی دیاریدەکات. بۆ نموونە، دبلۆماسیەتیش هەوڵ دەدات کاریگەریی بخاتە سەر ڕەفتاری حکومەت و دەسەڵاتدارانی تر، وە بەزۆری بەشێوەیەکی نهێنیی ئەم کارە ئەنجام دەدرێت؛ بۆ نموونە، زۆربەی جار گرنگە گفتوگۆی نێوان دوو وڵات

---

[i] Intelligence Authorization Act, Fiscal Year ١٩٩١, L. ١٠٢-٨٨, August ١٤, ١٩٩١ [٥٠ USC ٤١٣b].

بە نهێنیی دەهێلرێتەوە لە ولاتانی تر یان بۆ رای گشتیی. ... تەنانەت دەکرێت گفتوگۆ لەگەڵ چەند بەرپرسێکی ولاتێکی دیاریکراوی هەمان حکومەت بە نهێنیی بمێننەوە.

بەهەمان شێوە، "دژە هەواڵگریی تەقلیدی" پێک دێت لە بەکارهێنانی سیخوڕی دووسەرە،[i] هەروەک لە بەشی داهاتوودا باس دەکرێت. لەکاتێکدا ئەم سیخوڕانە تێوەگلاون لە شکستهێنان بە هەوڵەکانی کۆکردنەوەی زانیاریی مرۆیی، وە دەکرێت زانیاری ساختە ببەخشن کە هەڵیدەخەڵەتێنێت، وە دوورنییە ببێتە هۆی گۆڕینی ڕەفتارەکەی. (لە هەر کەیسێکدا بێت، سیخوڕی دووسەرە دەبێت دوژمن هەڵخەڵەتێنێت دەربارەی چالاکی خۆی، وە چالاکیەکانی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری دوژمنەکە گرنگە بۆ کاریگەری خستنەسەر.) لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا ئەو چالاکییە "تەقلیدییە" وەک دژەهەواڵگریی دابنرێت یان چالاکی پەنهانی، وەڵامەکەی ناڕوونە.

هەروەها، دەبێت تێبینی ئەوە بکرێت کە چەمکی "چالاکی پەنهانی" لە بنچینەدا چەمکێکی ئەمریکییە، وە لە چەمکسازیی دەزگا هەواڵگرییەکانی تردا بەکار نایەت.[ii] بۆ نموونە، لە ڕووسیدا چەمکی (aktivnye meropriiatiia) هەیە کە نزیکترین چەمکە لە چالاکی پەنهانی، بەڵام کەمێک فراوانترە- دادەنرێت، واتە، پێک دێت لە هەردوو "تەکنیکی ئاشکرا و نهێنیی کاریگەریخستنە سەر ڕووداو و ڕەفتار لە، وە چالاکیەکانی، وڵاتە

---

[i] double agent

[ii] John Bruce Lockhart, "Intelligence: A British View," in *Approaches to Intelligence*, ed. K. G. Robertson (London: Macmillan, ١٩٨٧), ٣٧, ٤٦.

بیانیەکاندا."[1] بەم پێیە، بە تەواوی نەدەکەوتە ناو چوارچێوەی هەواڵگرییەوە. لەجیاتی ئەمە، لە هەردوو چالاکی سیاسیی بیانی تری حکومەتی سۆڤیەت پێک دەهات (بۆ نموونە، دبلۆماسیەت یە بەکارهێنانی میدیای فەرمی، وە ڕادیۆی مۆسکۆ) یە پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت. ئەم چەمکە زیاتری بۆ ئەو چالاکیانە بەکاردەهات کە سەرنج دەخەنەسەر ئامانجێک-کاریگەریی سیاسیی- نەوەک نهێنیی یان کرانەوەی ئەوا ئامرازانەی بەکاردەهاتن.

بەبێ لەبەرچاوگرتنی بەکارهێنانی چەمکسازیی لەو بوارەدا، گرنگە ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە ئەوەی پێدەوترێت چالاکی پەنهانی لە ئەمریکا تەنیا ئامرازێکی سیاسەتی دەرەوەیە لەنێو چەندین میتۆدی تری هەواڵگریی. بەهۆی تایبەتمەندییە ناوازەکەی و ڕابردووە سەرنجڕاکێشەکەیەوە، سەرنجێکی زۆری خراوەتە سەر، وە بەهۆی نهێنیەکەیەوە، چەند کێشەیەکی تایبەتی هەیە بۆ حکومەتێکی دیموکراتی. بەهۆی ئەو سەرنجەی خستویەتیە سەر شێوازی چالاکیەکە وەک لە ناوەڕۆکی چالاکیەکە، دیبەتیەکە لە ئەمریکا دەربارەی چالاکی پەنهانی بەشێوەیەکی فراوان سەرنجی خستۆتە سەر پرسی یاسایی بوون و کارابوون لەسەر حیسابی پرسە زیاتر گەوهەریەکانی ئامانج و ستراتیژیەتی سیاسەتی دەرەوە.

ئەم بەشە وەک پێکهاتەیەکی هەواڵگریی سەیری چالاکی پەنهانی دەکات کە ئەویش ئامرازێکی سیاسەتی دەرەوەیە؛ لە بەشی شەشەمدا، پرسە

---

[1] Richard H. Shultz and Roy Godson, *Dezinformatsia: Active Measures in Soviet Strategy* (McLean, Va.: Pergamon- Brassey's, ١٩٨٤), ١٩٣.

تایبەتییەکانی پەیوەندیدار بە بەکارهێنانی چالاکی پەنهانی لەلایەن حکومەتە دیموکراتییەکانەوە دەخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بەهۆی ناڕوونی پێناسەکانی کۆن و ئێستای ئەمریکا بۆ چالاکی پەنهانی، باسی داماتووی ئەم بەشە لە چالاکیە زیاتر گشتگیرییەکان دەکۆڵێتەوە وەک لە جۆری چالاکی پەنهانی بۆ ئەوەی سنوورەکانی ڕوون بکەینەوە. بەشێکی زۆری ئەو باسە تایبەت نابێت بە پێناسە دروستەکانی چالاکی پەنهانی لە چوارچێوەی بەکارهێنان و یاسای ئەمریکا.

## جۆر و نموونەکانی چالاکی پەنهانیی

بەشێوەیەکی گشتی، "چالاکی پەنهانی" تەنیا بەو چالاکیانە ناوترێت کە دەبنە هۆی گۆڕینی ڕەفتاری وڵاتێکی بیانیی، یاخود دۆخێکی تایبەتی وڵاتێک، بەڵکو ئەم چەمکە فراوانترە لەمە وە سەردەکێشێت بۆ چالاکی تریش؛ پێدانی هاوکاری تەکنیکی نهێنیی (وەک مەشق و ئامێری ئاسایش و گەیاندن) بە حکومەتێکی بیانی دۆست... هەروەها، کووشتن و هاوکاری کردن یان خۆشکردنی ئاگری کودەتایەک نموونەی بەرزی ئەم جۆرە چالاکیەن. هەربۆیە، قورسە بتوانین لیستێکی فراوانی جۆرەکانی چالاکی پەنهانیی بەدەستەوە بدەین کە دەزگا هەواڵگرییەکان ئەنجامیان داوە. سەرەڕای ئەمەش، دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکا تا ئێستاش هیچ جۆرە لیستێکی ستانداردی ئەم جۆرە چالاکیەی نەخستۆتە ڕێژەڤی هەواڵگرییەوە، تەنانەت ئەوانەی لەم بوارەشدا لێکۆڵینەوە دەکەن بەو دەرئەنجامە نەگەیشتوون. ئەم بڕگەیە هەوڵ دەدات گەشە بەم جۆرە پۆلێنکردن و دەستنیشانکردنی جۆرەکانی چالاکی پەنهانیی بدات.

مەبەستی چالاکی پەنهانیی بریتییە لە کاریگەری خستنەسەر هەنگاوەکانی حکومەتێکی بیانی یان ڕووداوەکان لە وڵاتە بیانیەکاندا. ئەم هەوڵدانانە دەکرێت ئاراستەی حکومەتی وڵاتێک یان بەشێکی ئەو حکومەتە بکرێت. لە وڵاتە دیموکراتیەکاندا، دەکرێت ئەو کاریگەرییە بەخێرایی لەسەر کۆمەڵگای ئەو وڵاتە هەست پێ بکرێت و کاریگەریی جدیی لەسەر دابنێت؛ ئەم جۆرە کاریگەرییە لەو وڵاتە نادیموکراتی یان دیکتاتۆریەکانیشدا دەتوانێت ڕۆڵی خۆی بە شێوەیەکی فراوان بگێڕێت. کاریگەریی خستنەسەر وڵاتە بیانییەکان لە ڕووی ڕەفتاری سیاسیی، نۆخی ئەو وڵاتە، یان ڕووداوەکان کاری سەرەکی سیاسەتی دەرەوەیە؛ دبلۆماسیەت بە ئاراستەی ئەم ئامانجە وەک چالاکی پەنهانی کاری خۆی دەکات. هەروەها، دەکرێت هێزە سەربازییەکان پێشبخرێن یاخود بڵاوەیان پێ بکرێت بۆ ئەوەی کاریگەریی بخەنە سەر ڕەفتاری دەرەکی؛ ئەمە لە کاتی ئاشتیدا شتێکی باوە بەڵام دەکرێت لەکاتی جەنگیشدا کاری خۆی هەر بکات. بەم شێوەیەش، جێگای سەرسوڕمان نییە کە بەشێکی زۆر لە تەکنیکەکانی چالاکی پەنهانی، کە لە خوارەوە باسکراون، دەکرێت بەشێوەیەکی ئاشکراش ئەنجام بدرێن. ئەوەی کە بەچالاکی پەنهانیی دادەنرێت یان دانانرێت، بۆ مەبەستی حکومەتی ئەمریکا، زۆربەی جار کەمتر پشت دەبەستێت بە سروشتی کەیسەکە بەبەراورد لەگەڵ نامۆیی دروستی پێناسە یاسایی و ئیداریەکانی چالاکی پەنهانیی.

## پشتیوانی شاراوەی حکومەتێکی دۆست

لە چەندین کەیسدا، چالاکی پەنهانی لەڕێگای هاوپەیمانیەکی نزیک لەگەڵ کەس یان گروپەکاندا کە لەگەڵیدا هەڵگری هەمان ئامانج و مەبەستن ئەنجام دەدرێت. بێگومان، ئەم کارە ئاسانترە کاتێک هاوپەیمانەکە حکومەتێکی بیانیی دۆستانە بێت. لەم جۆرە نموونەیەدا، دەکرێت چالاکی پەنهانی سنووردار بکرێت بۆ چالاکی ئاسایی وەک هاوکاریکردنی نهێنی نەتەوەیەکی هاوپەیمان بەپێدانی ئاسایشی کەسی بۆ سەرکردەکەی یان چەند کەلوپەلێکی بایەخدار بۆ پەیوەندیەکانی کە بەشێوەیەک بن لایەنی تر پێی نەزانێت.

***هاوکاری نامەوڵکریی*** بێگومان چەند هۆکارێک هەیە بۆیە بەم جۆرە چالاکییە دەوترێت چالاکی پەنهانی یاخود شاراوە. ئەو پشتیوانیەی کە بە حکومەتێکی دۆست دەدرێت یارمەتیدەرێکی باشە بۆ مانەوەی لە دەسەڵاتدا وە بەم شێویەش ئەمە کاریگەرییەکی بەرچاوی دەبێت بۆ سەر ڕووداوەکانی ناو ئەو وڵاتە. هەروەها، هەروەک لە ناوەکەیەوە دیارە، کردارەکە بەشێوەیەکی شاراوە ڕوودەدات، واتە ئەو زانیارییە سەبارەت بە پشتیوانیەکە ناگات بە گوێی خەڵکی ئاسایی و ئاشکرا ناکرێت، وە بەهیچ شێوەیەک حکومەت بەشێوەیەکی فەرمی دداني پیادا نانێت ئەگەر خوانەخواستە زانیاریەکە درەی کرد بۆناو ڕای گشتی خەڵک. وە ئێمەش هەروا بەئاسانی ئەم کردەوەیە دەخەینە ناو پۆلێنکاری فۆرمی دبلۆماسیەتی نهێنیی. لەڕاستیدا، چەمکی "کردەی پەنهان" دەکرێت لەسەر ئەم جۆرە چالاکیە جێبەجێ ببێت تەنیا ئەگەر بێتوو لەلایەن دەزگایەکی

هەواڵگرییەوە بگیرێتەبەرا دابینکردنی پشتیوانی نهێنیی لەڕێگای کەسانی سەربازیی یان دیپلۆماسی سەر بەم شێوازەی کردەی پنەهانیی نییە.
ئەم جۆرە چالاکیانەی بەزۆری لە ڕووی قەبارەوە بچووکن وە جێگای مشتومڕکردن نین، وە هەر لەبەر ئەم هۆکارانەشە کە هەروا بە ئاسانی ناکەونە دەست ڕای گشتی و ڕۆژنامەکانەوە. ئەمە لە هەردوو ڕووی تەکنیکی (بەپێدانی توانابییەک کە حکومەتە دۆستەکە خۆی نەیدەتوانی دابینی بکات) وە هەمیش لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە (وەک ئاماژەیەک بۆ ئەو حکومەتەی هاوکاریەکە وەردەگرێت کە تا چ ئەندازەیەی کاریگەر و پشت پێبەستراوە لەلایەن حکومەتە یارمەتیدەرەکەوە) گرنگیەکی زۆری هەیە. سەرەڕای ئەمە، مەرج نییە هەمیشە ئەوانەی باسکران حاڵەتی سەرەکی بن. بەر لە هەرشتێک، هەمان گەنگەشە دەربارەی ئەوەی چ حکومەتێک دەبێت بە دۆست دابنرێت وە شایانی ئەوەی پشتیوانی بکرێت لە کەیسی پشتیوانی بیانی ئاشکرا لەقەڵەم دەدرێت نەوەک لە کردەی شاراوە. ئەو نهێنیەی لەو کردەیەدا بەژدارە ناتوانێت سروشتی ئەو جۆرە ناکۆکیان بگۆڕێت، هەرچەندە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی لایەنی ناحەز بەرنامەیەک دابنێت بۆئەوەی گومان بکات کە ئەمە بەشێوەیەکی سەرەکی لەبەر ئەوە بە نهێنی هێڵڕاوتەوە نەوەک تووشی هەر جۆرە بەرەنگاریەک ببێتەوە.
دووەم، هەمان ناکۆکی و گەنگەشە لە سروشتی پشتیوانیەکە سەرهەڵدەدات، بەتایبەتی ئەگەر وەرگرەکە سومعەیەکی باشی نەبێت.[i] بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٧٤ کۆنگریسی ئەمریکا بەکارهێنانی پشتیوانی دارایی

---

[i] Victor Marchetti and John D. Marks, *The CIA and the Cult of Intelligence* (New York: Knopf, ١٩٧٤), ٢٣٤.

بیانی بۆ مەشقی پۆلیس قەدەغەکرد؛ ئەم بڕیارە بۆیە دەرکرا چونکە مشتومڕێکی زۆر هەبوو دەربارەی تۆماری مافەکانی مرۆیی ڕژێمەکانی ئەمریکا لاتینی کە وەرگری ئەم جۆرە هاوکاریانە بوون.

**پشتیوانی هەواڵگریی** ئەمە یەکێکی ترە لە جۆرەکانی پشتیوانی بۆ حکومەتێکی بیانی دۆست: واتە، حکومەتی هاوکاریکەر هەڵدەستێت بە پێدان یان هاوبەشی پێکردنی چەند زانیاریەکی هەواڵگریی تایبەت. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەم چالاکییە شتێکی ئاسایی و ڕۆتینییە، وە لە چوارچێوەی چالاکی پەنهان هەژمار ناکرێت. لەو جۆرە کەیسانەی کە پێویست دەکات زانیاریەکان ئاڵوگۆڕ بکرێن لەنێوان هەردوو لادا، کە تیایدا مەبەستی پێدانی زانیاری بە حکومەتی تر بریتییە لە وەرگرتنی زانیاری پێویست و بەهادار لە بەرامبەردا، بۆ ئێمەی نووسەر زیاتر وا دەردەکەوێت کە ئەم جۆرە چالاکیە بچێتە خانەی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی نەوەک چالاکی پەنهانی.[i]

لە حاڵەتی تردا، کە تیایدا ئاڵوگۆڕەکە یەکلایەنەیە، هاندەری سەرەکی لایەنی زانیاری پێدەر بریتییە لە ئارەزووی هاوکاری کردنی حکومەتی تر. لەم کەیسەدا، دەکرێت ئەمە وەک پشتوانی شاراوەی حکومەتێکی دۆستانە لەقەڵەم بدرێت، چونکە وا لە حکومەتێکی تر دەکات بتوانێت ئامانجەکانی

[i] covert action

بپێکێت کە بەتەنیا نەیدەتوانی پێیان بکات، و بێگومان ئەمە بە نهێنی بەردەوام دەبێت.[1]

لەکاتێکدا زانیاری هەواڵگریی تەنیا لەگەڵ حکومەتە دۆستانەکاندا هاوبەشی پێدەکرێت (بە واتایەکی تر، ئەو لایەنەی کە زانیارییە هەواڵگرییەکە دەبەخشێت وای دەبینێت کە ئەمە لە بەرژەوەندی خۆشیەتی)، چەند کەسێکی تریش سەرهەڵدەدەن کە تیایدا حکومەتێک زانیاری تایبەت بە حکومەتێکی تر دەدات کە بە دۆستانە لەقەڵەم نادرێت بۆ ئەوەی ببێتە هۆی قایل بوونی ئەوەی تریان بۆ ئەوەی هەنگاوی تایبەت بنێت لەبەرژەوەندی هەردوولادا.

## کارتێکردنی تێگەیشتنی حکومەتێکی بیانی

بەپێچەوانەی ئەو حاڵەتەی لە سەرەوەدا باسکرا، کە تیایدا حکومەتێک دەیەوێت پشتیوانی حکومەتێکی بیانی بکات کە پێی وایە لە بەرژەوەندی هەردولادایە، تایبەتمەندی باوی تری چالاکی پەنهان هەوڵدەدات کاریگەری بخاتە سەر تێگیشتنی لایەنێکی تایبەت بۆ ئەوەی بتوانێت دۆخ، ڕەفتار و ڕووداوەکانی حکومەتێکی بیانی بگۆڕێت بۆ ئەوەی بەرژەوەندیەکانی خۆی بەرەو پێشەوە بەرێت. ئەم کارە یان بەهۆی کاریگەری خستنەسەر کردەیەکی حکومەتێکی بیانیی یان کاریگەریی دانان لەسەر کۆمەڵگا، گروپ یان سێکتەرەکانی بیانیی ئەو وڵاتە. ئامانجی سەرەکی لەم هەنگاوانە

[1] U.S. Senate, Select Committee on Intelligence, *Nomination of Robert Gates to Be Director of Central Intelligence: Hearings*, ١٠٢d Cong., ١st sess., ١٩٩١, S. Hrg. ١٠٢-٧٩٩ I, ٥٧٨–٧٩, ٩٤٥–٥٠.

بریتییە لە کاریگەریی دانان لەسەر سیاسەتی حکومەتێک یان بۆ دروستکردنی زەمینەسازیی گۆڕینی حکومەتێک.

**هەواڵدۆزی کاریگەریی**[i] ئاسانترین و ڕاستەوخۆترین میتۆدی کاریگەری خستنەسەر کردەوەکانی حکومەتێکی بیانیی بریتییە لە بەکارهێنانی هەواڵدۆزی کاریگەریی- کەسێک کە ئەرکەکەی بریتییە لە کاریگەریی دانانی ڕاستەوخۆ لەسەر سیاسەتی حکومەتێک نەوەک هەڵسێت بە کۆکردنەوەی زانیاریی. لەبەر ئەوەی هەواڵدۆزێک کە بەرپرسێکی پلەباڵایە لە حکومەتێکی تردا لە پێگەیەکدا بۆ ئەنجامدانی هەردووکیان، ئەم جیاکارییە دەکرێت زیاتر تیۆریی بێت وەک لەوەی پراکتیکی. لەم جۆرە کەیسانەدا، بەکارهێنانی هەواڵدۆزێک کە ئەرکی سەرەکی بریتیی بووە لە کۆکردنەوەی زانیاری بۆ کاریگەریی دانان لەسەر سیاسەتی حکومەتەکەی ناکرێت وەک چالاکی شاراوە یان پەنهان لەقەڵەم بدرێت. سەرەڕای ئەمەش، دەزگایەکی هەواڵگریی دەکرێت ئاواتەخواز نەبێت بەوەی سەرچاوەیەکی باش بخەنە مەترسییەوە بە بوونی ئەوە کەسەی کە هەواڵ بدات کاریگەریی دابنێت لەسەر حکومەتەکەی خۆی ئەگەر، بە ئەنجامدانی ئەم کارە، دەکرێت خودی خۆی ببێتە کەسێک مەترسیدار و سەرنجی دەزگاکانی هەواڵگریی بۆ سەر خۆی ڕابکێشێت.

هەواڵدۆزی کاریگەریی دەکرێت کارمەندێکی حکومەتی ئامانج بێت یان ئەندامێکی دیاری داڕێژەری سیاسەتی ئەو وڵاتە بێت کە دەتوانێت بە ئاسانی دەستی بگات بە دەسەڵاتداران، سەرکردە پلەباڵا یان دەزگا

---

[i] Agent of Influence

میدیاییەکانی ئەو وڵاتە. ئەگەر ئەو هەواڵدۆزە کارمەندێکی پلەبەرز بێت لە حکومەتی ئامانجدا، ڕەنگە هەر بەخۆی بتوانێت چەند هەنگاوێک بنێت کە سوود بە حکومەتێکی تر بگەیەنێت. تا حکومەتی ئامانج زیاتر دیکتاتۆر بێت، ئەو هەواڵدۆزە زیاتر دەتوانێت قەناعەت بە هاوکارەکانی بێنێت کە پەیڕەوی جۆرە سیاسەتێک بکەن کە سوود بە بەرژەوەندییەکانی حکومەتێکی تر بگەیەنێت. ڕوونە کە ئەو کەسە بەئاشکرایی ناتوانێت کارەکانی ئەنجام بدات، ئەگەرنا سەرئەنجامی ئەو هەواڵدۆزە دەکەوێتە بەر دنوکی شمشێری تیژی ئەو حکومەتەوە؛ دەبێت ئەو کەسە ئامانجی ئەوە بێت کاریگەری خۆی بخاتە سەر تێگەیشتنی هاوکارانی لە بارودۆخی سیاسییدا بەڕێگایەک کە بەشێوەیەکی سروشتی ببێتە هۆی سوود گەیاندن بەو حکومەتەی کە کاری بۆ دەکات.

بۆ نموونە، هەواڵگری سۆڤیەت لە ساڵانی سی و چلەکاندا ژمارەیەک لە هەواڵدۆزی بەکارهێنا کە بۆ حکومەتی ئەمریکا کاریان دەکرد.[i] لەنێو گرنگترین ئەو هەواڵدۆزانەدا، *هاری دیکستەر وایت* (Harry Dexter White) یەکێک بوو لەوانە کە لە وەزارەتی خەزێنەی ئەمریکادا کاری دەکرد. ڕێک لە کاتێکی گونجاودا، *هاری* بوو بە یاریدەدەری جێگری سکرتێری گشتی ئەو وەزارەتە، کە دووەم بەرزترین پلە کارگێڕییە لەو وەزارەتەدا. سەرەڕای پێدانی زانیاری و نهێنی بە هەواڵگری سۆڤیەت، *هاری* وەک هەواڵدۆزی کاریگەرییش چالاکی ئەنجامدەدا. بەم شێوەیەش، لە ئامادەکاری بۆ کۆنفرانسی *یالتا* (Yalta)ی نێوان *ستالین*، *ڕۆزڤێلت*، وە

---

[i] John Earl Haynes and Harvey Klehr, *Venona: Decoding Soviet Espionage in America* (New Haven, Conn.: Yale University Press, ۱۹۹۹), chaps. ٥–٧.

چێرچل لە شوباتی ١٩٤٥، *هاری* هەڵسا بە نووسینی ڕەشنووسی پرۆپۆزالی وەزارەتی خەزێنە بۆ پێدانی قەرزێکی درێژخایەنی سی و پێنج ساڵی کەم سوو لەگەڵ بیست ملیار دۆلاری قەرەبووی پێشبینیکراوی جەنگی ئەڵمانەکان. لەگەڵ ئەمەشدا، *هاری* هانی ئەوەیدا کە توانای پیشەسازییەکانی کیمیایی و ئەلیکترۆنی ئەڵمان بە تەواوی پەک بخرێن. دواتر چەند ڕێگرییەک بۆ هەوڵەکانی *هاری* لەلایەن وەزارەتی دەرەوە دروست کرا. لە کۆتاییدا، هیچ قەرزێکی مەزن بە ڕووسیا نەدرا، و پیشەسازیی ئەڵمانیش لە هەردوو بواری ئەلیکترۆنی و کیمیاییدا هەر وەک خۆی مایەوە. سەرەڕای هەوڵە بەربەستەکانیش، بەڵام *ڕۆزفێلت*، بە پێشنیارەکانی *هاری* قایل بوو، وە دژی ویستەکانی *چێرچل* وەستایەوە، بەم پێیەش، پشکێکی زۆری بژاردنەوەی جەنگی ئەڵمانەکان بەر ڕووسیا کەوت.[i]

*ئارنێ تریهۆلت*، کارمەندێکی وەزارەتی دەرەوەی نەرویجی، یەکێکی ترە لە نموونەکانی هەواڵدۆزی کاریگەریی کە بۆ ماوەی زیاتر لە یەک دەیە لە ماوەی جەنگی سارددا وەک سیخوڕێکی سۆڤیەت لەو وەزارەتە کاری دەکرد. بەبەکارهێنانی چەندین ئەرکی جۆراوجۆر لەناو وەزارەتەکە و نەتەوەیەکگرتووەکاندا، ناوبراو (هەرکات دەرفەت هەبوایە) هەوڵدەدات سیاسەتی وڵاتەکەی یان بگۆڕێت یان هەرهیچ نەبێت کەمتر کاریگەریی هەبێت بەشێوەیەک کە سوود بە بەرژەوەندیەکانی یەکێتی سۆڤیەت

[i] Christopher Andrew and Oleg Gordievsky, *KGB: The Inside Story of Its Foreign Operations from Lenin to Gorbachev* (New York: HarperCollins, ١٩٩٠; Harper- Perennial edition, ١٩٩١), ٢٨٠–٨٢, ٣٣٤–٣٧.

بکەیەنێت. بۆ نموونە، هەر لەسەرەتای پیشەکەیدا، ناوبراو پێگەیەکی ناراددەیەک دیار و بەرچاوی پێدرا لە کۆنفرانسەکانی دەریایی بە ئەندامێک بوو لە نوێنەرایەتی دانوسانکاری نەرویجی لەگەڵ مۆسکۆ لەمەڕ سنوورەکان و یاساکانی ڕاوکردنی ماسیی لە دەریای *بارێنتس*. بەپێی یەکێک لە گێڕانەوەکان، "*تریهۆلت* نەک تەنیا دەزگای هەواڵگری سۆڤیەتی ($KGB$) بەتەواوی لە پێگەی دانوستانی نەرویجی ئاگادارکردەوە بەڵکو وەک هەواڵدۆزی کاریگەرییش لە تیمی دانوسانکاری نەرویجی کاری کرد،" بە یارمەتیدانیان بە ڕێککەوتنێک کە "کە بەتووندی لەناو نەرویج ڕەخنەی لێگرا بەهۆی ئەوەی زۆر لە بەرژەوەندی سۆڤیەتدا بووە." بەشێوەیەکی گشتیتر، *تریهۆلت* پێگە جیاجیاکانی خۆی بەکارهێنا لەناو وەزارەتدا بۆ بەرەپێشبردنی سیاسەتگەلێک-وەک چەکی ناوەکی *تورنیک*- کە هاوتا بوون لەگەڵ هەوڵەکانی سۆڤیەت بۆ لاوازکردنی پەیوەندیەکانی نەرویج بە ڕێکخراوی پەیمانی باکوری ئەتلانتیک($NATO$). *تریهۆلت* کاریگەریەکی باشی هەبوو لە مامەڵەکردن لەگەڵ میدیای نەرویجی، بە بەکارهێنانی پەیوەندیەکان لە ڕاگەیاندندا بۆ هاندانی هەڵبەستنی چیرۆکگەلێک کە لەدژی ئەمریکا و ناتۆدا بوون. کاتێک لە ساڵی ١٩٨٤دا دەستگیرکرا، ناوبراو بەرپرسی ڕۆژنامەگەری وەزارەت دەرەوە و نووسینگەی زانیاریی بوو.[i]

یەکێکی تر لە نموونە دیارەکانی هەواڵدۆزی کاریگەریی لە جەنگی ساردا کە ئەندامی حکومەتەکە نەبوو بریتییە لە *پییەر چارڵس پاسی*. ناوبراو لە ساڵی ١٩٧٩ بەتۆمەتی سیخوڕیکردن بۆ یەکێتی سۆڤیەت تۆمەتبارکرا وە

---

[i] Andrew and Gordievsky, *KGB: The Inside Story*, ٥٦٨–٧١.

بۆماوەی پێنج ساڵ زیندانیی بۆ برایەوە. وەک کەسێکی سیاسیی ناوەوە (The insider)ی ئەو حکومەتە، ناوباو زانیارییەکی بەرچاوی هەبوو دەربارەی سیاسەتە باڵاکان لە پاریس و ژیانی تایبەتی کەسایەتییە سیاسییە دیارەکانی ئەو وڵاتە، هەرچەندە دەستی بە زانیاری نهێنیی نەدەگەیشت. سەرەڕای ئەمەش، واپێدەچێت کە تاوانە ڕاستەقینەکەی سیخوڕیی نەبووبێت بەڵکو ئەوە بووبێت کە وەک هەواڵدۆزی کاریگەریی ڕۆڵی خۆی لە سیاسەتی ئەو وڵاتەدا گێڕابێت.

سروشتی پەیوەندییەکە لە نێوان دەزگایەکی هەواڵگریی و هەواڵدۆزێک بەگوێرەی باروتۆخەکان دەگۆڕێت. لە کەیسێکی وەک پێیردا، کە ڕۆژنامەنووسێکی پێشکەوتوو وە کەسێکی سیاسیی ناو حکومەتێک بوو کە هاوسۆزیەکەی بۆ یەکێتی سۆڤیەت وای لێکردبوو هەموو زانیاریەکانی بەنهێنیی بۆ دەزگای هەواڵگریی ئەو وڵاتە ڕەوانە بکات.

بێگومان جۆر و وەزیفەی هەواڵدۆزی کاریگەریی لە دەزگایەکەوە بۆ دەزگایەکی تر دەگۆڕدرێت. یەکەم، "پەیوەندی متمانەپێکراو"- واتە، کەسێک خۆی بیەوێت لەگەڵ حکومەتێکی بیانیی کاربکات بە نیازی بەرەوپێشبردنی ئامانجەکانی ئەو دەزگایەی کە ئامانج و بەرژەوەندیەکانیان یەکدەگرنەوە بەڵام لە هەمانکاتدا ڕێنمایی لەو دەزگایە وەرناگرێت وە بەهیچ شێوەیەکیش لەلایەن دەزگاکەوە پارەی پێنادرێت. ئەمە ڕێک پێچەوانەی ئەو هەواڵدۆزەیە کە پێی دەوترێت "کۆنترۆڵکراو" کە فەرمانی ڕاستەوخۆ وەردەگرێت و پاشان جێبەجێیان دەکات، و بێگومان پارەشی بۆ دابین دەکرێت. جۆری سێیەمیشیان بریتییە لەو کەسەی کە بەکارهێنراوە بۆئەوەی بەشێوەیەک کاربکات کە سوودی بۆ

بەرژەوەندییەکانی حکومەتێکی بیانی هەبێت بەڵام خودی خۆی لەم بەکارهێنانە بێئاگایە- ئەم جۆرە بەزۆری بەهۆی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و هاوکاریەکان بەدەست دێت.

***بەکارهێنانی زانیاریی و زانیاری هەڵخەڵەتێنەر*** یەکێکی تر لە میتۆدەکانی کاریگەریی خستنەسەر کردەوەکانی حکومەتێک بریتییە پێدانی زانیاری (یان زانیاری هەڵخەڵەتێنەر) بۆ قایلکردنی ئەو حکومەتە بۆ ئەوەی بەشێوازی ویستراو رەفتار بکات. یەکێک لە نموونەکانی ئەم جۆرە بریتییە لەو کەیسەی کە ئەمریکا لەساڵی ١٩٨٣دا چەند زانیارییەکی تایبەتی بۆ خومەینی نارد دەربارەی "سیخورەکانی سۆڤیەت و هاوکارەکانیان لەناو ئێران." ئەمە بووە هۆی گرتن و کوشتنی زیاتر لە دووسەد کەس وە داخستنی پارتی شیوعی *تودەی* ئەو وڵاتە، کە بووە هۆی شکستێکی مەزن بۆ ئۆپەراسیۆنەکانی ($KGB$) و کاریگەریی سۆڤیەت لە ئێران. بەپێی راپۆرتەکان، ئەمریکا ئەو زانیارییە لەوکاتەدا دەستکەوتووە کە دبلۆماتکارێکی سۆڤیەت لە تەهران بەناوی ***ڤلادیمێر*** کوزیچکین لە ساڵی ١٩٨٢ بەرەو بەریتانیا هەڵاتووە؛ ناوبراو ئەفسەرێکی دیاری دەزگای ($KGB$) بوو... کە ئەرکی سەرەکی بریتیی بووە لە بەردەوامیدان بە پەیوەندیەکان لەگەڵ پارتی *تودە*."[i]

---

[i] Bob Woodward, "CIA Curried Favor with Khomeini, Exiles," *Washington Post,* November ١٩, ١٩٨٦, A١, ٢٨. The defection was reported in "Soviet Diplomat in Iran Defects and Flees to Britain," *New York Times,* October ٢٤, ١٩٨٢, A١٤.

هەرچەندە لەم کەیسەدا وەک دیارە *سی ئای ئەی* لەم چالاکیەدا بەژداربووە، هیچ پێویستی بە کەناڵی هەواڵگریی نەدەکرد کە بەکاریهێنێت بۆ پێدانی ئەم جۆرە زانیارییە. نەبوونی هەر جۆرە دەزگایەکی هەواڵگریی لێرەدا، ئەم جۆرە چالاکییە وەک چالاکی پەنهانی لەقەڵەم ناسرێت، هەرچەندە سروشتی ئەو چالاکییە لە گەوهەردا هەمان شتن. یەکێک لە نموونە مێژووییەکانی ئەم جۆرە چالاکییە، نموونەیەک کە بەهیچ شێوەیەک ناچێتە قاڵبی چالاکی پەنهانیی، بریتییە لە هەوڵی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا *ویسنتۆن چێرچل* لە نیسانی ١٩٤١دا بە ئاگادارکردنەوەی یەکێتی سۆڤیەت لە هێرشێکی چاوەڕوانکراو لەلایەن ئەڵمانەکانەوە.

لەژێر بارودۆخی ئەوکاتدا، ئاسانە کە تێبگەین بۆچی *ستالین* گومانی لە چێرچل هەبووە. *ستالین* بەهۆی دووڕوویی ئینگلیزەکانەوە بەدڵنیاییەوە لەوە تێگەیشتبوو کە ئەمە لە بەرژەوەندی بەریتانیادایە بۆ پەیوەندییەکانی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەڵمانیا کە تا دێت خەراپتر بێت. دەکرێت *چێرچل* ویستبێتی کە ڕێوشوێنە بەرگرییەکانی سۆڤیەت لە ئەنجامی پەیامەکەی ئەوەوە لەلایەن ئەڵمانیاوە وە هەڕەشەیەک بە هەڵە لێک بدرێتەوە، وە بەم پێیەش زیاتر ببێتە هۆی وروژاندنی ڕێوشوێنە سەربازییەکانی ئەڵمان بەدرێژایی سنووری سۆڤیەت. لە ئەنجامدا، *ستالین* ئەم ئاگادارکردنەوەیەی بەریتانیای وەک فێڵێکی بەرنامەبۆداڕێژراو بینی و فەرامۆشی کرد.

لەکاتێکدا ئەو دوو نموونەوەی لە سەرەوەدا باسکران زانیاری دروست بوون کە بە لایەنی بەرامبەر دران، هیچ هۆکارێک نییە بۆچی زانیاری هەڵخەڵەتێنەر، تا ئەو ڕاددەیەی قابیلکەر بن، بۆ هەمان مەبەست

بەکارنەهێن. بۆ نموونە، لەکاتی جەنگی ڤیێتنامدا، ئەمریکا هەوڵیدا جۆرە بیرکردنەوەی دروست بکات کە بزووتنەوەی گەریلایی دژە شوعیەت لە باکووری ڤیێتنام خەریکی تۆپەراسیۆنن. مەبەست لەم کارە بریتیی بوو لەوەی وا لە باکوور بکات گومانیان لە چوستی و کارایی دەزگا ناوخۆییە ئەمنیەکانی خۆی هەبێت.[i]

یەکێکی تر لە تەکنیکەکانی بۆ پروپاگەندەی زانیاری فریودەر پێی دەوترێت "ساختەکاری بێدەنگ،"[ii] کە پێک دێت ساختەکردنی بەڵگەنامەیەک کە بەشێوەیەکی تایبەت بە حکومەتێکی بیانی دەدرێت بەڵام دەزگا راگەیەنەکانی لێ ئاگادار ناکرێتەوە. حکومەتە بەئامانجگیراوەکە لە باشترین حاڵەتدا بە بەڵگەنامە ساختەکە قایل دەبێت وەک بەڵگەنامەیەکی ئەسڵی دایدەنێت وە لە مەسەلەکە ناکۆڵێتەوە.

یەکێک لە نموونەکانی ئەم تەکنیکە، نموونەیەک کە شکستی هێنا چونکە حکومەتە بەئامانجگیراوەکە لەڕاستیدا لیکۆڵینەوەی خۆی ئەنجامدا، بریتییە لە بەسەرهاتی *لادیسلاف بیتمان*، سیخوڕی جارانی دەزگای هەواڵگریی وڵاتی چیک. ناوبراو دەگێڕێتەوە کە لە ساڵی ١٩٧٧دا سۆڤیەتیەکانی یاداشتنامەیەکی ساختەیان ئامادەکرد، لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تەهران، وە ئامادەیان کرد بۆ ئەوەی بینێرن بۆ باڵیۆزخانەی میسر لە شاری بەلگرادی پایتەختی سربیا. یاداشتەکە مۆرێکی "زۆر

---

[i] Richard H. Schultz Jr., *The Secret War against Hanoi: Kennedy's and Johnson's Use of Spies, Saboteurs, and Covert Warriors in North Vietnam* (New York: HarperCollins, ١٩٩٩), ١٣٠–٤٨, ١٦٢–٦٣.
[ii] silent forgery

نهێنیی" لێدرا، کە لە ناوەڕۆکەکەیدا هاتبوو ئەمریکا، ئێران، وە سعودیە بەتەمان ئەنوەر ساداتی سەرۆکی میسر لەسەر دەسەلات لابدەن. چالاکییە نهێنییەکە شکستی هێنا کاتێک حکومەتی میسری بە فەرمی داوای لە واشنتۆن کرد ئەم بەڵگەنامەیە پشتڕاست بکاتەوە وە لەئەنجامدا وە لە زووترین کاتدا وەڵامی درایەوە کە ئەو یاداشتنامەیە ساختە بووە.[i] پێدانی ئەم جۆرە زانیارییە هەڵخەڵەتێنەرانە دەکرێت ئاراستەی دەزگایەکی هەواڵگریی دیاریکراو بکرێت نەوەک حکومەتێک بەشێوەیەکی گشتی. لەم کەیسەدا، پێدانی زانیاری هەڵە، لەجیاتی ئەوەی بدرێت بە حکومەتی ئامانج، هەروا بە ئاسانی کەوتە دەستی دەزگا هەواڵگرییەکان بۆئەوەی لێی بکۆڵنەوە و ڕاستی و دروستی بەڵگەنامەکە ئاشکرا بکەن؛ هەر بۆ نموونە، خۆ دەکرێت پەیوەندیەکی تەلەفۆنی بەئەنقەست بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ کەسێکی پلەباڵا لەناو دەزگایەکی حکومەتدا پێک بهێنرێت تەنیا بۆ ئەوەی دەزگا هەواڵگرییەکانی بەرامبەر گوێبیستی بن. ئەم جۆرە زانیارییە ساختەیە پێی دەوترێت "ئۆپەراسیۆنی لەخشتەبردن"[ii] وە زیاتر وەک بەشێک لە دژەهەواڵگریی لەقەڵەم دەدرێت نەوەک چالاکی پەنهانی.

## کاریگەرخستنەر سەر تێگەیشتن لە کۆمەڵگایەکی بیانیدا

لەم برگەیەدا باسی دروستکردنی کاریگەری دەکەین بۆسەر هزر و تێڕوانین لەناو کۆمەڵگایەکدا نەوەک خودی حکومەتەکەی. ئەرکەکە زیاتر نادیارە، وە کارێکی قورسیشە بزانین پێوانەی کاریگەرییەکانی ئەم تەکنیکانە هەروا

---

[i] Ladislav Bittman, *The KGB and Soviet Disinformation: An Insider's View* (McLean, Va.: Pergamon-Brassey's, ١٩٨٥), ١١٢–١٣.
[ii] deception operation

بە ئاسانی بکەین لە کەیسێکی دیاریکراودا. لەکاتێکدا دەکرێت ئێمە ئەنجامی ئەو کاریگەرییە هەروا بە ئاسانی پەی پێ نەبەین، کارکردن لەم بوارەدا بۆماوەیەکی درێژخایەن بەرهەمەکەی زۆر گرنگ و مەزن دەبێت. هەربۆیە ئەم تەکنیکانەی خوارەوە زیاتر گونجاون بۆ بەکارهێنان لەلایەن حکومەتێکەوە کە تێدەگات پشوودرێژیی لە ئەرکێکی وا مەزندا چەندە پێویستە، نەوەک لەلایەن حکومەتێکەوە بەکاربێن کە چارەسەری هەر گرفت و مەسەلەیەک وەک ڕووداوێکی جیاواز چارەسەر دەکات.

***هەواڵدۆزی کاریگەریی*** هەرچەندە ئەم تەکنیکە بەشێوەیەکی ئاسایی لەو سیخوڕانە پێکدێت کە، کەم تا زۆر، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەتوانن کاریگەریی دابنێن لەسەر بۆچوونی حکومیی و سیاسییەکان، دەکرێت کەسێک وای دابێت کە ئەو سیخوڕانەی ئەرکی سەرەکیان بریتییە لە کاریگەریی دانان لەسەر بۆچوونی گشتی وڵاتێکی بیانیی. بەپێی وتەکانی ئەفسەرێکی پێشووی (*KGB*)، فەڕەنسا خاکێکی بەپیت بووە بۆ ئەم جۆرە چالاکیانە: "زۆربەی سیخوڕە هەرە بەناوبانگەکانی فەڕەنسی لە ناوەڕاستەکانی ساڵانی حەفتاکاندا... ڕۆژنامەنووس بوون یان لەکاری ڕۆژنامەنووسیدا تێوەگلابوون." بەدامەزراندنی هەواڵدۆز و هاوکارەکان لە میدیای فەڕەنسی، دەزگا هەواڵگری سۆڤیەت چالاک بوو لە بەکارهێنانی شیوعیەکانی ناو بۆچوونی گشتی فەڕەنسی بۆ بچووکردنەوەی پەیوەندیەکانی فەڕەنسا بە ناتۆوە وە زیادکردنی پشتیوانی میللی بۆ پەیوەندی دۆستانەتر لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت.[i]

---

[1] Andrew and Mitrokhin, *The Sword and the Shield*, ٤٦١–٧٤.

ستانیسلاف لێڤچێنکۆ(*Stanislav Levchenko*)، پلەی ڕاتید بوو لە دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت(*KGB*) کە لەساڵی ١٩٧٩ بەرەو ئەمریکا رایکرد، چەندین نموونەی بەکارهێنانی هەواڵدۆزی کاریگەری سۆڤیەتی گێڕاوەتەوە بۆ کاریگەریخستنە سەر میدیا و سیاسەتی یابانیەکان.[i] ئەم نموونانە لەمانەی خوارە پێک دێن: بەکارهێنانی ئەندامە دیارەکانی پارتی سۆشیالیستی یابانی بۆ ڕێگاگرتن لە ئەندامێکی تری پارتەکە، کە (*KGB*) پێی وابوو سیخوڕی چینە، لە بەدەستهێنانی پێگەی سەرکردایەتی؛ بەکارهێنانی پەیامنێری پێشکەوتووی ڕۆژنامەی(*Yomiuri*)ی تۆکیۆ بۆ ناردنی بڵاوکردنەوەی وتارێکی تایبەت بۆ بەدەستهێنانی ئازادکردنی سیخوڕێکی هەواڵگریی سەربازی سۆڤیەت(*GRU*) کە لە ئۆپەراسیۆنێکی سیخوڕیی دووسەرەدا دەستگیرکرابوو؛ وە بەکارهێنانی نوێنەرێکی گەنجی ئەمریکی بۆ ئاژانسی ئەسۆشیەتیت پرێس بۆ ئەوەی نامەیەکی ساختە بنووسێت گوایە لەلایەن خێزانی فڕۆکەوانێکی هێزە ئاسمانیەکانی سۆڤیەتەوە هاتووە کە لە سیربیا رایکردووە بۆ یابان بە فڕۆکە میگ ٢٥ەکەیەوە(*MiG-٢٥*) لێی دەپاڕێتەوە کە بگەڕێتەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت.[ii]

---

[i] John Barron, *KGB Today: The Hidden Hand* (New York: Reader's Digest, ١٩٨٣; New York: Berkley, ١٩٨٥), ٣٢–١٥٩

[ii] یەکێک لە گرنگترین و سەرنجراکێشترین کەیسەکانی ڕفاندنی فڕۆکەی میگ بیست و یەک لە مێژووی هەواڵگری ئیسرائیلیدا بریتییە لە دزینی ئەو فڕۆکەیە لە عێراق، کورتەی ڕووداوەکە بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوو لە گەرمەی جەنگی سارددا، ڕووسیای هاوپەیمانی عێراق فڕۆکەیەکی شەڕکەری نوێی دامێنابوو کە پێی دەووترا

---

فڕۆکەی (میگ ٢١)، ئەو فڕۆکەیە لە پێکهاتەکانیدا لایەنی زۆر شاراوەی لە خۆ گرتبوو، ئەمریکا و وڵاتانی پەیمانی ئەتلەسی لە نهێنیە تەکنەلۆژیەکانی ئەو فڕۆکەیە ئاگادار نەبوون، هەروەها دڵنیانانی ئەو فڕۆکەیە بەو تایبەتمەندیە ناوازەیەی کە هەیەتی تا ئەو کاتە شتێکی تازە بوو ، ئەو فڕۆکەیە خاوەنی خێراییەکی زۆرە و لە سەعاتێکدا لە بازنەیەکی داخراوی بە درێژی ( ٥٠٠ کم) دەتوانێت (٢٠٦٢ کم) ببڕێت، هەر ئەو فڕۆکەیە لە بازنەیەکی کراوەی درێژی (١٠٠کم) دەتوانێت خێراییەکەی بکاتە (٢٢٧٥ کم) لە سەعاتێکدا ، ئەو فڕۆکەیە باڵەکانی تەنها (٧٥٠ سم) دەبوو، درێژیەکەشی (١٦،٧٠ م) بوو، ئەو تایبەتمەندیانەش لە فڕۆکەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل و وڵاتانی خۆرئاوادا نەبوون ، بۆیە ئەو فڕۆکەیە بۆ ئەو وڵاتانە شتێکی تۆقێنەر بوو ، ئەو وڵاتانە زۆر تامەزرۆ بوون تا لە نهێنی و لایەنە تەکنیکیەکانی ئەو فڕۆکەیە تێبگەن لەو پێناوەشدا ئامادەبوون چەندین ملیۆن دۆلار خەرج بکەن. هەردوو دەزگای CIA و مۆساد هەوڵەکانیان دەست پێکرد تا بەهەر نرخێک بووە یەکێک لەو فڕۆکانەیان دەست بکەوت کە رووسیا پێشکەشی عێراق و چەند وڵاتێکی تری عەرەبی کردبوو ، زۆریان هەوڵدا یەکێک لە فڕۆکەوانەکانی هێزی ئاسمانی وڵاتە عەرەبیەکان رازی بکەن تا بە یەکێک لەو فڕۆکانەوە بەرەو ئیسرائیل هەڵبێت بەڵام زۆربەی هەوڵەکانیان بێئەنجام بوو بەهۆی دڵسۆزی ئەو فڕۆکەوانانە بۆ وڵاتەکەیان، بەڵام لە کۆتاییدا بەرامبەر پێدانی یەک ملیۆن دۆلار توانیان فڕۆکەوانێکی عێراقی کە ناوی (مونیر رۆفا) بوو رازی بکەن تا بەیەکێک لەو فڕۆکانەوە بەرەو ئیسرائیل هەڵبێت. (مونیر رۆفا) کوڕە گەورەی ماڵێکی مەسیحی مارۆنی بوو، لە قوتابخانەکانی بەغداد خوێندنی تەواو کردبوو، توانی پلەی ئەفسەری فڕۆکەوانیش وەربگرێت تا کرا بە فڕۆکەوانی فڕۆکەیەکی (میگ ٢١) ، ئەو کە لە خێزانێکی هەژار بوو هەندێک لە ئەندامانی خێزانەکەی ناچار بوون بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانیان وەک خزمەتکار کار بکەن، ئەو زۆر باش دەیزانی کە ئەگەر کارێکی لەو جۆرە ئەنجام بدات ئەوا پارەیەکی باشی دەست دەکەوێت و

دەتوانێت ژیانێکی شایستە بۆ ئەندامانی خێزانەکەی دابین بکات، بەم هۆکارە CIAبە هاوکاری مۆساد توانیان رازی بکەن کە بە فڕۆکەیەکی (میگ ۲۱) بەرەو ئیسرائیل هەڵبێت بێگومان دوای ئەوەی دڵنیا بوون کە باری بژێوی خێزانەکەیان باش نییە و هەر بەم هۆکارەش هیچ ئینتیمایەکیان بۆ وولاتەکەیان نییە. لە رێکەوتی ١٦ ئابی ١٩٦٦ پۆلێک فڕۆکەی هێزی ئاسمانی عێراقی لە جۆری (میگ ۲۱) بە مەبەستی راهێنان لە یەکێک لە فڕۆکەخانە سەربازیەکانی دەوروبەری شاری (موسڵ) دەستیان کرد بە فڕین، ئەندامێکی ئەو پۆلە فڕۆکەیە نەقیبی فڕۆکەوان (مونیر رۆفا) بوو، پاش ئەوەی کاتی نیشتنەوەی فڕۆکەکان هات دەرکەوت کە فڕۆکەیەک دیار نییە، ئەو فڕۆکەیەش فڕۆکەکەی (مونیر رۆفا) بوو، کە بە ئاراستەی ئیسرائیل و ئەردەن بۆی دەرچوو، کە گەیشتە ئەردەن دوو فڕۆکەی هێزی ئاسمانی ئەردەنی هەوڵیان دا رێگەی لێبگرن بەڵام لەبەرئەوەی خێراییەکەی زۆر بوو نەیانتوانی. کە گەیشتە خاکی ئیسرائیل لەلایەن سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی ئیسرائیلەوە فەرمان دەرچوو کە هیچ فڕۆکەیەک بەرەنگاری نەبێتەوە تا ئەو کاتەی بەسەلامەتی نیشتەوە . دواتر (مونیر رۆفا) لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا رایگەیاند کە وولاتەکەی خۆی (عێراق) ی بەجێهێشتووە بەهۆی ئەو جیاوازیە رەگەزپەرستییەی کە هەستی پێدەکات هەروەها لەبەر ئەو سەرکوتکردن و داپڵۆسینە درندانەیەی کە حکومەتی عێراق پەیڕەوی دەکات دژی کوردەکان لەباکور، پێشتریش مۆساد بە نهێنی و لە رێگەی کوردستانەوە سەرجەم ئەندامانی بنەماڵەی (مونیر رۆفا)ی لە خاکی عێراق گواستبووەوە کە تائێستاش لە ئیسرائیل دەژین، فڕۆکەکەش لە پێشانگایەکدا نمایش کراو، پسپۆرانی سەربازی ئەمریکی و ئیسرائیلی توانیان چەندین نمونەی لێ بەرهەم بهێنن و سوودێکی زۆری لێوەربگرن بەتایبەتی ئیسرائیل کە توانی بەم هۆکارە بەرگریەکی باش لە خاکەکەی بکات دژی هێزی ئاسمانی میسری و سووری بەدرێژایی جەنگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧ کە بەجەنگی شەش رۆژە ناسرا.

***پڕوپاگەندەی وابەستەنەکراو*** یەکێک لە ڕێگا ڕاستەوخۆکانی هەوڵدان بۆ کاریگەری دانان لەسەر کۆمەڵگایەک بریتییە لە بڵاوکردنەوەی بۆچوون، زانیاری، یان زانیاری هەڵخەڵەتێنەر و ساختە لەڕێگای میدیای بەردەستەوە- واتە، بەهۆی پڕوپاگەندەوە. بۆ نموونە، ئەو نەتەوانەی لە سیاسەتی دەرەوەدا چالاکن بەزۆری خاوەنی وێستگەی ڕادیۆن (وەک دەنگی ئەمریک، ڕادیۆی مۆسکۆ) کە بەئاشکرایی بۆچوونی خۆیان لەهەمبەر پرسە نێودەوڵەتیەکاندا دەردەبڕن.

سەرەڕای ئەمەش، زۆر جاریش هەیە کە حکومەتێک ناخوازێت بەشێوەیەکی ئاشکرا لەو پڕوپاگندانە تێوەبگلێت. لەم جۆرە کەیسانەدا، دەکرێت چەند بۆچوونێکی تایبەت یان حەقیقەتێک بەشێوەیەک بڵاوبکاتەوە کە نەبێتە هۆی ئاشکراکردنی مەبەستی سەرەکی پەیامەکە؛ واتە، بەشێوەیەک کاریگەرییەکە دوورمەودا و پلەبەپلە بێت. ئەم ئامانجە ئامرازێک دەستەبەر دەبێت کە یا ئەم بۆچوونانە بخرێنە ناو میدیای هەواڵیی کە خۆی خاوەنیان نییە یان کۆنترۆڵیان ناکات، یاخود بە ئامرازی جۆرە میدیایەک کە بۆڕای گشتی وەک سەربەخۆ دەرکەوێت بەڵام لەڕاستیدا لەلایەن حکومەتەکەوە کۆنترۆڵکراوە.

دوو هۆکاری سەرەکی هەن حکومەتێک هەوڵی ئەم جۆرە پڕوپاگندانە دەدات. یەکەم، بیسەر و بینەری بەئامانج گیراو زیاتر کراوە بن بۆ بڕواکردن بە پڕوپاگەندەکە ئەگەر بنەڕەتەکەی دیار نەبێت وە ماندەری دووری ئەو لایەنەی هەڵدەستێت بە پڕوپاگەندەکە دیار نەبێت (پڕوپاگەندەی ڕەش). بۆ نموونە، پڕوپاگەندەی بەریتانیی لە ئەمریکا بەر لە چوونی ئەمریکا بۆناو جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەم لەڕێگای میکانیزمی نهێنیی

بڵاوکرانەوە بۆ ئەوەی وانیشان بدرێن کە پڕوپاگەندەکان بابەتین وە ڕاپۆرتی هەواڵیی سەربەخۆن. بۆ نموونە، بەبەکارهێنانی کۆچبەری خەڵکی ئەورووپای ناوەڕاست، هەواڵگری بەریتانی توانی پەی بە ژمارەیەک لە تۆپەراسیۆنی نهێنیی ئەڵمانیا ببات کە لەناو ئەمریکا ئەنجام دەدران. بۆ ئەوەی ڕق و کینە لە هەمبەر ئەڵمانەکان کەمبکرێتەوە لە هزر و بیری ڕای گشتی ئەمریکا، زانیارییەکان دەربارەی ئەو تۆپەراسیۆنانە لەڕێگای بەریتانیەکانەوە بڵاوکرایەوە بۆ سەرنووسەری هاوسۆزی گۆڤاری پرۆڤیدێنس. بەپشت بەستن بەو زانیارییانە، گۆڤارەکە دواتر چیرۆکگەلێکی بڵاوکردەوە کە دواتر لەلایەن ڕۆژنامەکانی تری سەرتاسەری ئەمریکاوە چوو بە بابەتی ڕۆژەڤ؛ وا پێدەچوو، بێگومان، ئەم ڕۆژنامانە بڕوایان وابێت کە ئەو چیرۆکانە بەپشت بەستن بەلێکۆڵینەوە ڕۆژنامەنووسیەکانی ئەمریکی بڵاوکراونەتەوە.

هۆکاری دووەمی بەکارهێنانی میکانیزمەکانی پڕوپاگەندەی "ڕەش" بریتییە لە هۆکاری دیبلۆماسیی، دەکرێت حکومەتێک نەیەوێت بەچەند بۆچوونێکی دیاریکراوەوە وابەستە بکرێت. بۆ نموونە، لەماوەی مەسەلەی بارمتە ئێرانیەکاندا لە ساڵی ١٩٧٩-٨١، حکومەتی سۆڤیەت پێگەیەکی دروستی دبلۆماسیی گرتەبەر بە مەحکومکردنی گرتنی بارمتە لەناو بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکاندا، لەکاتێکدا وێستگە ڕادیۆییە "ڕەشەکەی"، دەنگی نیشتیمانی ئێران، بەشێوەیەکی ئاشکرا کارەکەی پێ پەسەند بوو وە

کاریشی دەکرد بۆ خۆشکردنی ئاگریی ڕەوتی بۆچوونی دژە ئەمریکیی لە ئێران.[1]

سەرەڕای پڕوپاگەندەی میدیایی "ڕەش" کە سەرچاوەکەی شاراوەیە، پڕوپاگەندەی "خۆڵەمێش"یش بوونی هەیە، کە سەرچاوەکەی، لەکاتێکدا بەشێوەیەکی تەواو یان کاریگەر نەشاردراوەتەوە، بەشێوەیەکی ئاشکرا دانی پیانانرێت. بۆ نموونە، حکومەتی ئەمریکی ڕادیۆی ئەورووپای ئازاد و ڕادیۆی ئازادیی لە ساڵی ١٩٤٩ وە ١٩٥١ دامەزراند بۆ پەخشکردنی هەواڵەکان بۆ خەڵکی خۆرهەڵاتی ئەورووپا و یەکێتی سۆڤیەت. بەپێچەوانەی ڕادیۆی دەنگی ئەمریکا، ئەم وێستگانە ئامانجیان ئەوە نەبوو بۆچوونی فەرمی ئەمریکا بڵاوبکانەوە بەڵکو ئەرکی سەرەکییان بریتیی بوو لە پێدانی زانیاری بە دانیشتوانی بەئامنجگیراو دەربارەی خودی وڵاتەکانیان کە ئامادەگییان نەبوو لە میدیا حکومیی وڵاتەکانیان، وە پێدانی زانیاریگەلێک دەربارەی تەواوی ئەورووپای غەربی. ئەو دەزگایانە وەک دەزگای تایبەتی ئەمریکا دامەزرێنران؛ بۆ پشتیوانیکردنی ئەم کارە شاراوەیان، ئەوان تەنانەت بەئاشکرایی داوای یارمەتیان دەکرد. لەڕاستیدا، وێستگەکان لەلایەن سی ئای ئەیەوە بەڕێوەدەبران. بەگوێرەی وتەکانی ڕەی کلین، "سی ئای ئەی ئەم هەوڵەی ڕێکخست... چونکە وا بەباش زانرا ئەو وێستگانە زیاتر کاریگەرییان دەبێت ئەگەر پەیوەندیان لەگەڵ

---

[1] بڕوانە:

Bowden, M. (٢٠٠٧). *Guests of the Ayatollah: The Iran Hostage Crisis: The First Battle in America's War with Militant Islam.* Grove/Atlantic, Inc..

حکومەتی ئەمریکیدا بە شاراوەیی بهێڵرێتەوە."[i] بەڵام لەکاتێکدا پەیوەندی حکومەتی ئەمریکی دانپیانەنراو بوو، ئەوە بوون ■■ کە رادیۆکان تۆپەراسیۆنی ئەمریکی بوون.[ii]

یەکێکی تر لە میتۆدەکانی ئەنجامدانی پروپاگەندە بەشێوازی وابەستەنەکراو پێک دێت لە بڵاوکردنەوەی هەواڵ ■ وتاری تایبەتی دەزگایەک یان حکومەتێک لە میدیای سەربەخۆدا یان رێکخستنیان بۆ ئەوەی وەک پەرتووک بنووسرێنەوە ■■ لەلایەن نووسەر ■ دەزگاکانی چاپەوە بڵاوبکرێنەوە کە هیچ پەیوەندییەکی دیاریان نییە لەگەڵ حکومەتەکە یان دەزگا هەواڵگرییەکانی. بۆ نموونە، ■ کەمپینێکی چالاکی نهێنیدا کە لەماوەی جەنگی ساردا لەدژی کاریگەریی شوعیەت ■ ئەورووپای رۆژهەڵات ئاراستە کرابوو، سی ئای ئەی پروپاگەندەی وابەستەنکەراوی بەکارهێنا، تەنانەت بەنهێنی پارەشی دەدا بۆ بڵاوکردنەوەی پەرتووک و وتاری رۆژنامەکان کە بەهۆی هەواڵدۆزی کاریگەرییەوە پلانی بۆ دادەنرا.

یەکێک لە بەناوبانگترین چالاکیەکانی سی ئای ئەی لەبەکارهێنانی ئەم جۆرە بریتیی بووە لە بڵاوکردنەوەی بابەت لە چەندین رۆژنامەی جیاجیای نائەمریکیدا، کە لە ئەساسدا لەلایەن سی ئای ئەیەوە پارەدار دەکران وەک پەرتووکی بەناوبانگی خرۆشۆف لەساڵی ١٩٥٦ لەژێر ناوی "وتاری نهێنیی"

[i] Ray S. Cline, *The CIA: Reality vs. Myth*, rev. ed. (Washington, D.C.: Acropolis, ١٩٨٢), ١٥١.
[ii] Cord Meyer, *Facing Reality: From World Federalism to the CIA* (New York: Harper and Row, ١٩٨٠), ١١٠–١٣.

کە تیایدا هێرش دەکاتە سەر کەسایەتی *ستالین*.[i] نموونەیەکی تر بریتییە لە پشتیوانی سی ئای ئای بۆ نووسین بڵاوکردنەوەی توێژینەوەکانی پینۆکۆفسکی (*The Penkovsky Papers*)، ■ ئەرکی سەرەکی بریتیی بوو لە بڵاوکردنەوەی چیرۆکی راستەقینەی سیخورە بەناوبانگەکانی سی ئای ئەی لە یەکێتی سۆڤیەت لە کۆتاییەکانی ساڵانی پەنجاکانی و سەرەتای ساڵانی شەستەکان.[ii]

یەکێکی تر لە تەکنیکە هاوشێوەکانی بریتییە لە بەکارهێنانی گروپێکی بەرەی پێشەوە وەک پڕوپاگەندەکار. ئەم جۆرە گروپانە لە راستیدا لەژێر کۆنترۆڵی حکومەتێکدان وە دەتوانرێت پشتیوان پێ ببەسترێت بۆ ئەوەی هەمان ئامانجی حکومەتێک پەیڕەو بکەن. هەربۆیە ئەوان وەک پڕوپاگەندەی وابەستەنکراو کاردەکەن- ئەوان بۆچوونگەلێک دەردەبڕن کە خزمەت بە بەرژەوەندیەکانی حکومەتێک بکات بەشێوەیەک کە زیاتر ئەوا پەسەندکراو بکات بۆ بیسەر و بینەری ئامانج. بۆ نموونە، بەر لە جەنگی جیهانیی دووەم، بەریتانیەکان هەڵسان بە دامەزراندنی چەندین گروپی بەرە؛ ئامانجیان هەرسانکردن و بەرەنگاربوونەوەی "سەرەتا ئەمریکا،" بینەوە کە مەزنترین و گرنگترین رێکخراوی جیابووە بوو لەناو ئەمریکادا.

---

[i] وتارەکە لە رۆژنامەی نیویۆرک تایمزیش دابەزی، کە لە وەزارەتی دەرەوە وەری گرتبوو. بەڵام ئەو نوسخەیەی بە میدیای بیانی درابوو لە سی و چوار پەرەگراف پێکهاتبوو لەمەڕ سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەت کە لە نوسخەی نیویۆرک تایمزدا نەبوو.

[ii] Jerrold L. Schecter and Peter S. Deriabin, *The Spy Who Saved the World* (New York: Scribner, ١٩٩٢), ٣٨٠–٨٨.

**ساختەکارییەکان**[i] یەکێکی تر لە تەکنیکەکان دانانی بابەتی کاریگەرییدار بۆناو کۆمەڵگایەک بەبێ ئەوەی هیچ بەرپرسیاریەتیەک بگرێتەئەستۆ ، هەمبەری بریتییە لە ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی بەڵگەنامەی ساختەکراو. لەگەڵ ئەوانەی کە لەسەرەوەدا باسکران، ئەم تەکنیکەش خزمەت بە هەمان مەبەستی گشتی دەکات: بۆ کاریگەرییدانان لەسەر بۆچوونی بیسەر و بینەرێکی بەئامانجگراو بۆ ئەوەی کردەی ویستراو و بەئەمانجگیراو ئەنجام بدەن. ئەو بەڵگەنامەیەی بەکاردێت بۆ ئەنجامدای ئەم ئەرکە- بەرەوپێشبردنی گوفتاری تێکەیشتن لەلایەن هەواڵدۆزی کاریگەریی؛ ناوەڕۆکی پڕوپاگەندە، بە پەیوەستکراو و ناپیوەستکراو؛ یاخود دەقێکی ساختەکراو- دەبێت قابیلکەر بن بۆ ئەوانەی کە کەسێک هەوڵ ئەدات کاریگەریی دابنێت. هەربۆیە، بەشێوەیەکی گشتی، دەکرێت کەسێک پێشبینی بەڵگەنامەیەکی هەڵە بکات کە لەگەڵ چەند ڕاستیەک تێکەڵ بکرێت بۆ ئەوەی پەرە بە قابیلیەتی متمانەپێکردنی بدات. ئەم تێکەڵەیە لە بەڵگەنامەی ڕاست و ساختە، کە کاریگەریی هەیە لەسەر بەلاڕێدابردنی بیسەر و بینەری ئامانجدا لە هەندێ بواری گرنگدا، بەزۆری لە چەمکگەرای هەواڵگرییدا بە "زانیاری هەڵە"[ii] دەناسرێت.

بێگومان، دەکرێت کە پەیامێکی تەواو دروست (یاخود پەیامێک کە بڕوا وایە دروست بێت لەلایەن ئەوانەی پروپاگەندەی بۆ دەکەن) دەکرێت کاریگەری ویستراوی هەبێت لەسەر بیسەر و بینەری ئامانجدا. کاریگەرترین بەشی پەرتووک وتاری نهێنیی خرۆشۆف (لەڕووی کەمکردنەوەی شکۆی

---
[i] Forgeries
[ii] disinformation

شوعیەت لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا) پێک دێت لەو تاوانانەی دەرهەقن بە *ستالین* وە لەکەدارکردنی کەسایەتی ناوبراو. بڵاوکردنەوەی بۆ ڕای گشتی خەڵک چالاکیەکی نهێنیی کاریگەری سی ئای ئەی بوو، هەرچەندە ئەم بەشەی دەقەکە بەبێگومان دروست بوو. بەهەمانشێوە، بڵاوکردنەوەی تەلەگرامەکانی *زیمەرمان* لەلایەن بەریتانیەکانەوە، ئەنجامێکی سەرنجڕاکیشی پروپاگەندەی وابەستەنەکراو بوو.

## پشتیوانیکردن لە هێزە سیاسییە دۆستانەکان

ڕێگایەکی تری کاریگەریدانان لەسەر ڕووداوەکان لە وڵاتانی بیانیدا بریتییە لە پێدانی پشتوانی ماددیی بۆ هێزە سیاسییە دۆستانەکان، وەک پارتە سیاسیەکان، کۆمەڵەی مەدەنی، یەکێتی کرێکاران، وە ڕاگەیاندن. لەکاتێکدا دەکرێت ئەمە بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەنجام بدرێت، دەشێت هاوکاری شاراوە باشتر بێت بۆ ئەو گروپانەی ئەو هاوکاریە وەردەگرن، چونکە لەڕاستیدا ئەمە لەڕووی سیاسییەوە کەمتر زیانی هەیە لە ڕووی دەستوەردانی وڵاتێکی بیانی لە کاروباری ناوخۆی وڵاتێکی تردا.

نموونەی دیاری ئەم جۆرە هاوکارییە خۆی لەهاوکاری شاراوەی ئەمریکا بۆ *پارتی یەکێتی کرێکارانی* پۆڵەندای سەربەخۆ لە ساڵانی هەشتاکان دەبینێتەوە. ئەمریکا هەڵسا بەهاوکاریکردن لە ڕێگای کلێسای کاتۆلیکی و کرێکاری ئەمریکی کە حکومەت بە ئەنقەست پەرەی بەم بەرنامەیەدا بوو بە مەبەستی ئەوەی پشتیوانی ڕێکخراوی کرێکاران و بزووتنەوەی دیموکراتی پۆڵەندی بکات کە لە ڕوخان بیان پارێزێت دوای ئەوەی حکومەتی شیوعی پۆڵەندا یاسای سەربازیی بەزۆری لە کانوونی یەکەمی

١٩٨١دا ڕاگەیاند. لەنێو جۆرەکانی ئەو پشتیوانییە نهێنیەدا کە بەو پارتە دران، پارە، ئامێری چاپ، ئامێری پەیوەندیکردنی نهێنیی لە گرنگترین ئەو پشتوانیانە بوون.[i]

یەکێتی سۆڤیەتی جارانیش لە کاتی خۆیدا بەم جۆرە چالاکیە هەڵدەستا، هاوکاری ماددی و مەعنەوەی تەواوی پارتی شیوعی وڵاتەکەی دەکرد بۆ شکاندنی شکۆ و لاوازکردنیان پارتەکانی تر لە هەمبەریدا. لە وەڵامی چالاکیەکانی سۆڤیەتدا لە ئەورووپای ڕۆژئاوا دوای جەنگی جیهانیی دووەم، ئەمریکا هەڵسا بەئەنجامدانی بەرنامەی چالاکی نهێنی هاوکاریی بۆ کۆمەڵەی یەکێتی بازرگانیی و کۆمەڵەی کولتوریی و سیاسیی دیموکراتی.

یەکەم کاردانەوەی دەستبەجێی بریتیی بوو لە "ترس" لەناو ئیدارەی *هاری ترومان* (لەکۆتایی ساڵی ١٩٤٧)، ترسێک کە شوعیەکان هەڵبژاردنەکانی بەهاری داهاتوو لە ئیتاڵیا دەبەنەوە. بۆ پشتیوانی هەوڵە ئاشکراکانی پروپاگەندەی ئەمریکا، *سی ئای ئەی* ئەو چالاکیانەی ئەنجامدا، وە لەڕووی دارایی و لایەنی ترەوە هاوکاری چاکی پارتە ناشوعیەکانی کرد. هەروەها هەوڵیدا کاریگەریی بخاتە سەر پارتی سۆشیالیست لەدژی شوعیەکان. هەروەک *ڕەی کلاین*، جێگری پێشووی بەڕێوەبەری سی ئای ئەی، نووسیویەتی،

> ئەم جۆرە هاوکارییە دارایی و تەکنیکیانە بۆ مەسیحیە دیموکراتەکان وە پارتەکانی تری ناشوعی، سەرەڕای هەوڵەکانی لەیەکدابراندنی سۆشیالیستەکان لە گروپی بەرەی یەکگرتووی زۆرینەی شیوعی،

---

[i] Edwin Meese III, *With Reagan: The Inside Story* (Washington, D.C.: Regnery Gateway, ١٩٩٢), ١٧٠–٧١.

> دەبوایە بە نهێنیی و شاراوە بن. سەرکردەکانی حیزبی ئیتالی نەدەبوایە ڕێگا بە شوعیەکان بدات بەڵگەگەلێک بەدەست بهێنن کە ئەوان لەلایەن لایەنی دەرەکیەوە پشتیوانی دەکرێن چونکە دەبووە هۆی تووڕەیی خەڵک لە پارتی شیوعی بۆ خودی دارایی خۆی و وابەستەیی سیاسیی بە یەکێتی سۆڤیەتەوە. بەم شێوەیە سی ئای ئەی توانی دەرچەیەک بدۆزێتەوە بۆ ناردنی پارە و پێدانی هاوکاری تەکنیکی پێویست بۆ ئەوەی دەنگەکان بەدەست بهێنێت و هەڵبژاردنەکە بباتەوە.

دوابەدوای سەرکەوتنی پارتە ناشیوعیەکان لە هەڵبژاردندا، سی ئای ئەی "ڕێنمایی کرا بۆ ئەوەی پێشنیاری بەرنامەکانی زانیاری وە چالاکی تری سیاسیی بکات کە ببێتە هۆی نەفیکردنی هەوڵەکانی شیوعی بۆ پەرەدان بە کاریگەرییە سیاسیەکانی سۆڤیەت لە ئەورووپای ڕۆژئاوا." هەروەک ڕەی کلاین دووپاتیکردۆتەوە، بەشێکی زۆری ئەو تەمویلکردنە بۆ ئەو ڕێکخراوە چەپە ناشوعیانە چوو کە هاوسۆز نەبوون بۆ پێگەکانی تایبەتی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا.

یەکێکی تر لە بەرنامە پڕلەگەنگەشەکانی تری ئەم جۆرە لە وڵاتی چیلیدا ئەنجامدرا دوای دەستبەکاربوونی *سالڤادۆر ئالێندی*( Salvador allende)ی مارکسیی وەک سەرۆکی ئەو وڵاتە لەساڵی ١٩٧٠دا. ئامانج لەم بەرنامەیە بریتیی بوو پێدانی سەرچاوەی دارایی بە پارتە سیاسییە ئۆپۆزسیۆنەکان و میدیاکانیان بۆ ئەوەی ڕزگارین لەو تەنگوچەڵەمە ئابوورییە وڵاتەکە تێی کەوتبوو وە، بەم پێیەش، بتوانن دژی حکومەت مەکینەی ئابووری پێنجەم بەگەڕبخەن. سەرنجی سەرەکی ئەو گەنگەشەیە

بۆ دروستکردنی پرۆگرامەکە بەدوو هۆکار خراپە بەردەم نووکی قەڵەم و ڕەخنەی ژیریی ئەمریکییەکانەوە (ئەمە سەرەڕای پرسە گەورەکەی ئەوەی کە نەبوایە ■ ڕێگایەک بگیرایەتە بەر لە هەمبەر خودی ڕژێمەکەی *سالڤادۆر*).

یەکەم، بەرنامەکە وەک شتێکی ناپێویست شەرمەزارکرا چونکە، بەگوێرەی وتەکانی لیژنەی کڵێسا، هەواڵگری نیشتیمانی سی ئای ئەی لەماوەی دەسەڵاتداری سەلڤادۆر خەمڵاندی کە "سەرەڕای هەوڵەکان بۆ هەرەسهێنان و لەناوبردنی ئابووریی میدیایی ئۆپۆزسیۆن،" ڕۆژنامەگەری ئۆپۆزسیۆن (بەتایبەتی ڕۆژنامەی El Mercurio، گەورەترین ڕۆژنامەی نیشتیمانی و گرنگترین دژبەری سەرۆک *سەلڤادۆر*) بە سەربەخۆ مایەوە وە "سیستەمی تەقلیدی سیاسیی لە چیللی بەردەوام بوو لە نەرمی نواندن."[i] سەرەڕای ئەمەش، لیژنەکە تێبینی کرد کە ئەوانەی بەرپرس بوون لەم خەمڵاندنەدا ئاگاداری بەرنامەی چالاکی پەنهانی و شاراوەکە نەبوون." بەم پێیەش، هیچ خەمڵاندنێک نەکرا لەسەر بنەمای ئەوەی کە ئایا ئەم سێکتەرانە بەبێ پارەی ئەمریکا دەمێننەوە یان نا.

یەکێکی تر لە گەنگەشەکانی تایبەت بە ئامانجەکانی ئەو هاوکارییە ئەمریکیانەی کە دەبەخشرێن. هەوڵێکی زۆر تەرخانکرا کە هاوکاری ئەمریکا نەگاتە دەست ئەو گروپانەی بەشێوەیەکی چالاکانە کاردەکەن بۆ ڕوخاندنی حکومەتەکە (وەک یەکێتی بارهەڵگرەکان، کە لە چەند بۆنەیەکدا خەریک بوو کودەتایەکی سەربازیی بەرپا بکات) ■ بۆ سنووردارکردنی بۆ پارتە ئۆپۆزسیۆنەکان و میدیا، بەگوێرەی وتەکانی *گریگۆری ترێڤەرتۆن*،

---

[i] Church Committee, *Staff Report: Covert Action in Chile:* ١٩٦٣–١٩٧٣, ٩٤th Cong., ١st sess., ١٩٧٥, Committee Print, ٢٩, ٤٥.

ڕەخنەگری چالاکی پەنهانی و شاراوە کە ئەندامێکی ستافی کۆمیتەی کڵێسایە، "یاساکانی حکومەتی ئەمریکا ئەوەمان پێدەڵێن کە دەبێت بەوریاییەوە جیاکاریی بکرێت لە نێوان پشتیوانیکردنی هێزە ئۆپۆزسیۆنەکان وە پارەدارکردنی ئەو گروپانەی هەوڵەکانیان وەگەڕدەخەن بۆ هاندانی کودەتایەکی سەربازیی. هەوڵی ئەو جیاکارییە، تا ئەو ڕادەیەی من ئاگادار بم، هەوڵێکی ڕاستگۆیانە بووە."[1] سەرەڕای ئەمەش، هەروەک *ترێفەرتون* ئاماژەی پێداوە، ئەم جیاکارییە بەشێوەیەکی بنەڕەتی دەستکرد بوو، ئەوەی کە هەبوو "لە بۆچوونی ئەمریکیەکاندا بوو، نەوەک چیللیەکان." گروپە ئۆپۆزسیۆنەکان ستراتیژیەتی خۆیان هەڵبژارد بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان وە بەم پێیەش تەکنیک و هاوپەیمانانی خۆیان گرتەبەر؛ ئەگەر هێزە جیاوازەکانی دژە *سەلڤادۆر* ویستبویانە هەماهەنگی لەگەڵ یەکتردا بکەن ئەوکات پشتیوانی ئەمریکاش بۆ هەندێ گروپ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەبووە هۆکار بۆ پشتوانی ئەوانی تریش.

## دانانی کاریگەریی لەسەر ڕووداوەکان بەهۆی کردەی توندئاژۆ

لە هزری خەڵکی ئاساییدا، چالاکی پەنهانی بەزۆری وا لێکدەدرێتەوە کە پەیوەندییەکی نەپچڕاوی هەیە لەگەڵ میتۆدەکانی توندئاژۆ بۆ دانانی کاریگەریی لەسەر ڕووداوە سیاسییەکان. هەروەک تا ئێستا نیشاندرا، ژمارەیەکی زۆری تەکنیکی ناتووندوتیژ دەکرێت بە شاراوەیی بەگەڕبخرێن بۆ دانانی کاریگەری لەسەر ڕەفتاری سیاسیی، ڕووداوەکان، وە دۆخی

[1] Gregory F. Treverton, *Covert Action: The Limits of Intervention in the Postwar World* (New York: Basic Books, ١٩٨٧), ١٤٢.

وڵاتە بیانییەکان. بەڵام سەرەڕای ئەم چالاکیانە، کە بەشی هەرەزۆری ئۆپەراسیۆنی نهێنیی پێک دەهێنن، چەند تەکنیکێکی تریش هەن کە پشتیوانی یان بەکارهێنانی توندوتیژیی دەکەن.

***پشتیوانی بۆ کودەتا، "جەنگەکانی ئازادی نیشتیمانیی،" وە "جەنگاوەرانی ئازادی"*** پێویست ناکات پشتیوانی بۆ گروپە سیاسییەکان سنووردداریکرێت بۆ نەیاری ئاشتیخوازی حکومەتێکی بیانی بەڵکو دەکرێت فراوان بکرێت بۆ گروپگەلێک کە بەدوای ئەوەدا وێڵە کاریگەریی لەسەر سیاسەتی ئەو حکومەتە دابنێت لەڕێگای گرتنەبەری هۆکاریگەلی توندئاژۆوە یاخود تەنانەت ڕووخاندنی ئەو حکومەتە. دەکرێت ئەمە پێک بێت لە پشتوانیکردنی گروپێک کە پێشتر هەیە یان دروستکردنی گروپێکی "داردەستی بوکەڵە" بۆ بەجێگەیاندنی ئەو چالاکیانە.
پشتیوانی وردی ئەم جۆرە لە پشت بە پشتوانی کردنی گروپەکە لەلایەن هێزە دەرەکیەکانی تر یان ئەو ستراتیژیەتەی گرتویەتیەبەر دەبەستێت. دەکرێت ئەم پشتیوانییە لە فۆرمکی سەربازییدا بێت بۆ هێزێکی شەڕکەری یاخیی؛ پشتیوانی ئۆپەراسیۆنی بۆ کودەتایەک؛ فشاری ئابووریی و سیاسیی دەرەکی، یان یاخیبوونی ناوەکی ئاراستەکراو لەدژی حکومەتی ئامانجدا؛ یان پشتیوانی مەشقپێدان و ئابووریی بۆ پەرەپێدانی کادرەکان بۆ خەباتێکی درێژخایەنی گەریلایی. لە سەرەمی ئیدارەکانی هەروو سەرۆک جیمی *کارتەر* و *ڕۆناڵد ڕەیگان* دوو نموونەی بەرچاوی ئەم بوارەن لە پشتیوانیکردنی خەباتی گەریلایی لەدژی ڕژێمی پشتیوانیکراوی ئەفغانی لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە وە پشتوانی دژەخەباتی لە وڵاتی نیکاراگوای،

ئەم دوو نموونەیە دەرخەری ڕاستی بوونی ئەم جۆرەی چالاکی نهێنین لەم سەردەمی دواییدا.

یەکێک لە شێوازە هەرە بەرچاوەکانی ئەم جۆرە چالاکییە کە دەنگدانەوەیەکی بێ ئەندازەی هەبوو بریتییە لە پشتیوانی دەوڵەتێک بۆ تیرۆریزمی نێونەتەوەیی. وڵاتی پشتیوان لە گروپە تیرۆرستیەکە دەکرێت لە گرنگیی و قەبارەدا جیاواز بێ. لە نزمترین ئاستدا، وڵاتی پشتیوانکەر هەڵدەستێت بە پێدانی مەشق و ڕاهێنان یان شوێنی مانەوە کە تیایدا تیرۆرستان دووربن لە دەستگیرکردن کاتێک پلانی هێرشەکانیان دادەڕێژن یان کە پلانەکەیان جێبەجی کرد بتوانن دوای ئەمە پەنای بۆ بەرن. لە بەرزترین ئاستدا، دەکرێت ئەم پشتیوانییە خۆی لە پێدانی پارە، چەک، پاسپۆرتی ساختە یان دروست، یان بەکارهێنانی ڕێکاری دبلۆماسی بۆ ناردنی چەک و تەقەمەنی بۆناو وڵاتی ئامانج. بڕی ئەو کۆنترۆڵەی وڵاتی پشتیوانکەر هەیەتی بەسەر چالاکیە تیرۆرستیەکانی گروپەکەش لە گروپێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە؛ لە هەندێ حاڵەتدا، بڕەکە تا ڕادەیەکی بەرچاو دیارە، بەڵام لە هەمان کاتتدا دەکرێت هەر بوونیشی نەبێت، تا ئەو ڕادەیەی سروشتی گشتی چالاکیەکان لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی وڵاتەکە یەکتردەگرێتەوە.

***نیمچەسەربازیی*** لەنێوان چالاکی پەنهانی ڕاستەقینە و چالاکی سەربازییدا چەند حاڵەتێک هەن کە تیایاندا حکومەتێک هێزی ناناناسیی (یان خۆبەخش) بەکاردەهێنیت لە ململانێیەکی سەربازییدا. لەبەر ئەوەی هەوڵێکی لەم جۆری بەشێوەیەکی زۆر ناکرێت بۆ ماوەیەکی درێژ بە نهێنیی

بمێنێتەوە، دەکرێت ئێمە بڵێین کە ئەم جۆرە چالاکیە دەبێت لە پۆلێنی چالاکی نهێنی و شاراوە دەربهێنرێت. لەلایەکی تریشەوە، لەبەر ئەوەی بەزۆری دەزگا هەواڵگرییەکان ڕادەسپێردرێن بۆ ئەنجامدانی ئەم چالاکییە، ئەمە لەم ڕووەوە وەک چالاکی پەنهانی دەمێنێتەوە.

***کردەی تایبەتی وێرانکردن یان توندتیژی، بە کوشتنیشەوە*** لەکۆتاییدا، دەکرێت چالاکی پەنهانیی لە بەرگی کردەی تایبەتی توندوتیژدا خۆی ببینێتەوە، لە دژی چەند کەسێک (وەک کوشتنی بەرپرسانی حکومەتێکی بیانی، کەسایەتی دیاری سیاسیی، یان تیرۆرستان) یان سامان و موڵک ئاراستەکراوە.

"پرسە تەڕەکان"[i] ئەو دەستەواژەیەیە کە بۆ کاری کوشتن و وێرانکردن بەکاردێت لە چەمکسازی هەواڵگرییدا، کە پێکهاتەیەکی هەرە دیار و ئاسایی لە ئۆپەراسیۆنە هەواڵگرییەکانی سۆڤیەتدا. لەوانەیە گرنگترین نموونەی ئەم جۆرە بریتیی بێت لە کوشتنی *لیۆن ترۆتسکی* لە مەکسیک لە ساڵی ١٩٤٠دا. لە ئەمریکاشدا، سی ئای ئەی هەوڵی زۆریدا *فیدل کاسترۆ* بکوژێت، سەرەڕای ئەمەش، دەستێکی باڵای هەبوو لە تێوەگلان لەو هێزە سیاسییەی کە بەرپرس بوون لە کوشتنی *پاتریس لامومبای* کۆنگۆ وە *ڕافایل تورژیلۆی* کۆماری دۆمەنیک کە لەساڵانی حەفتاکاندا لەماوەی لێکۆڵینەوەکانیان لەلایەن کۆمیتەی کڵیساوە ئاشکرا کران. یەکێک لە ئەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوەی بریتیی بوو لە دەرکردنی بڕیارێکی سەرۆکایەتی لەسەردەمی سەرۆک جێراڵد *فۆرد* لەمەڕ

---

[i] Wet affairs

قەدەغەکردنی تیوەگلانی ڕاستەوخۆی هەواڵگریی، یان پیلاندانان تیایدا، لە کوشتنی کەسایەتییە سیاسییەکان.[I]

یەکێک لە چالاکیە پەنهانە هەرە بەناوبانگەکان دەربارەی توندوتیژیی لەدژی سامان و موڵک بریتیی بوو لە تەقاندنەوەی کەشتی( *Rainbow Warrior*) لەلایەن سیخوڕە هەواڵگرییە فەڕەنسیەکانەوە لە ساڵی ١٩٨٥.[II] ئەم کەشتییە، کە لەوکاتەدا مێرشی کرایەسەر کە لە بەندەرەکەدا لەنگەری گرتببوو، لەلایەن ڕێکخراوی ژینگەیی گرین پیس خاوەنداری دەکرا، کە نیازیان وابوو ئەو کەشتییە بەکاربهێنن بۆ خۆپیشاندان و سەرکۆنەکردنی تاقیکردنەوەکانی چەکی ئەتۆمی فەڕەنسی لە زەریای باشوور. فۆتۆگرافەرێکی پورتوگالی لەم تەقینەوەیەدا بەبێ مەبەستانە کوژرا.

نموونەیەکی وێرانکەرتری ئەم جۆرە چالاکیە بریتیی بوو لە هەڵمەتی وێرانکردنی نهێنیی ئەڵمانی کە لە ئەمریکادا ڕوویدا بەر لەوەی بڕیار بدات کە بچێتە ناو جەنگی جیهانیی یەکەمەوە. هەرچەندە بە فەرمی ددانی پیانەنراوە، ئەمریکا پێدەری سەرەکی چەک و تفاقی جەنگ بووە بە بەریتانیا وە هاوپەیمانەکانی لەماوەی سێ ساڵی سەرەتای جەنگەکەدا. بۆ وەستاندنی ئەم کەلوپەلانە لە گەیشتنیان بە دوژمنەکانی، هەواڵگری ئەڵمان چەند ئۆپەراسیۆنێکی نهێنیی لەناو ئەمریکادا ئەنجامدا. ئەم چالاکیانە خۆی لە تەفروتوناکردنی ئەو کەشتیانەدا دەبینیەوە کە شتمەکیان هەڵدەگرت بۆ بەریتانیا و ڕووسیا، وە ناردنی جۆرە ڤایرۆسێک

---

[I] Executive Order ١١٩٠٥, “United States Foreign Intelligence Activities,” February ١٨, ١٩٧٦, sect. ٥(g) [٤١ Fed. Reg. ٧٧٣٣ (١٩٧٦)].
[II] Direction générale de la sécurité extérieure

بۆ ئەوەی لە ئەسپ و هێسترەکان بدرێت دەنێردرانە ئەورووپا، وە بۆردومانکردنی تفاقی و کارگەی بارووت بەدرێژایی کەناری ڕۆژهەڵات. سەرنجڕاکێشترین ئۆپەراسیۆن بریتیی بوو لە وێرانکردنی ڕێگای شەمەندەفەر وە تێرمینالّی دەریایی لە شاری بلاک تۆمی ویلایەتی نیوجێرسی لە حوزەیرانی ١٩١٦. بەبەکارهێنانی ئامێری گڕگر و تەقەمەنی، سیخوڕە ئەڵمانەکان بەتەواوی شوێنی تەقەمەنیەکانی دوژمنانی لە سەرتاسەری ئەورووپا وێران کرد. خاپورکردنی تێرمینالەکە، لە بەرامبەر پەیکەری ئازادییە، بووە هۆی وێرانکردنی پردی *بروکلین*، وە شکاندنی پەنجەرەکانی لە سەرتاسەری مانهاتن، وە دەنگەکە دەتوانرا لە دووری شاری فیلادلفیاوە بەباشی ببیسترێت.[1]

## چالاکی پەنهانیی و نهێنیگەریی

هەرچەندە وا دەردەکەوێت کە نهێنیگەرایی کرۆک و ناواخنی چالاکی پەنهانیی بێت، گرنگیی و وەزیفەکەی، هەروەک لە سەرەتای ئەم بەشەدا باسکرا، پرسێکی هەروا سادە نییە؛ ئەمە بەتەواوی پشت دەبەستێت بە جۆری ئەو چالاکییە شاراوەیە و دۆخی تیایدا ئەنجامدەدرێت. ڕێژەی نهێنیگەری پێویست، وە پاڵنەرێک بۆی، لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر زۆر جیاوازە.

لە هەندێ نموونەدا، دەکرێت نهێنیگەریی بەشێوەیەکی کامڵ جەوهەریی بێت بۆ سەرکەوتنی ئۆپەراسیۆنەکە. بۆ نموونە، ئەدمیرال *ستانفیلد*

[1] Jules Witcover, *Sabotage at Black Tom: Imperial Germany's Secret War in America, ١٩١٤–١٩١٧* (Chapel Hill, N.C.: Algonquin, ١٩٨٩).

تێرنەر، بەڕێوەبەری هەواڵگری ناوەندیی سەرۆک کارتەر، وەسفی ئەو ئۆپەراسیۆنەی کردووە کە پێکهاتبوو لە ناردنی هەواڵگرێکی سی ئای ئەی بۆ تەهران بۆ ئەوەی ئاسانکاری بکات لە هەڵاتنی شەش هاوڵاتی ئەمریکی کە پەنایان بردبووە بەر باڵیۆزخانەی کەنەدا دوای ئەوەی باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە تشرینی دووەمی ١٩٧٩دا دەگیرێت. هەرجۆرە بڵاوکردنەوەیەکی ئۆپەراسیۆنەکە (تەنانەت ئەگەر بهاتبوایە ناوی سیخوڕەکە و شەش کەسەکەش ئاشکرا نەکرابوایە) دەبووە هۆی خستنەمەترسی سەلامەتی هەر حەوت کەسەکەی لە ئۆپەراسیۆنەکە تێوەگلابوون بە زیادبوونی وشیاری ئێرانیەکان لە هەمبەر ئەم کەیسەدا، وە دەبووە هۆکارێک بۆ داگیرکردنی باڵیۆزخانەی کەنەدا لەلایەن ئێرانیەکانەوە، یاخود ئاڵۆزکردنی پرۆسەی دەرهێنانی ئەمریکیەکان لە ئێران بە بەکارهێنانی پاسپۆرتی ساختە.

بەهەمان شێوە، پاراستنی هەندێک ناوەڕۆکی ئۆپەراسیۆنێک بە نهێنیی، دەکرێت پێویست بێت بۆ ڕێگاگرتن لە دروستبوونی گرفت بۆ ئۆپەراسیۆنەکە، هەرچەندە ئەوە دەستەیەی ئاماژە بە بەرنامەکە دەکەن بەشێوەیەکی گشتی ناسراو بن. بۆ نموونە، با بەرنامەی ئەمریکا بۆ هاریکاری موجاهیدینەکان لە دژی یەکێتی سۆڤیەت لە ئەفغانستان لە ساڵانی هەشتاکان وەک نموونە وەربگرین. ژمارەیەک لە وڵاتی و کەناڵی تایبەت هەبوو کە بەکاردەهاتن بۆ ناردنی ئەو هاوکاریانە بۆ گرووپی ناوبرا؛ بەڵام ئایا لەوکاتەدا ئەمە ئاشکرا کرا؟ بێگومان نەخێر، چونکە دەبووە هۆی خستنەمەترسیی هەموو ئەو لایەنانەی بەژدار بوون یاخود حکومەتەکانی سۆڤیەت و ئەفغانستان هەموو توان دبلۆماسیەکانی خۆیان

دەخستە گەڕ بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو هەوڵانە. بەم شێوەیەش، سەبارەت بە ناوەڕۆکی چالاکییە شاراوەکەدا، نهێنکەریی پێویست دەبێت، بەبێ گوێدانەی ئەنجامی ئەو ئۆپەراسیۆنە بەشێوەیەکی گشتی چۆن وەرگیراوە. کەیسی لەم جۆرە، کە تیایدا نهێنیکەریی دەربارەی تەواوی ئۆپەراسیۆنەکە یاخود بەشێکی تایبەتی زۆر پێویستە بۆ ئەنجامدانی، ڕەنگە زۆر دەگمەن بن. لە چەندین کەیسی تردا، نهێنکەریی زۆری گرنگە بۆ کاریگەریی ئۆپەراسیۆنەکە. لەم جۆرە پۆلێنەدا، دەتوانین ئەم جۆرە بخەینە ناو ڕیزی پروپاگەندەی ناپەیوەستکراو یان پشتیوانی بۆ چالاکی سیاسیی کە پێشتر باسی لێوە کراوە.

ئەم جۆرە چالاکیانە بە شاراوەیی ئەنجام دەدرێن لەسەر ئەو بنەمایەی کە وشیاریی گشتی سەرچاوەی بیانی پروپاگەندەکە یان پارەدارکردنی چالاکیەکی سیاسیی دەبێتە هۆی لاوازکردن و لەناوبردنی کاریگەرییەکەی. چەمکی پروپاگەندەی "ڕەش"، هەر بۆ نموونە، ئەو زانیارییەیە کە گومانی دەخرێتە سەر یان ڕەتدەکرێتەوە ئەگەر زانرا لەلایەن نەیارێکەوە هاتووە یان لەلایەن هەندێ سەرچاوەی بیانی کە هاندەری دوورتری هەبێت زیاتر جێگای قبوڵە ئەگەر سەرچاوەکەی شارلوە بێت یاخود ناسنامەیەکی هەڵەی بخرێتەبەر.(لە چەندین کەیسدا، نهێنیکەریی پێویست دەبێت چونکە پارەدارکردنی ڕێکخراوە سیاسییەکان دەبێتە هۆی پێشێلکردنی یاسای وڵاتی ئامانج.)

سەرەڕای ئەمەش، پروپاگەندەی "ڕەش" دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ نۆژینەوەی ناکۆکی لە نێو ڕیزی پلەدارەکانی دوژمن بە دانەپاڵی درۆینەی وتە و کرداری ورووژێنەر کە کاریگەری هەبێت لەسەر شکۆی بەرپرسی

بەئامانجگیراو. لەم کەیسەدا، نهێنیکەریی دەربارەی سەرچاوەی ڕاستی پڕوپاگەندەکە پێویستە بۆ پشتیوانیکردنی ڕاستی و دروستی پڕوپاگەندەکە. سێفتن دێلمەر(*Sefton Delmer*)، کە سەرپەرشتی تۆپەراسیۆنەکانی پڕوپاگەندەی "ڕەش"ی دەکرد لە جەنگی جیهانیی دووەمدا، ئاماژە بەوە دەکات کە "ئاسانترین و کاریگەرترین تۆپەراسیۆنی "ڕەش" بریتییە لە تفکردنە شۆڕیای پیاوێک و بەدەنگێکی بەرز هاوار بکەی "بژی هیتلەر."[1] بە هەمانشێوە، ژمارەیەکی زۆری ئەو بەڵگەنامەی ساختانەی لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتی جارانەوە بەرهەمهێنرابوون یاداشتنامەکانی حکومەتی ئەمریکای ساختە کردبوو کە ڕەفتارێکی دوژمنکارانەی دەردەخست لە هەمبەر وڵاتی سێیەمدا.

لە کەیسی تردا، دەکرێت نهێنیکەریی پێویست بێت بۆ پاراستنی هەماهەنگی لایەنێکی سێیەم کە حەز دەکات هاوکار بێت تەنیا ئەگەر بێتو چالاکیەکە شاراوە بێت، بۆ ئەوەی بەدوور بێت لە تێکدانی پەیوەندییە بیانیەکانی تری. لەبەر ئەم هۆیە، تەنانەت لە کەیسێکیشدا کە ئەنجامدەرانی چالاکیەکی شاراوە بەشێوەیەکی تەندروست دەناسێنرێت، پاراستنی بەنهێنی دەکرێت گرنگ بێت.

دوایین پۆل باس لەو کەیسانە دەکات کە تیایاندا وشیاریی و پێزانینی گشتی کەمتر خۆی لێ دەپارێزرێت چونکە دەبێت هۆی خستنەمەترسی ئەو کەسانەی تۆپەراسیۆنەکە بەڕێوە دەبەن یان زیان بە کاریگەریەکەی دەگەیەنن وەک لەوەی چونکە هۆکاری دبلۆماسیی وای لێدەکات تێوەگلانی حکومەت ددانی پیانەنرێت.

---

[1] Heil Hitler

بۆ نموونە، توانای حکومەتی ئەمریکا بۆ وەڵامدانەوەی تەقاندنەوەی تیرۆرستی پاڵپشتیکراو لەلایەن لیبیاوە لە پێنجی نیسانی ١٩٨٦، لە سەماخانەیەک لە خۆرئاوای بەرلین، کە تیایدا کە خزمەتگوزارێکی ئەمریکی وە کەسێکی تری تیادا کوژران، بەشێوەیەکی بنەڕەتی پشتی بە ویستی ئەمریکا دەبەست بۆ درکاندنی زانیاری هەواڵگریی هەستیار کە تێوەگلانی لیبیەکانی دەسەلماند. لەکاتێکدا حکومەتی ئەمریکا لە کۆتاییدا هەر ئەمەی کرد، بەڵام باجێکی زۆر قورسیدا بۆ ئەم کارەی؛ لیبیەکان لە تواناکانی هەواڵگریی ئەمریکا ئاگاداربوون لە دژی ئەوان وە بەم شێوەیەش هەڵسان بە کەمکردنەوەی کاریگەریی ئەم توانایانە.

بەشێوەیەکی گشتیتر، هەرچەندە حکومەتەکان تێکەیشتوون لە بەژداربوون لە چالاکیە شاراوەکان(هەروەک لە کردەی سیخوڕییدا)، چالاکی پەنهانی زۆرجار ناپاسابیە لەژێر یاسای ئەو وڵاتەی کە چالاکیە شاراوەکەی تێدا ئەنجام دەدرێت. هەروەها، هەروەک ئاشکرایە، لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی ساردەوە یاسا نێودەوڵەتیەکانیش بە سەرپێچی دادەنێت حکومەتێ کردەی نهێنی لە هەمبەر وڵاتێکی تردا ئەنجام بدات.

لەبەر ئەم هۆکارانە، لە ڕووی ورووژاندنی تێکدانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانەوە واباشترە دان بە ئۆپەراسیۆنێک نەنرێت. وڵاتی ئامانج، جا چ لە بەرژەوەندی پەیوەندی باش بێت یان لەبەر ئەوەی ناتوانێت بەشێوەیەکی کاریگەری ڕێگر بێت، دەکرێت گوێ بە چالاکییە شاراوەکە نەدات؛ وە تەنانەت لەوکاتەش قورسترە ئەو کارە بکات ئەگەر ئەو حکومەتەی ئەو کارە ئەنجام دەدات بە ئاشکرایی ددان بەوەدا بنێت کە لەو وڵاتەدا خەریکی چییە.

## نکۆڵیکردنی قابیلکەر[i]

یەکێک لە گرنگترین ئەو هونەرانەی کە پێویستە وڵاتێک درکی پێ بکات بریتییە لەوەی کە ئەگەر سەد لەسەد زانیرا کە چالاکیە شاراوەکە ئاشکرا بووە وە ئەنجامدەرانی کێن، بەرپرسە بالاکانی دەوڵەتەکە دەبێت ئەو توانایەیان هەبێت نکۆڵی لەوە بکەن کە ئەوان ڕێگایان بە چالاکیەکە داوە یان تەنانەت ئاگاشیان لێبووە. سەرکردەی ئەو وڵاتە دەبێت ئەو توانایەی هەبێت بڵێت، بە زمانیکی قابیلکەر، کە ئەو کارە لەلایەن هەندی کەسانی پشتگوێخراو ئەنجامدراوە کە بەبێ زانیاری و پرسی ئەو کاریان کردووە.

لەماوەی دوای جەنگی جیهانیی دووەمەوە، گرنگی ئەم ڕێبازە زیاتر بۆ ڕای گشتی ڕوون بووەوە، کاتێک سەرۆک *ئایزنهاوەر* لە ئایاری ١٩٦٠دا ڕێگای بە فڕۆکەی(U-٢)دا بۆ ئەوەی هەڵسێت بە ئەنجامدانی چەند چالاکیەکی هەواڵگریی لە ئاسمانی یەکێتی سۆڤیەتدا بەو ئامانجەی کە ڕادارەکانی ئەو وڵاتە ناتوانن درک بە بوونی فڕۆکەکە بکەن و کارەکەی بە سەرکەوتویی ئەنجام دەدات، بەڵام ئەو فڕۆکەیە لەلایەن موشەکێکی ئاسمانی سۆڤیەتەوە لەکاتی سیخوڕیکردن لە ئاسمانی ئەو وڵاتە هێنرایە خوارەوە. (هەرچەندە ئەمە چالای شاراوە نییە، بەڵام بەڕوونی دەردەکەوێت کە دژی یاسا نێودەوڵەتیەکانە، ئەمەش پێویستی بە نکۆڵیەکی قابیلکەر دەبوو کە سەرۆک *ئایزنهاوەر* دەبوایە بە زمانێکی پاراو پۆزشی بۆ بهێنێتەوە).

لە یاداشتەکانیدا، *نیکیتا خرۆشۆف*ی سکرتێری سۆڤیەت بۆ چەندین ساڵ، دەڵێت کە ئەوە دانپیانانی بەرپرسیاریەتی خودی *ئایزنهاوەر* بووە نەوەک

---

[i] Plausible Denial

کەوتنی خودی فڕۆکەکە کە بووە هۆی ئەوەی شکستی بەژدارنەبوونی لە کۆبوونەوەی "چوار هێزی مەزن" لە پاریس کە قەرار بوو لەکۆتایی بەهاری ئەو ساڵەدا ئەنجام بدرێت.[1] سەرەڕای ئەمەش، *ئایزنهاوەر* هەستی بەوەکرد کە ناتوانێت نکوڵی لە ئاگاداریی خۆی بکات بەبێ ئەوەی بڵێت کە ئەو بەشێوەیەکی کاریگەرانە کۆنترۆڵی بەسەر هێزە سەربازییەکانی ئەمریکادا نییە، بەتایبەتی بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پشتوانییە مەزنە پێویستە بۆ چالاکیەکە. لەکاتێکدا دەکرێت حاشا لە کردەوەی گروپی بچووکی سیخوڕی نهێنیی بکرێت، کە وەک دەرچوو لە یاساکانی وڵات لەقەڵەم بدرێن، پرسێکی تر بۆ حاشاییکردن لە ئۆپەراسیۆنێک کە پێویستی بە هەماهەنگی ژمارەیەکی زۆری کەس هەیە لە چەندین بنکەی ئاسمانی لە سەرتاسەری جیهان.

یەکێک لە نموونەکانی نکوڵی قابیلکەر بریتییە لە کەیسی ئەم ساڵانەی دوایی چەند سیخوڕێکی هەواڵگری فەرەنسی کە کەشتی( Rainbow Warrior)یان تەقاندەوە. بەرپرسیاریەتی ئەم پرسە ئاشکرا بوو کاتێک ئەفسەر هەواڵگرییە تێوەگلاوەکانی فەرەنسا لە نیوزلەندا دەستگیرکران. حکومەتی فەرەنسا ئەوەی دووپاتکردەوە کە تێوەگلانی فەرمی لە پرسەکەدا لە وەزیری بەرگریی *چارلس هێنری* تێنەپەڕیەوە، کە بەرپرس بوو لە دەزگای هەواڵگری بیانی فەرەنسی، واتە پاشکۆی وەزارەتی بەرگریی. *چارلس* دوای سێ مانگ لە هێرشەکە دەستی لەکارکێشایەوە.

---

[1] Nikita S. Khrushchev, *Khrushchev Remembers: The Last Testament* (Boston: Little, Brown, ١٩٧٤), ٤٤٧–٤٨.

لەکۆتاییدا سەرۆک *فرانسوا میتەران* بە سەلامەتی لە گرفتە دەرچوو و توانی نکۆڵیەکی قابیلکەر بکاتە پۆزش بۆ کارەکەی.[i]

لە ئەمریکاشدا، ڕێبازی نکۆڵی قابیلکەر بووە خاڵی وەرچەرخان لە دەرچوونی یاسایەک لە کۆنگرێس دەربارەی پرسە هەواڵگرییەکان لە ساڵانی ناوەڕاستی حەفتاکاندا. لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٤دا، دوای ئاشکرابوونی بەرنامەی چالاکیەکی نهێنی لە وڵاتی چیللی، کۆنگریس یاسایەکی تێپەڕاند،[ii] کە چالاکی پەنهانیی سی ئای ئەی قەدەغەکرد.

بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکی شاراوە، دەبوایە لایەنی هەواڵگریی بە لقی جێبەجێکار بڵێت بۆ ئەوەی کۆنگرێس ئاگادار بکرێتەوە لەبارەی چالاکی پەنهانی. سەرەڕای ئەمەش، یاساکە پێویستی بەوەش بوو کە دەبێت سەرۆک ئەو چالاکییە شاراوەیە پێشنیارکراوەی پێ گرنگ بوایە بۆ ئاسایشی نیشتیمانیی وە ئەویش لە حاڵەتی ئاشکرا بوونی ئەو توانایەی هەبێت نکۆڵی لێبکات، ئینجا ڕێ بەم جۆرە چالاکییە بدرێت.

## وازهێنان لە نهێنیکەری

بەهۆی بەرزبوونەوەی ڕۆڵی کۆنگریس لە کۆنترۆڵکردنی چالاکی پەنهانیدا، ئەمریکا هەڵساوە بە وازهێنان لە نهێنیکەریی لەم چەند ساڵەی دواییدا. بۆ نموونە، پرسی کۆمەک بۆ یاخیگەرانەی ئەفغان و نیکاراگوای بە ئاشکرایی لە کۆنگریس و ڕۆژنامەکاندا باس و گەنگەشە کرا. ئەمریکا تەنانەت ئەوەشی دووپاتکرەوە کە مافی وڵاتەکەیەتی لەژێر ڕێکەوتنی

[i] John Dyson, *Sink the Rainbow! An Enquiry into the "Greenpeace Affair"* (London: Gollancz, ١٩٨٦), ١٥٧–٨٦
[ii] Hughes-Ryan Amendment

جنێف لە ساڵی ١٩٨٨ هاوکاری ئەفغانەکان بکات تا ئەو کاتەی سۆڤیەت واز نەهێنێت لەهاوکاریکردنی حکومەتی کابول. سەرەڕای ئەو ڕاستیەی ئەم جۆرە چالاکیانە پێیان دەوترا چالاکی پەنهانیی، لەچەندین لاوە ئاشکرا بوون. لە ڕاستیدا، لە هەندێ کەیسدا کۆنگریس بە ئاشکرایی پێشڕەو بووە لە پێشنیارکردنی چەند چالاکیەک، وەک بەخشینی پشتیوانی بەو هێزە عێراقیانەی دژە حوکمی *سەدام حسێن* بوون، کە لە کۆندا ڕەنگە وەک چالاکی پەنهانی لە قەڵەم درابوونایە.

هەندێ کەیسی تریش لە لاپەڕەکانی مێژوودا بەرچاو دەکەون کە ئەمریکا وازی لە نهێنیکەریی هێناوە کە دەکرا ئەگەر لە کۆندا ئەنجام بدرانە، بە چالاکی پەنهانیی لەقەڵەم دەدران. لە ساڵی ١٩٧٣دا، دوای تەمویلیکردنی ڕادیۆی ئازادی ئەورووپا لەلایەن سی ئای ئەیەوە ئاشکرا بوو، کۆنگرێس هەڵسا بە گۆڕینی میکانیزمی تەمویلکردنی ئاشکرا بە تەمویلی ئاشکرای حکومەت لەڕێگای دەزگای فیدراڵی سەربەخۆ. لەکاتێکدا ئەو ئاڵوگۆڕە بەشێوەیەکی خواستیارانە نەبووە، بەڵام کاریگەریی نەکردە سەر چالاکیەکانی هەردوو ڕادیۆکە.

بەهەمانشێوە، دوای وتاری *سەرۆک ریگان* لە لەندەن لە هەشتی حوزەیرانی ١٩٨٢، کە تیایدا داوای بەهێزکردنی ژێرخانی دیموکراسی لەسەر بنەمایەکی جیهانیی کرد، وەقفی نیشتیمانی بۆ دیموکراسی، کە ڕێکخراوێکی تەمویکراو لەلایەن حکومەتی فیدراڵەوە بوو، لە ساڵی ١٩٨٣دا دامەزرا. ئامانجی سەرەکی ئەم ڕێکخراوە بریتیی بوو لەوەی پشتیوانی ئاشکرا بدات بەو لایەنانەی کە هانی دیموکراسی و ژیانی دیموکراسیانە

دەدەن لە وڵاتانی دەرەوەدا کە تیایاندا دیموکراسیەت لاوازە، هەرەشەلێکراوە، یاخود هەر بوونی نییە.[i]

## چالاکی پەنهان و هەواڵگریی

بە تێروانینی چالاکیگەلێکی زۆر کە لەژێر چەتری چالاکی پەنهانیدا خۆیان دەبینیەوە، ئێستا با سەیرێکی پەیوەندیەکەی بکەین لەگەڵ هەموو هەواڵگریەکانی تردا. دوو پرسیاری گەوهەری خۆیان دەخەنە ناو ئەو گۆرەپانەوە. یەکەم، ئایا دەبێت چالاکی پەنهانی لە ڕێگای کۆکردنەوە زانیاریی وە دەزگا شیکاریەکانەوە بێت، یان دەبێت بچێتە پێکهاتەی خانەیەکی جیاوازەوە؟ دووەم، ئایا دەبێت چالاکی پەنهانی، لە ڕوانگەیەکی تەواو تیۆرییەوە، وەک بەشی هەواڵگریی دابنرێت؟

### ئایا چالاکی پەنهانی دەبێت جیابکرێتەوە؟

***ئارگومێنتی بۆ دەزگایەکی چالاکی پەنهانی جیا*** هەروەک لە بەشی یەکەمدا باسکرا، بەهۆی ئەزموونێکی زۆرەوە هەردوو دەوڵەتی بەریتانیا و ئەمریکا بۆیان دەرکەوتووە کە هەبوونی دوو دەزگای تایبەتمەند بە ئۆپەراسیۆنە نهێنییەکان- یەکێکیان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی (سیخوڕیی ئەمەی تریان بۆ چالاکی پەنهانی- دەبێتە هۆی سەر هەڵدانی کێشەی کرداریی جددی. لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا،

[i] David Lowe, "Idea to Reality: A Brief History of the National Endowment for Democracy," provides an account of the legislative history of NED's creation. Available at www.ned.org/about/about.html.

دەزگای جێبەجێکاری ئۆپەراسیۆنە تایبەتییەکانی بەریتانیا ($SOE$)، کە لەلایەن سەرۆک وەزیرانی ئەو وڵاتە وینستۆن چێرچل بەتۆمەتی "ئاگریارانی ئەوروپا" تۆمەتبارکرا، جیاواز بوو لە دەزگای هەواڵگریی نهێنیی($SIS$ یان $MI6$ )[i] وە ڕاپۆرتەکانی بۆ وەزیری کاروباری دارایی

---

[i] بۆ پاراستنی ئەم ئیمپراتۆریەت لە دوژمن بەڕێوەبەرایەتیەکی هەواڵگری دامەزرا لە سەدەی شانزەدا کە لەساڵی (١٩٧٣) ئاهەنگی یادی دامەزراندنی چوارسەد ساڵەی گێڕا. یەکەم دامەزرێنەری هەواڵگری بەریتانی لە ساڵی ١٥٧٣ دا فرەنسیس والشینگام بوو کە وەزیر و ڕاوێژکاری شاژن ئەلیزابێسی یەکەم بوو ، لەو سەردەمەدا دەستەیەک لە زیرەکترین دەرچوانی هەردوو زانکۆی (کامبریدج و ئۆکسفۆرد) لە هەواڵگری بەریتانی وەرگیران و لەسەر چۆنیەتی دزە کردن بۆ کۆشکی دوژمنانی شانشینی بەریتانیا ڕاهێنانیان پێکرا. ئەگەر تەماشای مێژووی هەواڵگری بەریتانی بکەین دەبینین کاتێک بەریتانیا خاوەنی بەهێزترین کەشتیگەلی دەریایی بووە هەواڵگری هەستاوە بە ناردنی زۆربەی بەکرێگیراوەکانی بۆ ئیسپانیا و ئەوانیش لەوێ وابڵاویان کردەوە کە هەر هێرشێکی ئیسپانیا بۆسەر بەریتانیا ئەنجامی تێکشکاندی لایەنی هێرشبەرە لەبەر ئەو کەشتی گەلە بەهێزەی کە بەریتانیا هەیەتی کە ئەم هەواڵانەش ترسیان خستە دڵی ئیسپانیەکانەوە و لە ئەنجامدا بڕیاری هێرشکردنە سەر بەریتانیایان هەڵوەشاندەوە، ئەمەش بۆمان دەردەخات کە هەواڵگری بەریتانی تەنانەت لەبواری ئەنجامدانی شەڕی دەروونیشدا ڕۆڵی گێڕاوە. دەزگای هەواڵگری بەریتانی لەسەرەتادا بە (ئەنتلجانس سێرڤس) ناوی دەرکرد کە لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا کارەکانی پێشکەوتنی پێوە دیار بوو، دەربارەی سەرچاوەی دروست بوونی (ئەنتلجانس سێرڤس) ئەوا دامەزراندی بەشێوەیەک ئاشکرا نییە، هەندێک کتێب ئاماژە بەوە دەکات کە شا جۆرجی یەکەم لەسەدەی هەژدەدا یەکەم پاشای بەریتانی بوو کە پشتی بە سیخوڕی بەستووە، لەدەورووبەری جەنگی جهانی

یەکەمدا (ئەنتلجانس سێرڤس) بوو بە دامەزراوەیەکی سیاسی گەورە کە سەرپەرشتی سیاسەتی بەریتانیای دەکرد لە هەموو جیهاندا، هەندێ سەرچاوە باس لەوە دەکەن کە هەواڵگری بەریتانی توانیویەتی دزە بکاتە ناو ئەندامانی کۆنسەی سەرکردایەتی شۆڕشی فەرەنسی و زۆربەری ئەندامانی ئەو کۆنسەیە بەکرێگیراوی هەواڵگری بەریتانی بوون. هەواڵگری بەریتانی لە مێژووی خۆیدا خاوەنی چەندین دەستکەوتە بۆ بەریتانیای مەزن، لە جەنگی جیهانی یەکەمدا هەواڵگری بەریتانی توانی کلیلی جفرەی ئەڵمانیەکان بەدەست بهێنێت و بەو هۆیەوە توانیان هەموو بروسکەکانی نێوان وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانی و باڵیۆزی ئەڵمانیا لە واشنتۆن دەست بخەن، هەواڵگری بەریتانی ئەم بروسکانەی وەک دیاریەک پێشکەشی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی کرد کە بەو هۆیەوە لە کۆتایدا ئەمریکا بڕیاریدا بەشداری جەنگ دژی ئەڵمانیا بکات کە تا پێش ئەو کاتە بێلایەنی خۆی پاراست بوو، بەڵام ئەو بروسکانەی کە لە نێوان وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیا و باڵیۆزی ئەڵمانیا لە واشنتۆن ئاڵوگۆڕ دەکران و کە لەکۆتایدا لەلایەن هەواڵگری بەریتانیەوە ئاشکراکران ئاماژەیان بەوە دەکرد کە ئەڵمانیا کار بۆ ئەوە دەکات لەگەڵ مەکسیکدا ڕێک بکەوێت بۆ دژایەتی کردنی ئەمریکا ئەگەر هاتوو ئەمریکا دژی ئەڵمانیا هاتە ناو ئەو جەنگە جیهانییەوە، ئەو بروسکانە ڕەوانەی باڵیۆزی ئەڵمانیا دەکرا لە مەکسیک کە بەزمانێکی نهێنی نوسرابوون کە کەس توانای لێتێگەیشتنی نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا هەواڵگری بەریتانی توانی ئاشکرای بکات . هەواڵگری بەریتانی بەردەوام بوو لە خۆبەهێزکردن و خۆڕێکخستن تا لە جەنگی جیهانی دووەمدا بە بەهێزترین هەواڵگری جیهان دەژمێردرا. بارەگای سەرۆکایەتی هەواڵگری بەریتانی لە شاری لەندەنە لە شەقامی وەزارەتەکان لە ناوچەی (هوایت هۆڵ) کە پێک دێت لە دوو لە تەلارە کۆنەکانی بەریتانیا کە یەک دەروازەیان هەیە، ئەوەی سەردانی بکات سەرەتا سەر لە پرسگە دەدات پاشان بەباخچەیەکدا تێپەڕ دەبێت تا دەگاتە تەلارەکە، لەهەموو دنیادا هەرکەسێک سەردانی بارەگایەکی هەواڵگری بکات هەست

بە ترسێک دەکات بەڵام ئەوەی بچێتە بارەگای هەواڵگری بەریتانی ڕوو لە هەر کونێک بکات ڕێزی لێدەگیرێت، پاش ئەوەی لە پرسگە کارتێکی شینی ئەدەنێ کە ناونیشان و ژمارەی نهۆم و ئەو ژوورەی کەسەردانی ئەکات لەسەری تۆمارکراوە، زۆرجار ئەوانەی بانگ دەکرێن بۆ بارەگای هەواڵگری بەریتانی هاوڵاتی بەریتانین کە بانگهێشت دەکرێن تا بۆچوونیان بزانن لەبارەی گومان لێکراوێکی بیانی، یان کاتێک بەکرێگیراوێکی هەواڵگری بەریتانی سەردانی بارەگا دەکات بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی بۆ سەفەرکردن بۆ وڵاتێکی کۆمۆنیستی، جا بۆ هەر مەبەستێک بێت لەبەرئەوەی سەفەرکردن بۆ ئەو وڵاتانە بەپێی یاسای بەریتانی پێویستی بەڕەزامەندی هەواڵگری هەیە، ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەک ئەو کەسە بکەوێتە داوی هەواڵگری ڕووسیەوە یان لەخشتە ببرێن. هەواڵگری بەریتانی لەڕووی پێکهاتن بەشە جۆراوجۆرەکانی لەشەش بەش پێک هاتووە ، کە هەربەشەی گرنگی خۆی هەیە بەم شێوەیە: ١- بەشی دەرەوە : ئەرکی چاودێری کردنی باڵیۆزخانەو نوێنەرە بیانیەکانە، بەشێوەیەک هەموو باڵیۆزخانەو قونسولیەتەکان دەکەونە ژێر چاودێری ئەم بەشەوە و تەنانەت چاودێری کەسایەتیە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانیش دەکرێت. ٢- بەشی دەریایی: هەندێجار پێی دەوترێ (فیلت ئەنتلجانس) ئەرکی چاودێری کردنی گەلە کەشتی بەریتانیایە بە ئەفسەر و سەربازەوە و هەروەها هەموو کارە سیخوڕیەکانی تایبەت بەهێزی دەریاوانی بەریتانی. ٣- بەشی سەربازی : ئەرکی سیخوڕی سەربازییەو زانینی ئامادەیی سەربازی و خۆپڕچەک کردنی دەوڵەتانی ترە، لەسەرروو هەموویانەوە (ڕووسیا) و ناردن ، ڕاهێنانی سیخوڕ بۆ هەمان مەبەست. ٤- بەشی بازرگانی و پیشەسازی : ئەرکی بریتیە لە زانینی نهێنی بازرگانی و پیشەسازی دەوڵەتانی تر. ٥- بەشی ناوخۆ : ئەرکی سەرەکی ئەم بەشە چاودێری کردنی بیانیەکان و چالاکیەکانیان ، چالاکی ڕێکخراوە بیانی ، خۆماڵیەکان. ٦-بەشی خاکە داگیرکراوەکان (مستعمرات): ئەرکی ئەم بەشە شارەزابوونە لە ژیان و باری سیاسی ئەو شوێنانەی کە بەریتانیا داگیری کردوون

(ئەم بەشە ئێستا نەماوە). ئەم شەش بەشە پێکەوە هەواڵگری بەریتانی پێک دێنن، لە نووسینگەکانی ئەم شەش بەشەوە چارەنووسی چەندین گەل و نەتەوە دیاری دەکرا، جگە لە پیلان گێڕی و داگیرکردنی سیاسەتی دەوڵەت، بەڕێوبەری ئەم بەشانە کەسانی پلەداری ناو حکومەت و سوپای بەریتانین. لەهەموو هەواڵگریەکانی جیهاندا دەبینین کە سەرۆکەکەیان ناسراوەو پلەو جێگای دیارە و دەتوانرێت سەردانی بکرێ و گفتوگۆی لەگەڵدا بکرێت بەڵام سەرۆکی هەواڵگری بەریتانی کەسایەتیەکی نادیارە و هەر لەسەردەمی دیک هوایتەوە تا دەگاتە ئەمڕۆ، جگە کەسانی زۆر نزیک نەبێت لە هەواڵگری و سەرۆکی هەر شەش بەشەکە کەسی تر نایناسێت، ئەم سەرۆکە بە هەڵبژاردن دیاری دەکرێت دوای ئەوەی سەرۆکی پێش خۆی کۆتایی بە خزمەتەکەی دێت بە خانە نشین بوون یان بە مردن، ئەم ڕێگایە لەسەردەمی (کرۆمۆیل) ەوە پیادە دەکرێت لە بەریتانیا، لە تەلاری سەرەکی بارەگای هەواڵگری بەریتانی هۆڵێکی گەورە هەیە کە بە جوانترین دیکۆر ڕازاوەتەوە ناوی هۆڵی (سی) ە، کە لەکاتی بەتاڵ بوونی پۆستی سەرۆک لەبەر یەکێک لەو هۆکارانەی کە باس کران هەر شەش سەرۆک بەشەکە لە هۆڵە سپییەکە کۆدەبنەوە و لە نێوان خۆیاندا سەرۆکێکی نوێ هەڵدەبژێرن و دەنگەکان دەخەنە زەرفێکەوە و دەیدەنە دەست بەتەمەن ترینیان تا بیکاتەوەو سەرۆکی تازە ئاشکرا بکات، کە پۆستەکەی لە ئاهەنگێکی تایبەتیدا دەدرێتێ، دوا ڕێوڕەسمی ئەو ئاهەنگە پێدانی کلیلێکی زێڕە کە هێمایە بۆ ئەو دەسەڵاتە فراوانەی کە پێی دەسپێردرێت ، ئەو کلیلە کلیلی نووسینگەی شاژنی بەریتانیایە واتا کەسی هەڵبژێردراو کراوە بە بەرپرس لە پاراستنی بەرژەوەندیەکانی هەموو ئیمپراتۆریەتی بەریتانی، پاشان وردە وردە ناوە ڕاستەقینەکەی نامێنێت و بە ناوێکی خوازراوەوە دەربدەکەوێت کە ئیمزای پێ دەکات دەبێت بە بەرپرسی هەموو فەرمانە سادەو ترسناکەکانی کە بۆ سەرانسەری جیهان دەری دەکات بەهۆی بێتەلەوە یان هەر شێوازێکی تر. ئەرکی سەرەکی هەواڵگری بەریتانی ئاگاداربوونە لە هەموو ڕووداوەکانی جیهان و بە

تایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندیان بە بەریتانیاوە هەیە، و ئاشکراکردنی نهێنی چالاکیەکان پێش ئەوەی دوژمن جێبەجێی بکات، ئەو نهێنیانە بە پلەی یەکەم نهێنی سەربازییە، پاشان زانیاری سیاسی و بازرگانی و پیشەسازی و دەریایی، بۆ ڕێکخستنی کارەکانی بەباشترین شێوە هەواڵگری بەریتانی کارمەندەکانی بەووردی هەڵدەبژێرێت لە نێوان کەسانی باوەڕپێکراوو دەرچوانی زانکۆکان و دڵسۆزانی ئیمپراتۆریەت. هەواڵگری بەریتانی بەوە ناسراوە کە پارەیەکی زۆر خەرج دەکات بۆ بەدەستهێنانی زانیاری سەربازی و زانینی چۆنیەتی ڕێکخستنی سەرکردایەتی وولاتانی تر(بەتایبەتی وولاتە کۆمۆنیستەکان) هەروەها ناوو پلەو جێگای بەرپرسانی سەرکردایەتی لە وولاتانی جیهاندا ،کاتێک زانیاریەکان دەگاتە بارەگای سەرەکی لە (هوایت هۆڵ) فەرمانبەری شارەزا هەڵدەستن بە تاوتوێ کردن و بەراورد کردنی ئەو زانیاریانە کە لایانە. هەواڵگری بەریتانی هەڵدەستێت بە ناردنی زیاد لە سیخوڕێک بۆ ئەو وولاتانەی کە بەرژەوەندی بەریتانیایان تێدایە، ئەم سیخوڕانە بەبێ ئەوەی یەکتر بناسن هەر یەکەو لەلایەن خۆیانەوە دەست دەکەن بە لێکۆڵینەوە و لە کۆتاییدا زانیاریەکان لە لەندەن شیکار و بەراورد دەکرێن و لە نۆسیەیەکی تایبەتیدا تۆمار دەکرێن. هەواڵگری بەریتانی خاوەنی ڕێکخستنێکی ئێجگار پتەوە و بەدەگمەن کەسێکی وەک سیخوڕ(کیم فلیبی) تێدا دووبارە دەبێتەوە کە خۆی بفرۆشێت بە وولاتێکی بێگانە بەهەر هۆکارێک بێت، بەڵکو لە دوای هەڵهاتنی(کیم فیلبی) بۆ ڕووسیا هەواڵگری وورياییەکی زیاد لە پێویست پەیڕەو دەکات و ئەو بەخشش و دیاریانەی کە دەیدات بە کارمەندەکانی و سیخوڕەکانی لە پاداشتی کارە باشەکانیان لە ئەقڵدا نییە! هەندێ لە شارەزایانی هەواڵگری ئەم بەخششەی هەواڵگری بەریتانی بە (ڕووبارێکی زێڕ) دادەنێن، ئەم ڕووبارە بە هەموو جیهاندا تێدەپەڕێ تا سیخوڕەکانی لێی بخۆنەوە، هەروەها هەواڵگری بەریتانی خاوەنی ئابووریەکی سەربەخۆیە و هەڵدەستێت بە بەشداریکردنی کاری بازرگانی لە ڕێگەی بەشی چوارەمییەوە ئەم بەشە هەڵدەستێت

دەنارد. ئەمە بووە هۆی سەرهەڵدانی نەیاریی لەنێو خۆیاندا وەک دوو دەزگای ڕکابەرییان کرد بۆ سەرچاوەی دەگمەن و کەم لە کێڵگەی بەپیتی هەواڵگرییدا.[i]

---

بە ئەنجامدانی گرێبەستی بازرگانی هاندانی زۆورە بازرگانییەکان کە بەم شێوەیە بڕە پارەیەکی باشی دەست دەکەوێت و دەیخاتە سەر بەشە بودجەکەی. لە کۆتاییدا گەر بمانەوێت سەروەرییەکانی هەواڵگری بەریتانی بژمێرین ئەوا لە ژماردن نایەت، سەرکەوتنی هەواڵگری بەریتانی دەگەڕێتەوە بۆ شارەزایی و لێهاتوویی کارمەندە ڕاهێنراوەکانی ئەوانەی چەندین ساڵیان لە خزمەت کردن بەسەر بردووە و کەسانی وای تێدایە بەدرێژایی تەمەنی خزمەتی کردووە تا کۆچی دوایی کردووە بۆیە نازناوی (پاسەوانی ڕاستەقینەی ئیمپراتۆریەت) ی پێبەخشراوە، زۆربەی کات هەواڵگری بەریتانی دەسەڵات پیادە دەکات بۆچوونی ئەو لە زۆر گرفتدا پیادە دەکرێت، هەر ئەوە پایەکانی ئاسایشی جێگیر کردووە لە وڵاتدا، کارمەندەکانی زیرەکترین کەسی بەریتانیان و خۆیان بەخت دەکەن لە پێناو وڵاتەکەیان، هەندێکیان مەدالیای جۆراو جۆریان پێدەبەخشرێت وەک پیاوانی هێزە چەکدارەکان، لەم بیست ساڵەی دواییدا هەواڵگری بەریتانی سیخوڕەکانی دەکرد بە پاشکۆی باڵیۆزخانەکان و هەندێکیان پۆستی دیبلۆماسیان دەدرێتێ تا پارێزراوبن ئەگەر ئاشکرا بوون لەو دەوڵەتانەی کاری تێدا دەکەن ، تەنها بەریتانی وەرناگیرێت بە فەرمانبەر یان سیخوڕ بەڵکو هەرکەسێک هەڵگری هەر ڕەگەزنامەیەک بێت و لەلایەن باڵیۆز یان بەرپرسێکی هەواڵگری بۆ کارکردن لە هەواڵگری بپاڵێورێت لە قوتابخانەی هەواڵگری مەشقی پێدەکرێت و ئەرکی سیخوڕی شیاوی بۆ دیاری دەکرێت.

[i] Christopher Andrew, *Her Majesty's Secret Service: The Making of the British Intelligence Community* (New York: Viking, ١٩٨٦), ٤٧٦–٧٧.

بە هەمانشێوە، لە ئەمریکادا، بەشێکی تایبەتی سی ئای ئەی پێی دەوترێت نووسینگەی هەماهەنگی سیاسیی (*OPC*)، لە ساڵی ١٩٤٨ بە ئامانجی ئەنجامدانی چالاکی پەنهانی دامەزرا. هەرچەندە لە ڕووی کارگێڕییەوە سەربە سی ئای ئەی بوو، بەڵام لەسەر بنەمای ڕێنمای سیاسیی ئاراستەکراو لەلایەن وەزارەتی دەرەوە کاری دەکرد. ئەم نووسینگەیە جیا بوو لە نووسینگەی سی ئای ئەی بۆ ئۆپەراسیۆنە تایبەتەکان (*OSO*)، کە کاری کۆکردنەوەی هەواڵگریی بوو لە ڕێگای سیخوڕییەوە. لەکۆتاییدا، درک بەوە کرا کە ئەم ڕێکخستنە چارەی دەربەدڵی ئامانجەکانی ناکات، وە لە ساڵی ١٩٥٢ هەردوو نووسینگەکە کرانەوە بەیەک لەژێر ناوی بەڕێوەبەرایەتی پلانەکان. بەگوێرەی وتەکانی کۆمیتەی کلێسا، ئەم هەنگاوە لەبەر ئەوە بوو چونکە؛ یەکەم، ئەو پێگەی بەڕێوەبەری هەواڵگری ناوەندی لە هەبوونی نووسینگەیەک (*OPC*) کە خۆی لە ڕووی کارگێڕییەوە بەرپرس بوو (وە لایەن سی ئای ئەی تەمویل دەکرا) وە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕێنمایی سیاسیی لە وەزارەتەکانی دەرەوە و بەرگریی وەردەگرت؛ دووەم، ڕکابەری لە نێوان هەردوو دەزگاکە بۆ خزمەتگوزاریەکانی هەمان هەواڵدۆز و بارقورسیەکانی دڵنیایی کارکردنی هەماهەنگی نێوانیان کە پێویست دەبوو، دڵنیابکاتەوە.

هەرچەندە لەڕووی شێوازی کارکردنەوە جیابوون، بەتایبەتی هەماهەنگی نهێنیی هەواڵدۆزەکان کە بتوانن بە باشی کاربکەن لە وڵاتی ئامانجدا. لە چەندین کەیسدا، ئەو هەواڵدۆزانەی کە سوودیان دەبوو بۆ وەزیفەیەک دەتوانن وەزیفەی تریش ئەنجام بدەن؛ دوو نووسینگەی جیا بەئاسانی دەکەونە ڕکەبەری یەکتر بۆ خزمەتگوزاریەکانی هەمان کەس. سەرەڕای

ئەمەش، بڕێکی زۆری وەزیفە پشتیوانییەکان، وەک دڵنیاکردنەوەی پەیوەندییەکان لە نێوان ئەفسەران و هەواڵدۆزەکان یان پارەدان بە سیخوڕەکانی دەرەوە، هەمان شتن یان چوونیەکن و پێویستیان بە هەمان لێهاتوویی، پەیوەندیی، وە سەرچاوە هەیە. هەماهەنگی نزیک پێویست دەبێت بۆ دڵنیایی کردنەوەی ئەوەی کە ئۆپەراسیۆنەکانی یەک نووسینگە لە وڵاتێکی دیاریکراودا دەست لە کاروباری یەکتر وەرنەدەن؛ دەسگیرکردنی ئەم جۆرە هەماهەنگییە قورسە بەتایبەتی ئەگەر پێویست بەوە بکات کە بەرژەوەندیەکانی نووسینگەیەک ببنە پاشکۆی هی ئەمەی تر. بەم شێوەیەش، دەتوانرێت کەیسێکی بەهێز دروست بکرێت بۆ لێکدانەوەی ئەم وەزیفانە لە یەک ڕێکخراودا کە ئۆپەراسیۆنەکانیان لە وڵات یان ناوچەیەکی ئامانجدا لەلایەن یەک بەڕێوەبەرەوە کۆنترۆڵکراوە.

***ئارگومێنتەکان لە بەرژەوەندی دەزگایەکی جیای چالاکی پەنهانی***

سەرەڕای بەڵگەی بەهێزی دژەجیاکردنەوەی دەزگاکانی سەر بە چالاکی پەنهانی، مشتومڕی بەهێزیش هەیە لەسەر ئەوەی کە دەبێت دەزگاکان جیابن. لە ڕووی کرداریيەوە، ئاروگمێنتەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێدانی هەمان بەرپرسیاریەتی بۆ جێبەجێکردنی سیاسەت (لە ڕێگای چالاکی پەنهانی) سەبارەت بە وڵاتێکی ئامانج، لەلایەک، کۆکردنەوە و شیکردنەوەی هەواڵگریی دەربارەی وڵاتەکە (بە خەملاندنی ئەنجامەکانی چالاکی پەنهانی) لەلایەکی ترەوە، دەبێتە هۆی خستنەمەترسی شیکردنەوەی بابەتیانە. لە گەوهەردا، ئەمە هەمان ئارگومێنتە کە بۆ بوونی دەزگایەکی هەواڵگریی ناوەندی دەکرێت واتە، ئارگومێنتێک کە

بەشێک نیە لە وەزارەتێکی یان بەشێکی داڕشتنی سیاسەت یان جێبەجێکردنی حکومەتەکە.

## ئایا چالاکی پەنهانی بەشێکە لە هەواڵگریی؟

جگە لەم پرسە دامەزراوەییە، پرسی تیۆری هەر دەمێنێت لەهەم ئەوەی ئایا چالاکی پەنهانی دەبێت بەشێک بێت لە هەواڵگریی یان نا. لەدانانی چالاکی پەنهانی لەناو پۆلێنی پێکهاتەکانی هەواڵگرییدا، من تێبینی ئەوە دەکەم کە ئەمە بەشێوەیەکی ئاسایی وەزیفەیەکە لە دەزگاکانی هەواڵگریی؛ ئەمە بەتەنها چارەسەری ئەو پرسە ناکات ئایا مەعقولە بەشێک بێت لە هەواڵگریی بۆ مەبەستی تیۆریی.[i]

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، دەبێت سەرنجی زیاترمان بخەینە سەر ئەوەی ئایا چالاکی پەنهانی چییە. هەروەک لە پێشتردا باسکرا، خودی چەمکەکە لە چەمکسازیی هەواڵگریی ئەمریکییەوە وەرگیراوە وە هیچ هاوتایەکی ڕوونی نییە لە بەکارهێنانەکانی دەزگا هەواڵگرییەکانی وڵاتانی تردا. هەروەها، پێناسە هەمەجۆرەکانی ئەمریکی بۆ چالاکی پەنهانی پەرەیان پێدراوە لە کۆنتێکستی ئەو هەوڵانەی کە دراون بۆ بەیاساکاردنی فەرمانی جێبەجێکردنی؛ ئەو پێناسانە سوودیان نییە بۆ مەبەستی تیرۆری هەنووکەیی.

---

[i] Kenneth G.Robertson, "The Study of Intelligence in the United States," in *Comparing Foreign Intelligence: The U.S., the USSR, the UK and the Third World,* ed. Roy Godson (McLean, Va.: Pergamon-Brassey's, ١٩٨٨), ٢٦–٢٨.

لە پێداچوونەوەی جۆرەکانی چالاکی پەنهانیدا، هەندێکیان (وەک پشتیوانی نهێنیی بۆ ڕژێمیکی دۆستانە) پێدەچێت لە دبلۆماسیەت جیانەکرێنەوە، وە ئەمانی تریش (وەک چالاکی نیمچە سەربازیی) دەچنە خانەی جەنگی گەریللاییەوە. ئێمە پێمان وایە کە ئەوەی دەکەوێتە نێوان دبلۆماسیەت و جەنگ پێی دەوترێت "چالاکی پەنهانی" کە پێک دێت لە بەکارهێنانی نهێنی تێکەیشتنی لایەنی تر بۆ ئەوەی وایان لێبکەن کردەیەک بگرنەبەر کە کەسێک وەک بەرژەوەندی خۆی دەیبینێت. بەم پێیە، دەبێت دووبارە بپرسین کە ئایا چالاکی پەنهانی لە ڕووی ژیرییەوە بەشێکە لە هەواڵگریی؟

لەلایەکەوە، گەنگەشەی ئەوە دەکرێت کە چالاکی پەنهانی- ئامرازێک بۆ جێبەجێکردنی سیاسەت- زۆر جیاوازە لە تەواوی بەشەکانی تری هەواڵگریی، کە سەروکاریان لەگەڵ کۆکردنەوەی زانیاریی هەیە کە لەسەر بنەمای ئەم زانیاریانە سیاسەت دادەڕێژرێت، هەربۆیە هەڵەیە وەک بەشێک لە هەواڵگریی دابنرێت. لەڕووی ئەم بۆچوونەوە بێت، زیاتر لۆژیکیە کە وەک بەشێک لە چەندین بەشی سیاسەت هەژمار بکرێت- وەک دبلۆماسیەت، هاوکاری ئابووریی، بازرگانیکردن، وە پڕوپاگەندەی ئاشکرا، ئاڵوگۆڕی بەرنامەکان، بەرنامەکانی ئاشتی، دبلۆماسیەتی گشتی، هاوکاری سەربازیی، وە هەڕەشە یان بەکارهێنانی هێزی سەربازیی- کە نەتەوەیەک بەکاری دەهێنێت بۆ پەرەدان بە بەرژەوەندیەکانی.

لەلایەکی تریشەوە، دەکرێت دژە ئەم بۆچوونەش هەبێت کە پێناسەکردنی هەواڵگریی وەک کۆکردنەوەی زانیاری لە فۆرمی دەزگاکە کەم دەکاتەوە و زۆر تەسکە؛ ئەگەر کۆکردنەوەی زانیاری زۆر گرنگ بێت، نکۆڵیکردن لە

زانیاری بەهادار بۆ نەیاری کەسێکیش دەبێت بەشێکی گرنگی هەواڵگریی بێت. هەروەک لە بەشەکانی داهاتوودا ڕوون دەبێتەوە، ڕێگایەکی کاریگەر و بەسوودی ڕێگاگرتن لە نەیارێک بۆ زانینی ڕاستی بریتییە لە هەڵخەڵەتاندنی بۆناو دۆخێکی بڕواپێکراوی هەڵە. لەم ڕوانگەیەوە، چالاکی پەنهانی و دژە هەواڵگریی چوونیەکی گرنگیان هەیە. بەتایبەتی، هەردووکیان کاردەکەن لە کاریگەریدانان لەسەر ڕەفتاری دوژمن بەهۆی بەکارامەیی بەکارهێنانی تێگەیشتنەکانی.

لەنێو پێکهاتەکانی هەواڵگرییدا، دەکرێت بڵێین دژەهەواڵگریی قورسترین بەشە بۆ پێناسەکردن. لە چەمکە هەرە گشتیەکەیدا، دەتوانین بڵێین دژەهەواڵگریی بریتییە لە کۆکراوە و شیکراوە، و چالاکی ئەنجامدراوە، بۆ پاراستنی نەتەوەیەک لە هەمبەر کردەی دەزگا هەواڵگرییەکانی دوژمندا. لەژێر ڕۆشنایی ئەم پێناسەیەدا، مەودای دژەهەواڵگریی وەک خودی هەواڵگریی فراوانە، لەبەر ئەوەی هەموو شێوازەکانی چالاکییە هەواڵگرییەکانی دوژمن دەبێت بەرگریان لە هەمبەر دابنرێت و بەرپەرچ بدرێنەوە. لە سیاقێکی تەسکتریشدا، دژەهەواڵگریی بریتییە لە ڕێگرتن لە دوژمن لە بەدەستهێنانی زانیاریگەلێک کە کەڵکی پێ بگەیەنێت. ئێمە سەرەتا لە بیرۆکەی دژەهەواڵگریی دەکۆڵینەوە.

دەتوانین گفتوگۆکەمان بە جیاوازیکردن لەنێوان ڕێوشوێنی پاسیڤ و چالاک دەست پێبکەین. گرنگتری هەنگاوەکانی پاسیڤ، کە هەوڵدەدات ڕێ لە دوژمن بگرێت بۆ بەدەستهێنانی زانیاریی، ئەمەش لە ڕێگای بلۆککردنی چوونەناو سیستەمەکەیەوە بە دروستکردنی دیوارێک لە چواردەورەکەی کە بە "ئاسایش" ناسراوە. سروشتی دیوارەکە ڕێگاگرتن لە دەست گەیشتن بە زانیاری هەستیار لەلایەن ئەو کەسانەوەی کە جێگای متمانە نین، پاراستنی بەڵگەنامەکان وە پەیوەندیەکانی گەیاندن لە شوێنی

سەلامەت و بەهۆی کۆدکردنەوە- لە برگەکانی داهاتووی سەبارەی بە ئاسایش باسکراوە. سەرەتا، حکومەتێک وەک بەشە جیاجیاکانی وە دەزگاکانی دەبێت بڕیار بدەن کە چ زانیارییەک زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بیپارێزن- واتە چ زانیارییەک دەبێت لەناو دیوارەکاندا بپارێزرێن.

## پۆلێنکردنی زانیاری

### ئاستەکانی پۆلێنکردن

سیستەمی پۆلێنکردن بریتییە لە ڕیزکردنی زانیاری بەپێی هەستیارییەکەیان، بە واتایەکی تر، گرنگترین ئەو زانیارییە کە ئەگەر بکەوێتە دەستی دوژمن زیادترین زیان بە نەتەوەکەی دەگەیەنێت، دەبێت زۆرترین ڕێوشوێن بگیرێتەبەر بۆ پاراستنی ئەو زانیارییە. لە ئەمریکادا، یەکەم سیستەمی لەم جۆرە بۆ پاراستنی بەڵگەنامەی ئاسایش نیشتیمانیی لەلایەن وەزارەتی جەنگەوە لە ساڵی ١٩١٢ بە یاسایی کرا؛ وەزارەتەکانی جەنگ و هێزی دەریایی سیستەمی پۆلێنکردنی خۆیان دارشت لە سەردەمی جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەمدا.[i] سەرۆک هاری ترومان یەکەم سیستەمی سەرتاسەری نیشتیمانی پۆلێنکردنی زانیارییەکانی لە ساڵی ١٩٥١ دامەزراند. ئەم سیستەمەی ئێستا بەهۆی بڕیارێکی سەرۆکایەتی لەلایەن سەرۆک کلینتۆنەوە لە ساڵی ١٩٩٥ بەڕێوەدەبرا کە بە تێروتەسەلی باسی پێناسە، یاسا، وە ڕێوشوێنەکان دەکات.

[i] Harold C. Relyea, "The Presidency and the People's Right to Know," in *The Presidency and Information Policy*, ed. Harold C. Relyea (New York: Center for the Study of the Presidency, ١٩٨١), ١١–١٩.

**هەستیاریی** سیستەمی پۆلێنی ئەمریکی بۆ پۆلێنکردنی زانیاریی بەپێی ڕێژەی زیانگەیاندن بە ئاسایشی نیشتیمانی-ئەگەر بکەوێتە دەستی دوژمن- پۆلێن کراوە. تا زانیاریەکە هەستیار بێت، زیاتر بەوریاییەوە دەپارێزرێت وە کەسی کەمتر کە متمانەپێکراون دەتوانن دەستیان پێ بگات. لەژێر سایەی ئەم سیستەمی ئێستادا، ئاستی سەرەتایی پۆلێنکردن بریتیین لە نهێنیی (تەنیا ڕێگا پێدراو بۆ کەسانی متمانەپێکراو)، نهێنیی، وە زۆر نهێنیی،[1] کە بەم پێیەی خوارەوە لەڕووی ئاستی زیانگەیاندن بە ئاسایسی نیشتیمانی دیاریکراون:

- زۆر نهێنیی: "زیانی کوشندە"
- نهێنیی: "زیانی جددی"
- نهێنیی ڕێگا پێدراو بۆ هەندێ کەسی تایبەت "زیان دەگەیەنێت"

سەرەڕای ئەمە، ژمارەیەکی زۆر وشیارکەرەوەی تریش بەکاردێن بۆ قەدەغەکردنی دەست گەیشتن بە زانیاری زیاتر. سەبارەت بە پرسە هەواڵگرییەکان، ئەو پرسانەی تایبەتن بە زانیاری دەربارەی تەکنیکەکانی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری تەکنیکیی: ئەم یاسا و ڕێسایانە لەلایەن بەڕێوەبەری هەواڵگریی ناوەندییەوە دەسەپێنرێن ($DCI$) بەسەر تەنانەت خودی کارمەندانیشیدا، چ جای بگاتە نەیارێک، ئەم کارە لەژێر یاسای

---

[1] Confidential
Secret
Top secret

ساڵی ١٩٤٧ی ئاساییشی نیشتیمانی ئەنجام دەدرێت، بۆ "پاراستنی سەرچاوەری هەواڵگریی و میتۆدەکان لە بڵاونەبوونەوەی ڕێگاپێنەدراو." بێگومان، لەوساوە تائێستا چەندین بەڵگەنامەی نهێنی گرنگ بڵاوبوونەتەوە بۆناو دەرەوەی کۆمەڵگای هەواڵگریی کە ئەوان پێیان وابووە لە ڕیزی زانیاری هەستیاردا بوون. هەربۆیە، بەشێوەیەکی خولیی هەوڵی زۆر تەرخان دەکرێت بۆ بە سیستەمکردن و تەسککردنەوەی ئەم پرۆسەیە؛ دوایین یاسایی سەرۆکایەتی، هەر بۆ نموونە، باس لەوە دەکات کە ژمارەی ئەو کەسانەی دەستیان بە پرۆگرامی تایبەت دەگات دەبێت "تا ئەوپەڕی کەمترین" کەس بێت. وەک دیارە ئەمە هەوڵ و تێکۆشانێکی ناکۆتاییە، وە ئەو وریاکردنەوە یەک لەدوای یەکانە نابێتە هۆی دروستکردنی پۆلێنێکی نوێ کە بە تەواوی درزەکردنی زانیاری لە ئاستی هەستیاردا نەهێڵێت.

***پێویستی زانین*** هەروەک لە سەرەوەدا تێبینی کرا، تا زانیارییەکە هەستیارتر بێت (لە ڕووی ئاستی پۆلێنکردنەوە)، ژمارەیەکی کەمتری خەڵک بۆیان هەیە لەبارەیەوە بزانن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنیا مۆڵەتی تایبەت بۆ هەندێ کەس بەس نییە بۆ پاراستنی زانیارییەکان. ئەو کەسانەی کە بەدوای دەست گەیشتن بە زانیارییەکاندا دەگەڕێن لەناو دەزگایەکدا دەبێت ئاگادار بکرێنەوە لەو زانیاریانە بۆ ئەوەی بە بەرپرسیاریەتی فەرمی خۆیان هەڵسن. ئەم سیستەمە کۆنترۆڵکراوەی زانیاری زۆر کەمتر فەرمییە بەبەراورد لەگەڵ ئەو کەسانەی متمانەکەیان پێدراوە؛ بەگشتی، هەرکەسێک کۆنترۆڵی زانیاری نهێنی بکات بەرپرسە

بۆ لێکۆڵینەوە لەو کەسانەی کە داوای ئەو زانیاریە دەکات بەرلەوەی زانیارییەکەی پێبدات.

## دەبێت چی نهێنیی بێت؟

وەڵامی سەرەتایی بۆ پرسیاری ئەوەی چ شتێک نهێنیی بێت، لە چوارچێوەی هەواڵگری حکومەتی ئەمریکادا، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئایا پێناسەی ئاستەکانی نهێنیی چین. ڕەنگە ئەمە لە ڕووی پرەنسیپەوە ئاسایی بێت، هەرچەندە چەمکی سەرەکی "زیانگەیاندن"، "زیانی جددی"، "زیانی کوشندە" ناڕوونن، لە خودی خۆیاندا وە لە جێبەجێکردنیان لە ئاسایشی نیشتیمانیدا.

با ئەو ڕاستیە وەک نموونە لەبەرچاوبگرین کە وڵاتە دیموکراتییەکان بەشێوەیەکی ئاسایی بڕی ئەو بودجەیەی کە تەرخاندەکرێت بۆ بەرگریی ساڵانە بڵاودەکەنەوە. هەرچەندە بە نهێنی هێشتنەوەی بودجەی بەرگریی وڵاتێکی دیموکراتی جێگای پرسیار نییە، حکومەتە نادیموکراتەکانیش هەمان کار ئەنجام دەدەن. بۆ نموونە، حکومەتی سۆڤیەتی جاران تا ساڵی ١٩٨٩ بڕی پارەی تەرخانکراو بۆ بەرگریی وەک نهێنی دەوڵەت سەیر دەکرد؛ بێگومان ئەمە بۆ حکومەتەکانی چین و کۆریای باکوور تائێستاش هەر ڕاستە، واتە بەهیچ شێوەیەک بڕی تەرخانکراو بۆ ئەم مەبەستە بڵاوناکەنەوە. هەواڵگریی ئەمریکا هەڵساوە بە تەرخانکردنی چەندین سەرچاوە بۆ بڕیاردان لەسەر قەبارەی ئەو بودجەی نهێنیەی بەرگریی؛ ئەگەر زانیاریەکە بە ڕێخۆشکەر دانەنرا بۆ حکومەتی ئەمریکا، سەرچاوە هەواڵگرییەکان ئەوا دەکرا بەسەر ئەرکەکانی تریشدا جێبەجێی بکەن. بە

هەمانشێوە، ئەگەر ئەمریکا بودجەی بەرگریی خۆی ئاشکرا نەکردبوایە، دەزگا هەواڵگرییەکانی تری دوژمن لە هەیبەت و گەورەیی توانا سەربازییەکانی ئەمریکایان کەم دەکردەوە.

***نهێنیی زیادلەپێویست*** ڕەخنەیەکی زۆر لە حکومەتی ئەمریکا دەگیرێت لە سەرئەوەی کە بڕێکی زۆری زانیاری بە نهێنیی و ئاستێکی زۆر باڵا دەهێڵێتەوە. ئەم ڕەخنەیە نەک تەنیا لە کۆمیتەی کۆنگرێسیی و ڕەخنەگرە ناحکومیەکانی دەزگاکانی هەواڵگریی یان ئیدارەی تایبەتیەکانەوە دەگیرێت بەڵکو تەنانەت لەناو خودی دەزگاکەشدا ئەم ڕەخنەیە هەیە. بە جۆرێک لە جۆرەکان، هەروەک پێشتر باسکرا، نهێنگەریی تایبەتمەندیەکی سروشتیی هەر حکومەتێکە. بەلەبەرچاوگرتنی گەورەیی و کراوەیی سیستەمی سیاسی ئەمریکا، ئەم ممارەسەیە زیاتر لەناو خودی ئەمریکادا ڕەخنەی لێدەگیرت وەک لە هەر شوێنێکی تری جیهان. لەم ساڵانەی دواییدا، هەمان پرس لە وڵاتانی تریشدا سەری هەڵدا، بەتایبەتی لە بەریتانیا، کە تیایدا ئەو یاسایەی بڵاوکردنەوەی زانیاری حکومەت بەڕێوەدەبات زۆر توندترن لە هی ئەمریکا.[1]

جگە لە زیانگەیاندنی سەرەکی- نکوڵیکردنی ناپێویستی زانیاری بۆ ڕای گشتی، کەمکردنەوەی تواناکانی بۆ تێگەیشتن وە گفتوگۆکردنی پرسی سیاسیی ئاساییشی نیشتیمانیی- زیادلەپێویست نهێنییکردن زیانی کەمکردنەوەی متمانەی سیستەمی نهێنیی هەیە، ئەمەش پەلدەکێشێت بۆ

---

[1] Rosamund Thomas, *Espionage and Secrecy: The Official Secrets Acts ١٩١١–١٩٨٩ of the United Kingdom* (New York: Routledge, ١٩٩١).

گوێنەدان بە یاساکان، ناوشیاریی، یە "دزەکردن"ی زانیارییەکان. ئەگەر ژمارەیەکی زۆری زانیاری بێ زیان بوون بە نهێنیی، رێگرتنەکان لە هەمبەر بڵاوکردنەوەی رێگاپێنەدراوی زانیاری نهێنیی لاواز دەبێت.

ئەو پرسەی کە ئایا ئەم زیادلەپێویست بە نهێنیدانانە لە حکومەتی ئەمریکادا هەیە یان نا، پرسیارێکە وەڵامەکە سەختە. لەکاتێکدا هەر سیستەمێک کە مامەڵە لەگەڵ ملیۆنان بەڵگەنامە دەکات لە هەر ساڵێکدا دەکرێت هەندێ جار بەرەو هەڵدێریش بڕوات. رەخنەیەکی باوی ئەو کەسانەی بڕوایان وایە زیادلەپێویست نهێنیی نابێت هەبێت بریتییە لەوەی کە پێیان وایە بەنهێنیی دانانی ئەو بەڵگەنامانە تەنیا بۆ ئەوەیە بەرپرسەکانی حکومەت بپارێزێت لە لۆمە و هەرسانبوونیان لەلایەن رای گشتی هاوڵاتیانەوە. بەواتایەکی تر، ئەم کەسانە دەڵێن کە بەنهێنیکردن خزمەت بە داپۆشینی کەموکورتی بەرپرسان دەکات لە هەمبەر خەڵک بۆ ئەو کردەوانەی ئەنجامیان داوە. لەکاتێکدا ئەمە هاندەرێکی پەسەندنەکراوە بۆ بەنهێنیکردن، دۆخەکە زۆربەی جار لەمە ئاڵۆزترە؛ ئاشکرابوونی عەیبوعاری بەرپرسان تەنیا مەسەلەیەکی ناوخۆیی نییە، بەڵکو خودی حکومەتیش پێی هەرسان دەبێت لە بەرامبەر هێزە دەرەکییەکاندا.

هەروەک باسکرا، نهێنیگەریی هەندێ جار زیاتر بۆ هۆکاری دبلۆماسی بەکاردێت وەک لەوەی چونکە بۆ کاری ئۆپەراسیۆنیی پێویست بێت. هەمان شت ڕاستە سەبارەت بە چالاکیەکانی سیاسەتی دەرەوە بەشێوەیەکی گشتی. هەروەک لە کەیسی چالاکی پەنهانیدا هەیە، حکومەتەکان بەشێوەیەکی گشتی لەم ساڵانەی دواییدا مەیلیان زیاتر بۆ ئەوە چووە کە زیاتر کراوە بن دەربارەی چەندین سیاسەتی دەرەوە

کەمتر نیگەرانی ورد و درشتی دبلۆماسین. حکومەتەکان ئێستا زیاتر لە پێشوو ددان بەوەدا دەنێن کە ئەوان خەریکی کاری سیخوڕیی و چالاکیە هەواڵگرییەکان بوونە. بەم شێوەیەش، بواری کەمتر هەیە بۆ پۆزش هێنانەوەی هەراسانکردنی حکومیی. هەربۆیەش، هۆکاری دیبلۆماسی ڕوون هەیە بۆ ئەم چەندە. بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٧٧دا ڕۆژنامەی *واشنتۆن پۆست* ڕوونی کردەوە کە مەلیک حوسێنی ئوردن لە سی ئای ئەیەوە هاوکاری دارایی وەرگرتووە، بانگەشەیەک کە تەنیا زیانی بە ناوبراو دەگەیاند لە ڕووی سیاسییەوە.[i] پاراستنی ئەم جۆرە پەیوەندییە نهێنییە بۆ خۆدوورگرتن لە هەراسانکردن وە لاوازکردنی پێگەی سیاسیی سەرۆکی وڵاتێکی دۆست هاندەرێکی شەرعییە بۆ نهێنیگەریی هەرچەندە لەڕووی ئۆپەراسیۆنیشەوە پێویست نییە.

**نهێنیگەریی کەم** هەرچەندە زۆرجار دەوترێت کە حکومەتەکان بەشێوەیەکی سروشتی زیاتر مەیلیان لە نهێنیگەریی زیادلەپێویستە، بەڵام دەکرێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە ئایا دەکرێت پێچەوانەکەشی لە هەندێک بواری تایبەتیدا دروست بێت. دەکرێت ئەمە لەگەڵ ئەو زانیارییانەدا ڕووبدات کە لەدەرەوەی حکومەتدا پەرەیان پێدراوە کە تاڕادەیەکی زۆر گرنگە بۆ ئاسایشی نیشتیمانیی بۆ ئەوەی وەک نهێنیی و کۆنترۆڵکراو لەقەڵەم بدرێت. ڕوونترین نموونەی ئەمەش بریتییە لەو زانیاریانەی پەیوەندییان بە تەکنەلۆژیای چەکی ئەتۆمیەوە هەیە. ئێمە پێشبینی ئەو زانیاریانە دەکەین کە ئاسانکاری بکەن بۆ تەشەنەکردنی

---

[i] Bob Woodward, "CIA Paid Millions to Jordan's King Hussein," *Washington Post*, February ١٨, ١٩٧٧, A١.

ناوەکی دەبێت بە وریاییەوە کۆنترۆڵ بکرێن، بەبێ گوێدانە ئەوەی ئایا ئەمە لە دەرەوە یان ناوەوەی حکومەتەوە سەرچاوەی گرتووە.

لە ئەمریکادا، ئەم پرسە لە یاسای وزەی ئەتۆمی ساڵی ١٩٥٤ بەڕوونی باسی لێوەکراوە، کە داتای قەدەغەی بەم شێوەیە پێناسە کردووە، "هەر داتایەک دەربارەی؛ یەکەم، دیزانین، بەرهەمهێنان، یان ئاسانکاری چەکی ئەتۆمی؛ دووەم، بەرهەمهێنانی ماددەی تایبەتی ناوەکی؛ یان، سێیەم، بەکارهێنانی ماددەی ناوەکی تایبەت لە بەرهەمهێنانی وزەدا." لەژێر ئەم یاسایەدا، ئەم جۆرە زانیاریانە ئامانجی کۆنترۆڵکردنن بەبێ گوێدانە ئەوەی ئایا لە دەرەوە یان ناوەوەی حکومەتدا پەرەیان پێدراوە. (هەروەها هەمان ماددە ڕێگا لە بڵاوبوونەوەی زانیاری نانهێنی دەگرێت دەربارەی دیزاین، وە ڕێوشوێنە ئاسایشیەکان بۆی، بنکەی جیاجیا بۆ بەرهەمهێنان یان سوودوەرگرتن لە ماددە ناوەکیەکان.) لەگەڵ ئەوەشدا، بڕێکی بەرچاوی زانیاری دەربارەی ماددەی ناوەکی وە چەک بۆ ڕای گشتی لە ئەمریکادا خراوەتەڕوو؛ لەبەر ئەمە جاریەجار ئەو قوتابیانەی لە بەشی فیزیا دەخوێنن دەبردرێنە کتێبخانەی نهێنیی بۆ دەستکەوتنی سەرچاوەی پێویست لەم بوارەدا، وە دروستکردنی سەرەتاکانی بۆمبی ناوەکی.

زانیاری تر کە ناکرێت نهێنیی بن، بەڵام دەکرێت لەژێر هەندێ دۆخی تایبەتدا، بە جۆرێک لە جۆرەکان بپارێزرێن، لەمانە پێکدێن:

- ئەو زانیارییە ئابووریانەی دەبنە هۆی ئەوەی وا لەکەسێک ▪▪کەن سوودی یاسایی بەدەست بهێنن لە ڕووی دارایی وە بازاڕکارییەوە
- ئەو زانیارییە تەکنەلۆژیانەی کە نەتەوەیەک بیوێت لە دوژمنەکانی بی پارێزێت لە بەدەستهێنانیان

- ئەو زانیارییە کەسیانەی کە دەکرێت وا لە دەزگایەکی هەواڵگریی دوژمن بکات بۆ تەجنیدکردنی بەرپرسە باڵاکانی حکومەت جا چ بەپێشکەشکردنی پارە بێت بۆ ئەوانەی کێشەی داراییان هەیە یاخود بە هەڕەشە بێت.

پاراستنی ئەم جۆرە زانیارییە پێکدێت لەئاسایشی گەیاندنەکان، هەروەک لە خوارەوە باس کراوە. هەرچەندە، جاروبارە، لە پرسی تریش دەگرێتەوە. بۆ نموونە، زۆر هەوڵ لە ئەمریکا دراون بۆ جێبەجێکردنی چەندین یاساوڕێسا لە هەمبەر ناردنی تەکنەلۆژیای بۆ بڵاوکردنەوە لە چەندین توێژینەوەی زانستی لەم بارەوە؛ سەرەڕای ئەمەش، هیچ سیستەمێکی گونجاو بۆ ئەنجامدانی ئەمە نەخراوەتە بواری پەرەسەندنەوە. لە ساڵی ١٩٨٢دا جێگری بەڕێوەبەری هەواڵگریی ناوەندی، ئەدمیرال *بۆب ڕای ئینمان*، لە وتارێکیدا بۆ دەزگای ئەمریکا بۆ پێشڤەچوونە زانستیەکان ئاماژەی بەم کێشەیەدا. دەربارەی لایەنی تیۆری و کردەکرایی لێکۆڵینەوەکە، ناوبراو نیگەرانی خۆی دەربڕی "کە بڵاوکردنەوەی ئەنجامی هەمەجۆری ئەم توێژینەوانە سەرنجی حکومەت و پێکهاتە دەرەکیەکان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت وە، بەم شێوەیەش، زیانی لەبنەهاتوو و ناپێویست بگەیەنێت بە بەرژەوەندییەکانی ئاسایشی نیشتیمانی ئەمریکا."
لەنێو ئەو بوارانەی کە تیایاندا بڵاوکردنەوەی زانیاری تەکنەلۆژیی دەکرێت زیان بە ئاسایشی نیشتیمانیی بگەیەنێت، *ئینمان* پێی وایە کە ئەم بوارانە پێکدێن لە: "هاردوێر و سۆفتوێری کۆمپیوتەر، تەکنیکەکانی تری ئەلیکترۆنی، لێزەرەکان، وە ڕێکارەکانی بەرهەمهێنانی تەکنەلۆژیا."
لە ساڵانی دوای ١٩٨٢، بڵاوبوونەوەی زانستی شیفرەسازیی بۆناو شەقام وای کرد کە ئەمریکا زیاتر ڕێوشوێنەکانی توند بکات دەربارەی کۆنترۆڵی

بەرنامەی سۆفتوێر کە دەتوانێت بەشێوەیەکی پێشکەوتوو شیفرەکان بشکێنێت. هەروەک لە بەشی دووەمدا باسکرا، توێژینەوەی زۆر ئەنجامدران دەربارەی زانستی شیفرەسازیی لە کەرتی تایبەتیدا، بێگومان ئەمەش بەهۆی پێشکەوتنی بواری تەکنەلۆژیای کۆمپیوتەرەوە ئەنجام دەدرا بۆ مەبەستی بازرگانیی. لەکاتێکدا ئەمە سودی زۆری هەیە لە بۆچوونی ئاسایشی نیشتیمانیەوە (بۆ نموونە، پەیوەندییە شیفرەکراوەکان دەکرێت ببنە هۆی پوچەڵکردنەوەی هەوڵەکان بۆ دزینی زانیاری تەکنەلۆژی لە ڕێگای هاککردنەوە بۆناو ئیمەیلی کۆمپانیاکان یان سیستەمی پەیوەندی ترەوە)، نیگەرانی دروستکردووە کە تیرۆرستان، گروپی تاوانباری ڕێکخراو، ساختەکردنی پارە، بتوانن دەستیان بەو شیفرانە بگات کە دەبنە هۆی گیرۆدەکردنی هەوڵەکانی جێبەجێکردنی یاسا لەم بوارەدا.

## پاراستن[i]

هەنگاوەکانی پاراستن بریتییە لەو هەنگاوانەی کە دەگیرێنە بەر بۆ ڕێگاگرتن لە تواناکانی دەزگایەکی هەواڵگری دوژمن بۆ کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی. ئەم جۆرە ڕێوشوێنانە دەگیرێنەبەر بۆ نەهێشتنی دەزگایەکی هەواڵگریی دوژمن لە بەدەست هێنانی ئەکسێس بۆ کارمەندی ڕێگەپێنەدراو، بەڵگەنامەکان، پەیوەندییەکان، یان ئۆپەراسیۆنەکان بۆ بەدەستهێنانی زانیاری گرنگ؛ ئەوان دیوارێک لە دەوری ئەو زانیارییە نهێنییانە دروست دەکەن. لایەنەکانی تەقلیدی پاراستن، کە کاری سەرەکی

---

[i] Security

ئەوەیە کاریکات بۆ پاراستن لەدژی هەوڵەکانی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی مرۆیی دوژمن، لەم برگەیەدا باس دەکرێن.

## پاراستنی کارمەند[i]

پاراستنی کارمەند بریتییە لە لێکۆڵینەوەی وردودرشتی کارمەن بەر لەوەی بۆ کارێک وەریگیرێن کە ببێتە هۆی ئەوەی دەستیان بە زانیاری بگات بۆ کە دەزگایەکی هەواڵگریی نەیار دەکرێت بیەوێت ئەم زانیارییە بەدەست بهێنێت، وە بۆ دڵنیابوونەوەی ئەوەی کە ئەو کارمەندە تازەیە بەردەوام ببێت لەسەر ئەکسێسی ئەم جۆرە زانیارییە. وەزیفەی سەرەکی ئەم پرۆسەیە بریتییە لە حوکمدان لەسەر ویست و توانای خودی کارمەندەکە بۆ پاراستنی ئەو زانیارییە نهێنیانە. پێکهاتەی سەرەکی ئەم بڕیاردانەش بریتییە لە کەسایەتیی و دڵسۆزیی ئەم کارمەندە بۆ کارەکەی. بڕیاردانەکان دەربارەی کەسایەتی دەبێت لە هەردوو ڕووی سەقامگیریی ئەقڵی کەسەکە و ئایا، جا بە هەر هۆکارێک بێت، ئەو کەسە ئەگەر هەڕەشەیەکی لێکرا لەلایەن دەزگایەکی هەواڵگریی دوژمن، کاردانەوەکانی چۆن دەبێت.

***لێکۆڵینەوەکان*** لە ئەمریکادا، لێکۆڵینەوە بڕیار لەسەر ئەوە دەدات کە ئایا کەسێک ئەکسێسی زانیاریەکی نهێنیی پێ بدرێت یاخود نا. لێکۆڵینەوەکە پشت بە پرسیارنامەیەکی ئاساییش دەبەستێت لەلایەن کەسەکەوە، کە دواتر لەلایەن پشکنەرێکی ئاژانسی نیشتیمانی پشتڕاست

---

[i] Personnel security

دەکرێتەوە بە پشت دەبەستێت بە هەستیاریی زانیارییەکە کە ئەکسێسی پێدەدرێت، چاوپێکەوتن لەگەڵ هاوڕێ و ناسیاوەکانی، دراوسێ تازە و کۆنەکانی، هاوپیشە و هاوپۆلەکانی. لە کەیسی زانیاری زۆر هەستیاردا، لێکۆڵینەوەیەکی خولی پێویستە بۆ ئەوەی ئەو کەسە بەردەوام بێت لە دەست گەیشتن بەو زانیارییانە. بەهۆی چەند هۆکارێکەوە، لێکۆڵینەوەی لە پاشخانی ئەو جۆرە ڕەنگە زۆر کاریگەر نەبێت لە دڵنیابوونەوە لە دڵسۆزیی و کەسایەتی ئەو کارمەندەی کە دەستی بە زانیاری نهێنی دەزگاکە دەگات.

چەندین برگەی یاسایی، هەر وەک لە بەشی داهاتوودا باسکراوە، دەبنە ڕێگر لەسەر کۆکردنەوەی زانیاریی لەلایەن *ئێف بی ئای* لە کۆکردنەوەی زانیاری ئەو کەسانەی دەیانەوێت لەگەڵ دەزگاکەدا کاربکەن، تەنانەت هەندێ جار کار دەکاتە ئەوەش کە ئەگەر کەسەکە بە ئاشکرایی لافی ڕوخانی حکومەتی ئەمریکاش لێبدات، هێشتا مافە یاساییەکان ڕێگرن لە پاراستنی تایبەتمەندیە یاساییەکانی ئەو کەسە.

سەرەڕای ئەمەش، گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیەکان لە ئەمریکادا کارەکەی بەشێوەیەکی بەرچاو گرانتر کردووە بۆ ئەوەی وەڵامی دروست لە ناسیاو، هاوپۆل، دراوسێ، وە ئەوانی تر وەربگیرێت. بەر لە هەر شتێک، جۆرە تووڕەییەک لەناو شەقامی ئەمریکادا هەیە وا لەو کەسانە دەکات کە پرسیاریان لێ دەکرێت دەربارەی کەسەکە کە وەڵامی نادروست بدەنەوە. هەروەها، گۆڕینی جوگرافیای خانەوادە و تاکەکەسەکانی لە کۆمەڵگای ئەمریکدا وای کردووە کە دۆزینەوەی ناسیاو و دراوسێی کۆن زۆر قورس بێت وە ئەمەش بەو واتایە دێت کە دەکرێت زانیارییەکان دەستکرد و

دروست نەبن، تەنانەت ئەگەر لەکۆتاییدا بتوانن بیاندۆزنەوە. بەدرێژایی سالآنی نەوەدەکاندا، ژینگەی سیاسی بەو واتایە دەهات کە وەلآمدەرەوەکان کەمتر وەلآمی دڵسۆزیی و وەلآمی ئەو کاندیدەی دەدایەوە. هەمان شت دروستە سەبارەت بە پرسیاری کەسایەتی و شێوازی ژیان. بۆ نموونە، بەرزبوونەوەی رێژەی بەکارهێنانی تریاک لەنێو چینی مامناوەندیدا (بەتایبەتی گەنجەکان) لەماوەی چەند دەیەی رابردوودا کارەکەی قورستر کردووە بۆ جیاکردنەوەی ئەو کەیسانەی کە بەکارهێنەرای پێشووی ئەو ماددە هۆشبەرانە کێشەی کەسایەتی راستەقینەی هەبووە وە ئێستا موعەرەزە بۆ هەرەشە لەلایەن ئەو کەسانەوەی کە کارەکەیان لەگەڵدا ئەنجام دەدا یان نا.

لەکۆتاییدا، پرسیاری ئەوە دێتەگۆرێ کە ئایا هەواڵدەرەکان دەتوانن دڵنیابن لەوەی کە تێبینیەکانیان لەسەر ئەو کەسە بە نهێنیی دەمێننەوە یان نا. لەژێر یاسای تایبەتمەندیی ساڵی ١٩٧٤، هاوڵاتی مافی تەواوی هەیە بۆ دەست گەیشتن بە فایلی حکومیی دەربارەی خۆیان؛ لەکاتێکدا هەڵاوێردنێک دەبێت بکرێت کە رێگا بە دەزگا لێکۆڵەرەکان دەدات کە ناوی هەواڵدەرەکە ئاشکرا نەکات کە داوا دەکات ناوەکەی بە نەناسراوی بهێڵرێتەوە، بێگومان ئەگەر ناسنامەی ئەو کەسە نەشاردرێتەوە ئەوا دەکرێت لە داهاتوودا تووشی کێشەی مەزن بێت لەلایەن بەرپرزێرەکەوە.

سەرەتا، ئەم هەواڵدەرە شارلوانە نیگەران دەبن دەربارەی ئەو ئەگەری کە ناو و ناسنامەکانیان ئاشکرا دەبێت. دواتر، دەکرێت ئەوان نیگەرانی ئەوە بن کە تەنانەت ئەگەر بێتوو ناسنامەکانیشیان ئاشکرا نەبن، جار هەیە ئەو کەسەی لیکۆڵینەوەکە دەکات بەبێ ئاگاداری هەندێ زانیاری ناگرنگ

بەدرکێنێت کە ڕەنگە ئاماژەبن بۆ ناسینەوەی ئەو زانیارییە لەلایەن بەرپرسەکانەوە.

یەکێکی تر لە میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی پاشخان وەک پاراستن خۆپارێزیی لە هێنانی فەرمانبەری ناشایستە بریتییە لە بەکارهێنانی ئامێری ئاشکراکردنی درۆ.[i] ئەم تەکنیکە بەزۆری لەلایەن دەزگا هەواڵگرییە ئەمریکیەکانەوە بەکارهاتووە؛ نە دەزگا هەواڵگرییە خۆرئاواییەکانی تر نە دەزگا نا خۆرئاواییەکانیش ئەوەندەی ئەمریکیەکان متمانەیان پێ نییە. لەناو ئەمریکادا، دەزگای دەزگای هەواڵگریی ناوەندیی(*CIA*) جەختێکی زۆر لە بەکارهێنانی ئەم ئامێرە دەکاتەوە. دەزگاکە پێویستی بەوەیە کە هەر بەرپرسێک بۆ دامەزراندن تاقیکردنەوەیەکی ئەم ئامێرە بکات و هەموو کارمەندانیش بەشێوەیەکی خولیی ئەم تاقیکردنەوەیان لەسەر ئەنجام بدرێت وەک مەرجێک بۆ بەردەوامبوون لەسەر فەرمانبەرییان. سەرەڕای ئەمەش، بەدرێژایی چەندین ساڵ، لەناو خودی دام و دەزگاکانی ئەمریکادا بەرەنگاربوونەوەیەکی باش هەبوو لەدژی بەکارهێنانی ئەم ئامێرە. لەلایەکی ترەوە، دوای دەزگیرکردنی *جیۆفری پرایمی* سیخوڕ، فەرمانبەرێکی بارەگای سەرەکی گەیاندنی حکومەتی بەریتانیی،[ii] بەرپرسە ئەمریکیەکان پێیان وابوو کە دەبێت تاقیکردنەوەی ئەو ئامێرە لەسەر کارمەندانی ئەم فەرمانگەیە ئەنجام بدرێت.(بڕوا وایە کە *پرایم* دەستی هەبووە لە ئاشکراکردنی تواناکانی پەیوەندییەکانی گەیاندنی هەماهەنگی نێوان بەریتانیا و ئەمریکا.) هەڕەشە نادیارەکە بریتیی بوو لەوەی کە ئەمریکا ئارەزووی کەمتری دەبێت بۆ ئەوەی هەماهەنگی لەسەر

---

[i] polygraph machine
[ii] the British communications intelligence agency

مەسەلەکانی گەیاندنی هەواڵگریی بکات ئەگەر کارمەندەکانی هەواڵگریی بەریتانیا ئەم تاقیکردنەوەیان لەسەر ئەنجام نەدرێت.

لەکاتێکدا وادەردەکەوێت بەکارهێنانی ئەو ئامێرە کاریگەرییەکی بەهێزی هەبێت لە ئاشکراکردنی زانیاری شاراوەدا، بەڵام هێشتاش گەنگەشەیەکی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی ئایا سەد لەسەد زانیارییەکانی وردە یان نا. جگە لە پرسی ئەوەی دەکرێت ئەو ئامێرە کەسانی بێ توانا لە دامەزراندن بێ بەشبکات، بەڵام دەزگا هەواڵگرییەکان چەندین میتۆدی تریان پەرەپێداوە بۆ زاڵبوون بەسەر هەڵەکانی ئەو ئامێرەدا. لەوانەیە دیارترین بەڵگە نادەقیقی ئەو ئامێرە لە کەیسی *ئاڵدریچ ئەیمز*ی کارمەندی سی ئای ئەیدا دەرکەوێت کە سیخوڕی بۆ یەکێتی سۆڤیەت ■ ڕووسیا کرد بۆ ماوەی نزیکەی نۆ ساڵ، لە نیسانی ١٩٨٥ەوە بۆ شوباتی ١٩٩٤. لە دوو بۆنەدا لەو ماوەیەدا (١٩٨٦ و ١٩٩١)، ناوبراو لە تاقیکردنەوەی ئەو ئامێرە (*polygraph*) بە سەرکەوتوویی دەرچوو.[i]

***سروشتی گۆڕانی بەردەوامی هەڕەشەکە*** لەوەتەی ناوەڕاستەکانی سالانی حەفتاکانەوە، زنجیرەیەک لە کەیسی سیخوڕی لەناو کارمەندانی دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکادا سەریان هەڵدا. لەم جۆرە کەیسانەدا، هاندەر ■ کارتێکەری سەرەکی بەزۆری دارایی بووە، کەم جار هەبوو بەهۆی ناسەقامگیریی سۆزدارییەوە بووبێت. یەکێک لە کەیسە هەرە سەرنجڕاکێشەکان لەم بوارەدا بریتییە لە کەیسی *ڕۆبەرت فلیپ هانسن*،

---

[i] U.S. Senate, Select Committee on Intelligence, *An Assessment of the Aldrich H. Ames Espionage Case and Its Implications for U.S. Intelligence*, November ١, ١٩٩٤, ٣٢–٣٤, ٧١–٧٤.

کارمەندی *ئێف بی ئای* کە سیخوڕیی بۆ سۆڤیەت و ڕووسیا کرد لە ساڵی ١٩٨٥ەوە تا ئەوکاتەی لەساڵی ٢٠٠١دا دەستگیرکرا؛ نامەکانی بۆ کەسانی وەرگر ئەوەمان پێ دەڵێن کە ناوبراو دڵسۆز بووە بۆ هەواڵگری سۆڤیەت و ڕووسیا کە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئایدۆلۆژیادا نەبوو.

بەبەراورد لەگەڵ کەیسەکانی بەریتانیا لە بوارەدا لە ساڵانی ١٩٤٠ و ١٩٥٠کاندا (بەتایبەتی کەیسی *ڕۆسنبێرگ* و کیم *فیلبی*)، ناچوونیەکی بەرچاو لە نێوان هەردووکیاندا بەدی دەرێت، کە تیایاندا هاندەری سەرەکی بریتیی بووە لە پرسی ئایدۆلۆژیا. ئەم کەیسانە ئەوە دەسەلمێنن دەبێت هەنگاوی زیاتر بگیرێتەبەر کە ببنە هۆی بەرەپێشبرنی ئاسایشی فەرمانبەران، وەک بەرەپێشبردنی پرۆفایلی سایکۆلۆژی تیروتەسەل و دامەزراندنی سیستەمیک بۆ ئاگادارکردنەوەی بەرپرسان کاتێک کار لەسەر زانیاری نهێنیی دەکەن، جا گرنگ نییە فەرمانبەرەکە لە چ ئاستێکدایە.

## پاراستنی جەستەیی[i]

ئاسایشی جەستەیی بریتییە لەو هەنگاوانەی کە گیراونەتەبەر بۆ ڕێگاگرتن لە سیخوڕانی هەواڵگری بیانی لە دەستەگەیشتن بە ئەکسێسی جەستەیی بۆناو زانیاری نهێنیی. ئەم جۆرە کار لەسەر ئەوە دەکات کە ئەو زانیارییە نهێنیانە بپارێزێت لە دەستگەیشتنی جەستەیی، وە دانانی سیستەمی ئاگاداریی بۆ زانینی هەر هەنگاوێکی جەستەیی ڕێگاپێنەدراو بۆ ناو شوێنێک کە تیایدا دەسەڵاتداران پێیان وایە زانیارییەکان نهێنین وە سیستەمی پێشکەوتووی وشەبڕی بەهێز بۆ پاراستنی ئەو داتا

---

[i] Physical security

نهێنیانەی لە کۆمپیوتەرەکاندا هەن. پێویستیەکانی ئاسایشی جەستەیی زۆر سەیر و سەمەرە نین کە کەس تێیان نەگات وە تەنیا لەڕووی ڕێژەوە جیاوازە لەو وشەبڕانە یان سیستەمی ئاگادارکردنەوەی دەزگایەکی بازرگانی بەکاریان دەهێنێت بۆ پاراستنی سامانەکەی لە دزین.

یەکێک لە جیاوازییە هەرە بەرچاوەکان بریتییە لەوەی کە تاکە ئامانجی ئاسایشی فیزیکی تەنیا پاراستنی ئەو ماددەیە نیە لەوەی نەدزرێن یان دەستیان پێ نەگات، بەڵکو پاراستنی خودی زانیاریەکەش گرنگییەکی تایبەتی هەیە. ئەمە پێویستی بە ڕێوشوێنی توند هەیە لە قەدەغەی ئەو شوێنانەی ئە زانیاریانەی تیادایە، وە هەر ناوچەیەک ئەم جۆرە فایلانە لەخۆبگرێت پێویستە بەتوندی کۆنترۆڵ بکرێن چونکە کەسی ڕێگاپێنەدراو دەتوانێت بە ئاسانی ئامێرێکی بچوکی چاوەدێری تیایدا دابنێت کە ببێتە هۆی ئەوەی دەزگای هەواڵگری دوژمن بەئاسانی دەستی بەو شوێنە بگات کە جێگای کاری زۆر نهێنییە لەو باڵەخانەیەی بەڵگەنامەکانی تیادا پارێزراوە. هەربۆیە، زۆر گرنگە بزانرێت کە چ شتێک دەبردرێتە ئەو شوێنە وە چ شتێکیش لەوێوە دەبردرێت.

بە هەمانشێوەش، گرنگە دەزگای هەواڵگری خاوەندی چەند ئامرازێکی "پاککردنەوە"ی بێت بۆ ئەوەی بتوانێت شوێنی ئەو ئامێرە سیخوڕیانە بدۆزێتەوە و لایان بدات.[i] بێگومان، بەئەنجامدانی ئەم کارە، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی چاوەدێریکردنی گفتوگۆکانیش لەناو مەمەڕ یان ژووری ئەم فایلانە هەمووی دەخرێتە ژێر چاوەدێری وردەوە. یەکێ لە گرنگترین ئەو شوێنانەی کە ئامێری تەکنەلۆژیای زۆر تیادا بەکارهاتووە بۆ ئەم مەبەستە

---

[i] bugging devices

برینییە لە باڵیۆزخانە ئەمریکا لە شاری مۆسکۆ. بۆ نموونە، لەساڵانی حەفتاکاندا، ئاریەلیکی سۆڤیەت لە دووکەڵکیشی ژووری بڕیاردانی سیاسیی دۆزرایەوە. دواتر، لە ساڵانی هەشتاکاندا، ژمارەیەکی بەرچاوی مەکینەی نووسینی ئەلیکترۆنی باڵیۆزخانەکە دەرکەوت کە ئامێری سیخوڕیی بیستۆکیان تیادا داناوە.[i] دواتر، ئاشکراکرا کە سۆڤیەتیەکان ئەواوی ژوورەکەیان پڕکرووە لە ئامێری سیخوڕیی. سۆڤیەتیەکان ڕێگایان پێدرا، بەبێ هیچ چاوەدێرییەکی ئەمریکی، کە هەڵسن بە بنیادنانی هەموو پایە و جسری کۆنکریتی ئامادەکراو کە ژوورەکەیان لێوە بنیادنرا. سۆڤیەتیەکان سوودیان لەو بۆشاییەوە ئاساییشیەی ئەمریکیەکان وەرگرت بۆ دانانی سیستەمی ئامێری سیخوڕیی کە سەرجەم پێکهاتەکەی بەکارهێنا وەک ئاریەلێک بۆ وەرگرتنی سیگناڵی دەنگی وە پشت بەستن پێیان بۆ کاری سیخوڕیی. سیستەمەکە زۆر پێشکەوتوو دیاربوو، وە ئەمریکا هێشتاش تێنەگەیشتووە چۆن ئەو کارەیان کردووە.!

## دژەسیخوڕیی[ii]

ئەو ڕێوشوێنە ئەمنیانەی لەسەرەوە باسکرا، هەموویان پاسیڤن، لەوەوەدا کە ئەم هەنگاوانە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەرەنگاری هەواڵگریی دوژمن نابێتەوە بەڵکو تەنیا قەدەغەی ئەوە دەکات کە دوژمن دەستی بە زانیارییەکان نەگات. هەنگاوی چالاکتر کە هەوڵێکن بۆ تێگەیشتن لەوەی چۆن دەزگایەکی هەواڵگریی دوژمن کاردەکات بۆئەوەی ئەم چالاکیانەی

---

[i] U.S. Senate, Select Committee on Intelligence, *Meeting the Espionage Challenge*,٣٤-٣٥.
[ii] counterespionage

پەک بخات وە لەکۆتاییدا ئەم چالاکیانە لە سوودی خۆی تەواو بکات پێیان دەوترێت *دژەهەواڵگری*.

## چاوەدێری تۆپەراسیۆنەکان

ڕێگایەکی دیار بۆ زانینی چالاکیەکانی دەزگایەکی هەواڵگریی دوژمن بریتییە لەزیادکردنی چاوەدێری تۆپەراسیۆنەکان لەدژی ئەفسەرەکانی (بیانخاتە ژێر چاوەدێری بەردەوام) هەرکاتێک خەریکی کاریکی سیخوڕیی بن. ئەم جۆرە چاوەدێرییە هەوڵدەدات شوێنی ئەو ئەفسەر یەکلایی بکاتەوە وە لەگەڵ کێ پەیوەندی دەکات یان لە پەیوەندیدایە؛ دواتر ئەم پەیوەندیانە دەتوانرێت بەکاربهێنرێن بۆ دۆزینەوەی سەرەداوی زیاتر بۆ لێکۆڵینەوە.

هەرچەندە ئەمە لە بیرۆکەدا ئاسانە، بەڵام لە پراکتیکدا ئەرکێکی زۆر قورسە. میتۆد و ڕێگا تایبەتیەکانی ئەفسەرەکە تەرخاندەکرێت بۆ پەکخستنی ئەو چالاکییە. ئەو ئەفسەرە تەنیا فێری خۆدزینەوە لە چاوەدێری ناکرێت، بەڵکو فێری چەندین تەکنیکیش دەکرێت وەک ئاڵوگۆڕی جانتا لە شوێنێکی قەڵەباڵغ کە دەکرێت بەکاربێت بۆ شاردنەوەی ناسنامەی کەسەکە لەگەڵ ئەو کەسانەی لەگەڵیدا لە پەیوەندیدایە. هەروەها، ئەگەر چاوەدێرییەکە هەستی پێکرا، دەکرێت هانی ئەفسەرکە بدێت بۆ ئەوەی لە هەر پلانێکیچاوپێکەوتن پاشگەزبێتەوە بۆ نەخستنەمەترسی پەیوەندیەکەی. بەم شێوەیە، کارێکی گرنگە چاوەدێرییەکە شاراوە بێت. ئەم کارە بێگومان قورسە وە پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر لە هێزی کار هەیە، چونکە ئەو ئەفسەرەی مەشقپێکراوە

لە تەکنیکەکانی دژەچاوەدێریی تێبینی دەکات ئەگەر هەمان کەس بۆ ماوەیەکی زیاتر شوێن پێی بکەوێت.

لەبەرئەوەی ئەم ئامێرە چاوەدێریانە زۆر قورس و گرانبەهان، زۆر گرنگە لە دژی ئامانجی دروستی ئەفسەری هەواڵگریی بەکاربهێنرێن. بێگومان یەکێک لە گرنگترین شوێنەکان کە سەیر بکرێت بریتییە لە جۆرەکانی شوێنی دیاری کارمەندە نهێنییەکە لە هەمبەر دەزگای هەواڵگریی دوژمن: دیپلۆماتەکان، کارمەندانی باڵای قونسڵخانەکان، نوێنەرانی بازرگانیی، ئەو ڕۆژنامەنووسانەی لەگەڵ میدیا حکومەت کاردەکەن، وە کارمەندانی نێودەوڵەتی ڕێکخراوەکانی وەک نەتەوە یەکگرتووەکان، کاتێک کارمەندان لەلایەن حکومەتەکانیانەوە دیاری دەکرێن. گرفتی بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە چ کەسێک هەڵگریی ئەم پێگانەیە، گرفتی هەرە سەرەکی ئەفسەری هەواڵگرییە.

ئەم کێشەیە دەکرێت بە چەندین ڕێگا پێشی بگیرێت. بەگشتی، تا ئەفسەرەکە زیاتر زانیاری هەبێت دەربارەی ئەو ئۆپەراسیۆنەی باڵیۆزخانەیەکی بیانی دیاریکراو، زیاتر دەتوانێت بزانێت کامە بەرپرس هەڵگری ئەو پێگانەیە کە لەسەرەوە باسکران. ئەگەر بەرپرسێک واپێنەچوو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ تێوەگلابێت لە چالاکیەکە، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەکرێت لە کاری هەواڵگریی بەژداربووێت، لە ڕووی پلاندانان و ڕێنوێنیکردنی پرۆسەکە.

بە هەمانشێوە، دەکرێت بە جێگۆڕکێ پێکردنی کارمەنداندیش ئەم گرفتە چارەسەر بکرێت، بەڵام دەبێت وشیار بن لەوەی کە کێ جێگای کێ دەگرێتەوە؛ واتە، ئەگەر پێگەی کارمەندێک ئەفسەری هەواڵگریی

بێت (وەک پلەی وەزیفی)، ئەوەی جێگای دەگرێتەوە دەبێت هەمان پلەی هەبێت. هەروەها، هەمان ئەو تەکنیکانە دەکرێت لەناو خاکی دوژمندا بەکاربهێنن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پلانەی دەزگا هاواڵگرییەکانی ئەو وڵاتە نەیارە. تا زیاتر شارەزایی هەبێت لەبارە چۆنیەتی کارکردنی ئەو چالاکیانە، ئەو ئامێرە چاوەدێریانە زیاتر دەبنە ئامانجی دەزگا هەواڵگرییەکان. لەکۆتاییدا، سیخوڕی دووسەرە، هەروەک لەبەشەکانی داهاتوودا باسدەکرێت، دەکرێت بتوانێت ناسنامەی ئەفسەرەکانی هەواڵگریی بیانی دیاری بکات.

## کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی

ڕاستەوخۆترین ڕێگا بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی دژەهەواڵگریی بریتییە لە کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی ڕاستەوخۆ لە دەزگای دوژمن، جا چ بەڕێی مرۆڤەوە یان ئامرازی تەکنیکەوە بێت. بۆ نموونە، لەساڵانی دوای جەنگی جیهانی دووەمدا، سیخوڕی سۆڤیەتی، کیم *فیلبی*، کە لەناو دەزگای هەواڵگریی بەریتانیا (*MI 6*) کاری دەکرد، توانی زانیاری لەکاتی خۆیدا بە ئەفسەرە هەواڵگرییەکانی (*KGB*) بدات سەبارەت بە تۆپەڕاسیۆنە نهێنییەکانی ئەمریکا و بەریتانیا لە وڵاتانی بەلتیک، ئۆکرانیا، ڕووسیا، وە ئەلبانیا.[i] بۆ ساڵی ١٩٥١، کاتێک *فیلبی* لە دەزگاکە دەرکرا، ناوبراو ناوی سەدان سیخوڕی ئەمریکی و بەریتانی بۆ دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت ئاشکرا کرد. لە کردەیەی هاوشێوەدا، هەواڵگری بەریتانی لە

---

[i] بڕوانە:
Macintyre, B. (٢٠١٤). *A Spy Among Friends: Kim Philby and the Great Betrayal*. A&C Black.

سەرەتای ساڵانی هەشتاکاندا هاوڵاتیەکی سیخوڕی سۆڤیەتی لە لەندەن بەناوی تۆلێگ گۆردیێڤسکی ئاشکرا کرد وەک یەکێک لە کەسە پلەباڵاکانی ناو دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت دایە هەژمار و سوودی زۆری لێ بینی. ناوبراو توانی دڵنیایی ئەوە بداتە بەریتانیەکان کە دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (KGB) هیچ سەرچاوەیەکی نیە لەناو(MI٥)[i] یان (MI٦) وە لەساڵی ١٩٨٣دا یەکسەر ئەوانی ئاگادارکردەوە لەوەی کە ئەفسەرێکی زویربووی (MI٥) ویستوویەتی سیخوڕیی بۆ دەزگای هەواڵگریی سۆڤیەت بکات.[ii]

هەروەک ئەم نموونانەی بۆما ڕوون دەکەنەوە، دژەهەواڵگریی لەم ڕووەوە جیاوازی نییە لە کۆکردنەوەی هەواڵگریی بەشێوەیەکی گشتی؛ سەرەڕای ئەمەش، ئامانجەکەی بریتیی دەبێت لە دەزگای هەواڵگری دوژمن نەوەک سەرکردایەتی حکومیی، هێزی چەکدار، یاخود دەزگاکانی تر.

## هەلاتووەکان و سیخوڕی دووسەرە

هەروەک دەزانین ئامانجی سەرەکی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی لە ڕێگای مرۆڤەوە بەزۆری لەسەر کۆمەڵگایەکی داخراوی وەک یەکێتی سۆڤیەت وەڕاست وەردەگەڕا، بەڵام بەکرێ گرتن و بەڕێوەبردنی سیخوڕێک لەناو دەزگایەکی هەواڵگری وڵاتێک کارێکی زۆر قورسە. لە ڕابردوودا،

[i] دەزگای ئاسایشی ناوخۆیی بەریتانیا

[ii] Christopher Andrew and Oleg Gordievsky, *KGB: The Inside Story of Its Foreign Operations from Lenin to Gorbachev* (New York: HarperCollins, ١٩٩٠; Harper- Perennial edition, ١٩٩١), ٢٩٦–٩٨, ٣٨٩–٩٠, and ٥٩٨–٩٩.

ئەمریکا و وڵاتانی تری خۆرئاوایی بەتووندی پشتیان بە هەڵاتوانی دەزگاکانی هەواڵگری یەکێتی سۆڤیەت دەبەست بۆ زانیاری دژەهەواڵگریی. یەکێک لە نموونە دیارەکانی بریتیی ■■ لە ڤیتالی یورچێنکو، جێگری بەڕێوەبەری بەشی دژە سیخوڕیی (*KGB*) لەدژی ئەمریکا و کەنەدا. دوای هەڵاتنی لە هاوینی ساڵی ١٩٨٥، ناوبراو زانیاری گرنگی دەربارەی سەرکەوتنەکانی سیخوڕیی سۆڤیەت لەدژی ئەمریکا گەیاندە دەزگای هەواڵگری ئەو وڵاتە. بۆ نموونە، هەرچەندە ئەو ناوی ڕاستەقینە، کەسایەتی وە ناوەڕۆکی ئۆپەراسیۆنەکەیانی نەدەزانی کە پێیدان، بەڵام زانیاریەکانی بووە هۆی دەستگیرکردنی *ڕۆناڵد پێلتن*، فەرمانبەری پێشووی ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانی (*NSA*)، و تاوانبارکردنی *ئێدوارد لی هاوارد*، کارمەندی پێشووی سی ئای ئەی.

میتۆدە سەرەکیەکانی تری ئەنجامدانی دژەهەواڵگریی بریتییە لە بەدەستهێنانی زانیاری لەڕێگای سیخوڕی دووسەرە. ئەوان ئەم سیخوڕانەن کە، لەکاتێکدا وا دەردەخەن سیخوڕی بۆ دەزگایەکی هەواڵگریی دوژمن دەکەن، لەڕاستیدا لەژێر کۆنترۆڵی ئەو وڵاتەدان کە لە ڕواڵەتدا واپێدەچێت سیخوڕیی لەسەر دەکەن. ئەم جۆرە هەوالدۆزانە دەکرێت لە ئەساسدا سیخوڕی ڕاستەقینە بووبن کە دوای ئەوە هەڵاتوون گۆڕدراون، یان کراون بە سیخوڕی ئەو وڵاتەی کە تیایدا گیراون. یان دەکرێت ببنە بەو سیخوڕانەی کە وانیشاندەدەن خۆیان بکەنە خۆبەخش بۆ سیخوڕیکردن بۆ دەزگای هەواڵگری دوژمن بەڵام لەڕاستیدا هەربە دڵسۆزیی بۆ وڵاتەکانیان دەمێننەوە.[1] لەو نێوەندەدا ئەو کەسانە دەبن کاری گەیاندنی هەواڵ دەکەن

[1] dangles

■ ڕاپۆرتەکانیان بەرز دەکەنەوە بۆ سەرووی خۆیان ■ بەزۆری پێیان ڕادەگەیەنرێت کە بەردەوام بن لەم یارییە.!

ئەم جۆرە ئۆپەراسیۆنە سیخوڕییە دووسەرانە بۆ مەبەستی هەمان ئامانجی دژەهەواڵگریی کاردەکەن. ئەو سیخوڕانە هەرهیچ نەبێت ڕێگا بۆ دەزگای دژەهەواڵگریی خۆش دەکەن بۆ زانینی میکانیزمە شاراوەکانی دوژمن ■ ئاشکراکردنی ناسنامەی ئەفسەری دەزگای هەواڵگری دوژمن کە بەژدارە لە بەڕێوەبردنی سیخوڕەکان. لەئەنجامدا، دەکرێت چاوەدێرییەکە بخرێتە سەر ئەفسەر هەواڵگریی ڕاستەقینە، لەکاتێکدا گرنگی کەمت دەبێت بدرێتە سەر ئەو بەرپرسانەی ■ لە ڕاستیدا دبلۆماتکار و کەسانی بازرگانین.

سەرەڕای ئاشکراکردنی ناسنامەی ئەفسەری هەواڵگریی دوژمن، ئەم ئۆپەراسیۆنانە واڵە ئەفسەرانی دژەهەواڵگریش دەکەن بۆ ئەوەی پەی بە میتۆدەکانی ئۆپەراسیۆنی دوژمنەکانیان بەرن. بە بەکارهێنانی سیخوڕیی دووسەرە، کەسێک دەتوانێت ئەوە بزانێت چۆن سەروی ئەوان ڕێنمایی دەدەن بە سەرچاوەکان وە چۆن زانیاریان لێ وەردەگرن، لە چ کات و شوێنێک پێیان باشە چاویان پێ بکەوێت، دەبێت چ ڕێوشوێنێکی پێشوەختە بگرنە بەر لەدژی ئەوەی ئەگەر هاتوو پێیان زانرا. بەکورتی، بە زانینی ئەوەی چۆن وە کەی پەیوەندیەکانی دوژمن لەگەڵ سەرچاوەکەی ڕوودەدات، دژەهەواڵگریی دەستبەجێ لە ڕێگا و تەکنیکی تایبەتی دوژمن تێدەگات وە بەم جۆرە باشتر بەرەنگاری دەبێتەوە. هەروەها، زانیاری دەربارەی فریودان و ڕێگاکانی دوژمن وە شێوازی گشتی کارکردنی چالاکیەکانی ئەفسەرانی هەواڵگریی ئەو دەزگایە تواناکای دژەهەواڵگریی زیاد دەکەن بۆ ئەوەی ناسنامەیان ئاشکرا بکەن. لە کۆتاییدا، ئەگەر هاتوو

سیخوڕێکی دووسەرە چەند ئامێرێکی تایبەتی پێدرا، وەک ترانسمیتەری ڕادیۆیی تایبەت بە سیخوڕەکان، دەزگا هەواڵگریەکەی دەرفەتی ئەوەی دەبێت لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات. ئەمەش، بۆ نموونە، سەردەکێشێت بۆ بڕینی شەپۆلی ڕادیۆیی لەنێوان ئەفسەرانی هەواڵگریی دوژمن و سەرچاوە ڕاستەقینەکەیان.

لەو ڕێنماییانەی کەسی سەریە هەواڵگریی دەیدات بە سیخوڕە دووسەرەکە، دەزگایەکی هەواڵگرییش دەتوانێت ئامانجی سەرەکی دوژمن بزانێت. ئەمەش بەشێوەیەکی ئاسایی دەبێتە هۆی زانینی بۆچوونی دوژمن لەمەڕ کێشە هەستیارەکان.

یەکێک لە نموونە هەرە سەرنجڕاکێشەکانی ئەم جۆرە بریتییە لە سیخوڕی دووسەرەی بەریتانی(ناوی نهێنی "پاسکیلی سێ تایە" بوو) لەلایەن دەزگای هەواڵگریی ئەڵمانیەوە ماوەیەکی کەم بەر لە هاتنی ئەمریکا بۆناو جەنگی جیهانیی دووەم. سیخوڕەکە لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٤١دا نێردرایە ئەمریکا، لەگەڵ خۆیدا پرسیارنامەیەکی هەڵگرتبوو کە داوای پڕکردنەوەی لە هاوڵاتیان دەکرد سەبارەت بە زانیاری ورد دەربارەی پێگەکانی سوپای ئەمریکی لە شاری هاوای. ئەو زانیاریانە دەدرانە دەزگای ئێف بی ئای، بەڵام بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش وەڵامەکان فەرامۆش دەکران. بێگومان، بەکارهێنانی ئەم تەکنیکە تەنیا بۆ ئەوە بوو ئەمریکیەکانی پێ لەخشتە بەرن ئەگەرنا لە ئەسڵدا ئامانج لەم کارەیان پێدانی ئەو زانیاریانە بوو بە دەزگای هەواڵگری ئەڵمانی. ئەگەر بەشێوەیەکی ورد سەیری ڕووداوەکان بکەین، دەکرێت بپرسین کە ئایا ئەگەر هاتبوایە دەزگای هەواڵگری ئەمریکا

زیاتر وشیاریوایە بە ئەم زانیاریانە بەکارهێنابوایە پێشبینی هێرشی ژاپۆنیەکانی لە پێرل هاربەر نەدەکرد!؟
نەبوونی بایەخ بە شوێنێک کە پێدەچێت زۆر گرنگ بێت دەکرێت ئاماژەیەک بێت بۆئەوەی کە دوژمن پێشتر دەستی گەیشتووە بە سەرچاوەی زانیاری باش دەربارەی ئەم تۆپەراسیۆنە؛ دەکرێت ئەمە سەرەداوێکی گرنگ بێت بۆ لێکۆڵینەوەی دژەهەواڵگری.
سەرەڕای بەدەستهێنانی زانیاری دەربارەی دەزگای هەواڵگری دوژمن، شێوازی کارکردنی، وە ئەولەویەتی کۆکردنەوەی زانیاریەکانی، سیخوڕی دووسەرە دەتوانێت جۆرێک لە کۆنترۆڵی هەبێت بەسەر چالاکیەکانی دەزگاکە. تەنیا بوونی سیخوڕێکی دووسەرە دەتوانێت ئەم ئامانجە بەجۆرێک لە جۆرەکان بەدەست بخات؛ ئەگەر دەزگاکەی دوژمن بڕوای وابێت سیخوڕێکی هەیە کە دەتوانێت دەستی بە زانیاری تایبەتی بگات، ئەوا پێویست ناکات یەکێکی تر بەکرێ بگرێت بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. بەسەرکەوتن لە بەدەستهێنانی زانیاری چالاکیەکانی دەزگایەکی تر، سیخوڕە دووسەرەکە دەتوانێت زانیاری گرنگ ببات بۆ دەزگا ڕاستەقینەکەی خۆی.
شتێکی بەڵگەنەویستە کە سیخوڕی دووسەرە دەبێت هەندێ زانیاری بەو کەسە بدات کە لەژێرەوە ڕێنمایی دەکات، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ئەو سیخوڕە بەجێی متمانە بمێنێتەوە و متمانپێکراو بێت. چارەسەری ئەم گرفتە بەوە دەبێت کە سیخوڕەکە هەندێ جار زانیاری هەستیاری ناگرنگ بەو کەسە بدات. سیخوڕی دووسەرە دەتوانێت زانیاری گرنگ و دروست ببەخشێت کە وابزانرێت دوژمن پێشتر ئەم زانیاریەی وەرگرتووە لەڕێی

هەندێ کەناڵی ترەوە. لەم جۆرە دۆخانەدا، دەبێت دژەهەواڵگریی هاوسەنگی سوودی پاراستنی متمانەپێکراویی سیخوڕە دووسەرەکە دروست بکات لەدژی ئەو زیانەی بەهۆی پێدانی ئەو زانیاریەی گەیەنراوە بە دەزگاکە کە بەهۆیەوە متمانەکەی بەردەوام بێت. ئامانجەکە بریتییە لە پێدانی زانیاری تا بکرێت کەم بایەخ بەبێ ئەوەی گومان دروست بکات لەلایەن دەزگای هەواڵگریی دوژمن.

یەکێکی تر لە ڕێگاکانی بەکارهێنانی سیخوڕی دووسەرە بریتییە لەوەی کە زانیاری بێ سوود و تێکەڵوپێکەڵ و نادروستیان پێ بدەیت بۆ بەڕێدابردنی دوژمن. ئەم تاراددەیەکی باش نەک تەنیا کۆنترۆڵی کۆکردنەوەی هەواڵگریی دوژمن دەکات بەڵکو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەست بەسەر تواناکانیشیدا دەگرێت. سوودەکانی ئەنجامدانی ئەم کارە زۆر گەورە و ناوازەیە، هەرچەندە بارقورسی و زەحمەتیەکانیشی زۆر مەزنن.

تەڵەکەبازیی بەشێوەیەکی تیۆرتەسەلتر باسدەکرێت. ئەم برگەیە سەرنج دەخاتە سەر دوو نموونەی گەورە، زۆر سەرکەوتووی ئۆپەراسیۆنەکانی دژەسیخوڕی دووسەرە، یەکێکیان لەکاتی جەنگی ئەوەی تریش لەکاتی ئاشتیدا ئەنجام دراون.

***سیخوڕی دووسەرە لەکاتی جەنگدا: سیستەمی تەڵەکەبازی***[i] یەکێک لە دیارترین نموونە باڵاکانی تۆپەراسیۆنی مەزنی سیخوڕیی دووسەرە بریتییە لە سیستەمی تەڵەکەبازیی، کە بەهۆیەوە بەریتانیەکان، لەماوەی نزیکەی تەواوی جەنگی جیهانیی دووەم، "بەشێوەیەکی چالاکانە سیستەمی سیخوڕی ئەڵمانیان بەڕێوەدەبرد و کۆنتڕۆڵیان دەکرد لەناو وڵاتی خۆیاندا."[ii] بەدەستپێیکردن لە تاکە سیخوڕێکی ئەڵمانی کە لەکاتی گەڕانەوەیدا لە بەریتانیاوە بۆ ئەڵمانیا دەستگیرکرا لە سەرەتای جەنگەکەدا، بەریتانیەکان توانیان تۆڕێکی مەزنی بەناو سیخوڕی ئەڵمانیی بنیادبنێن وە وایان لە ئەڵمانەکان کرد بروایان پێیان بێت تا کۆتایی جەنگەکە. هەرکە سیخوڕی ئەڵمانەکان دەهاتنەنێو بەریتانیا، دەمودەست دەستگیردەکران وە بەکاردەهێنران لە دژی دەزگای هەواڵگریی وڵاتەکەیان بەپێدانی زانیاری هەڵخەڵەتێنەر دەربارەی ئۆپەراسیۆنەکانی بەریتانیەکان. ئەمە تا کۆتایی هاتنی جەنگەکە بەردەوام بووە وە دەزگای هەواڵگری ئەڵمانی هەستی بە هیچ نەکرد.

---

[i] Double-Cross System: ئەو سیستەمە دژە سیخوڕیی و ئۆپەراسیۆنی تەڵەکەبازییەیە کە لەلایەن بەریتانیەکانەوە لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانی بەکاردەهات. کاتێک سیخوڕانی نازی لەو وڵاتەدا دەستگیردەکران، یان خۆیان ڕادەست دەکرد یان خۆیان ئاشکرا دەکرد، دواتر لەلایەن بەریتانیەکانەوە بەکاردەهێنران بۆ ئەوەی زانیاری هەڵە بە نازیەکان بدەن. ئۆپەراسیۆنەکانیان لەلایەن "کۆمیتەی بیست"ەوە بەسەرۆکایەتی *جۆن ماستەرمان* چاودێری دەکران (وەرگێڕ).

[ii] John C. Masterman, *The Double-Cross System in the War of ١٩٣٩ to ١٩٤٥* (New Haven, Conn.: Yale University Press, ١٩٧٢), ٣

جۆن ماستەرمان، بەڕێوەبەری سیستەمەکە پێنج ئامانجی سەرەکی دیاریکرد:

- کۆنترۆڵکردنی سیستەمی سیخوڕیی دوژمن
- دەستگیرکردنی سیخوڕی تازەهاتوو بۆناو وڵاتەکەی
- بەدەستهێنانی زانیاری کەسایەتیەکان و میتۆدەکانی کارکردنی دەزگای نهێنی ئەڵمانیی
- دەستخستنی زانیاری دەربارەی کۆد و شیفرەی دەزگای نهێنی ئەڵمانیا
- بەدەستهێنانی بەڵگەی پلان و نیازەکانی دوژمن لەو پرسیارانەی لێیان دەکرا
- بۆ کاریگەری دانان لەسەر پلانەکانی دوژمن بەهۆی ئەو وەڵامانەی لەلایەن دوژمنەوە بەدەست دەگەیشت
- بۆ هەڵخەڵەتاندنی دوژمن دەربارەی پلان و نیازەکانی دوژمن.

سوودەکان بۆ حکومەتی بەریتانیا بێ هەژمار بوون. بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٤٠، سیخوڕی یەکەم لەلایەن بەرلینەوە کۆدێکی پێدرا بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ ئەڵمانیا لەبەر ئەوەی ئەم کۆدە بوو بە " بەردی بناغەی ژمارەیەک کۆدی تر کە لەلایەن دەزگای هەواڵگری سەربازیی ئەڵمانەکانەوە[i] بەکاردەهاتن،" هەبوونی بووە هۆی ئەوەی بەریتانیا هەر لەسەرەتای جەنگەکەوە بتوانێت کۆدەکانی سیستەمی ئەو دەزگایە بشکێنێت. دواتر لە جەنگەکەدا، کاتێک بەریتانیەکان زیاتر متمانەیان بۆ دروست بوو لە سیستەمی دژەسیخوڕی تەڵەکەبازیی ئەو وڵاتەدا،[ii] ئەوان توانیان دوو کۆتا

---

[i] Abwehr

[ii] Double-Cross System

ئامانجەکانیان بپێکن، کە پێکهاتبوو لە هەڵخەڵەتاندنی ئەڵمانەکان.
لووتکەی سەرکەوتنەکان لە ساڵی ١٩٤٤دا ڕاگەیەنرا، کاتێک سیخوڕە دووسەرەکانی بەکارهێنران بۆ بەرەوپێشبردنی کەمپینی فیڵبازیی کە بووە هۆی قایلکردنی ئەڵمانەکان بۆ ئەوەی واپێشبینی بکەن بەریتانیەکان لە *کالیس* دادەبەزن نەوەک لە *نۆرماندی*، بەمەش سەرکەوتنی بەریتانیەکان مسۆگەر بوو.
بەهۆی سەرکەوتنەکانی خوێندنەوەی کۆدەکانیەوە، هەواڵگری بەریتانیا لە پێگەیەکی دروستدا بوو بۆ تێبینیکردنی پەرچەکرداری ئەڵمان بۆ ئەو زانیاری و زانیاری هەڵخەڵەتێنەری لەلایەن سیخوڕە دووسەرەکانەوە پێیان دەدرا. سەرەڕای ئەمەش، دەزانرا کە کامە ڕاپۆرتی گرنگ بەرزکراوەتەوە بۆ سەرکردایەتی باڵا لە بەرلین وە ئایا بڕوا بەو ڕاپۆرتانە کراون یان نا.
ئەم پێڕاگەیاندنەوەیە زۆر گرنگ بوو بۆ بەدەستهێنانی ئاماجەکانی هەڵخەڵەتاندن، چونکە ڕێگای بە بەریتانیەکاندا بۆ جەختکردنەوە لەسەر ئەو خاڵانەی ئەڵمانەکان لەدەستیان دابوو یان بۆ گۆڕینی پەیامەکان بۆ نەمێشتنی هەر گومانێکی ئەڵمانەکان.
کۆنترۆڵکردنی تۆڕی سیخوڕیی دوژمن بێگومان نرخی خۆی هەیە: تۆڕەکە دەبوایە ئەوەندە زانیاری هەواڵگریی بەرهەمهێنابوایە کە بەشی ئەوەی کردبوایە ئەڵمانەکان وا لێ بکات بڕوای پێ بکەن. هەروەها، ئەو زانیاریانەی بەرهەمی دەمێنا نەدەبوایە هەروا بەئاسانی دژەیەک بن لەگەڵ ئەو زانیاریانەی ئەڵمانەکان بەدەستیان هێناوە لەڕێی کەناڵە هەواڵگرییەکانیانەوە، تەنانەت دەبوایە حیسابی ڕاپۆرتەکانی ئەو سیخوڕانەشیان کردبوایە کە هێشتا نەگیرابوون.(واپێدەچوو هیچ

سیخوڕێکی دەستگیرکراو نەبووبێت، بەڵام بێگومان دەبوایە ئەمەشیان لەبەرچاو بوایە بوایە.) ئەمە باجێکی تاراددەیەک قورس بوو؛ چونکە ئەڵمانەکان دەکرا تۆڕێکی سیخوڕییان لەناو بەریتانیا هەبوایە، وە ئەمە بۆ بەریتانیەکان جێگای تێڕامان، هەربۆیە دەبوایە هەموو ئەگەرەکان لەبەرچاو بگرن.

بەڕێوەبەری سیستەمی دژە سیخوڕی هەڵخەڵەتاندن بڕوای وابوو کە خۆی و هاوڕێکانی زۆر وریا بوون، لەو ڕووەوەی کە بەریتانیەکان هەندێک زانیاری دروستتریان بەدەستەوەدا کە دەبوایە لەدەستی بدەن. ئەڵمانەکان نەک تەنیا خاوەنی کەناڵی هەواڵگری کەمتر بوون لە بەریتانیەکان بوون، بەڵکو وا دەرکەوت کە بەباشی متمانەیان بەو سیخوڕانە هەبوو کە پێیان وابوو کار بۆ ئەوان دەکەن.

***سیخوڕی دووسەرە لەکاتی ئاشتیدا: تۆپەراسیۆنەکانی کوبا لەدژی ئەمریکا***

لە بەرواری دوازدەی ئابی ١٩٨٧دا، ڕۆژنامەی *واشنتۆن پۆست* بڵاویکردەوە کە هەڵاتوویەکی دەزگای هەواڵگری بیانی کوبا،[i] بە *سی ئای ئەی* وتووە کە "ژمارەیەکی نەزانراو لە بەرپرسانی حکومەتی کوبا، ئەمریکا پێی وابوو کە کار بۆ سی ئای ئەی دەکەن، زانیاری هەڵە و بێکەڵک بە ئەمریکا دەدەن کە لەلایەن دەزگای هەواڵگری کوباوە ئامادەکرابوون."[ii] دوای ئاشکرابوونی ئەم چەندە، ڕاگەیاندنی کوبا چیرۆکی تێروتەسەلی ژمارەیەکی زۆرەی ئەم سیخوڕە دووسەرانە ئاشکرا کرد. چالاکیەکانیان

---

[i] the DGI
[ii] Michael Wines and Ronald J. Ostrow, "Cuban Defector Claims Double Agents Duped U.S.," *Washington Post,* August ١٢, ١٩٨٧, A٨.

لەلایەن کوباوە وا دەزانرا کە ئەو کەسانە وەک سیخوڕی دووسەرە بۆ بەرژەوەندی کوبا کاریان کردووە، کە لە ئەساسدا زانیاری هەڵەیان بۆ بەرپرسانی ئەمریکا ناردووە. بەپێی سەرچاوەکانی *کوبا*، هەندێک لە سیخوڕەکان، دوای ئەوەی ئەمریکا وابەستەبوونی دروستی ئەوانیان زانی، نامەی ماڵئاواییان بۆ ئەفسەری کەیسی ئەمریکیەکان ناردووە.

## دژەهەواڵگریی لەڕێگای بەکارهێنانی کەسانی خاوەن تایبەتمەندی هەمەجۆر

دوای ئەوەی هەڕەشەی دەزگایەکی هەواڵگری دوژمن دەگاتە ئەو ئاستەی کە بەشێوەیەکی تەکنیکی سەردەمیانە هێرشە سیخوڕیەکانی دەست پێبکات کە لەتوانانی کۆکردنەوەی زانیای دژەهەواڵگریی لەڕێگای مرۆڤەوە بچێتەدەر، ئەوکات ناچار دەبین کە ئێمە هەڵسین بەخوێندەوە و شیکردنەوەی تواناکانی دوژمن وە لە بەرامبەریشدا ئێمەش ئەو تەکنەلۆژیایە بەکاربهێنین کە ئەوان بەکاریان هێناوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دژەهەواڵگریی. ئەمەش، بێگومان، خۆی لە بەکراهێنانی چاوەدێری ئاسمانی وێنەیی وە ئامێری پێشکەوتووی گەیاندن و هێماییدا دەبینێتەوە، ئەگەرنا توانای بەرەنگاربوونەوەی ئەو هەڕەشەیە تا ئاستێکی بەرز ئەستەم دەبێت.

هەربۆیە، یەکەم ئەرکی ئەم جۆرە دژەهەواڵگرییە بریتییە لە خەملاندنی کاریگەریی تواناکانی کۆکردنەوەی هەواڵگریی تەکنیکی. ئەم زانیارییە ئەوە دەردەخات کە لەکوێدا زانیاری، گەیاندن، وە چالاکیەکانی دەزگایەک موعەرەزن بۆ سەرکەوتن بەسەریدا وە تا چ ڕادەیەک دەتوانێت بیان

پارێزرێت. ئەو پێوانە دروستەی کە دەگیرێتەبەر دەکرێت بە "پاراستن" یان "دژەهەنگاو" ناوبنرێت، وە لە تەکنەلۆژیایەکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازییان هەیە. هەربۆیە گرتنەبەری ڕێگای هەمەجۆرە بۆ بەرەنگاربوونەوەی دژەهەواڵگریی گرنگە چونکە هانی دەزگایەک دەدات بۆ ئەوەی لە بۆچوونی دوژمنەوە سەیری کێشەکە بکات واتە، بەلەبەرچاوگرتنی هەموو ئەو توانایانەی کۆکردنەوەی زانیاری لەبەردەستیەتی.

## پاراستنی پەیوەندیەکانی گەیاندن

هەروەک چۆن برینی پەیامەکان، هەردوو جۆری نووسراو و ئەلیکترۆنی، ڕێگایەکی گرنگی کۆکردنەوەی زانیارییە، پاراستنی ناوەڕۆکی ئەو پەیامانەش ئەرکێکی لەمێژینەی سەرەکی دژەهەواڵگرییە. لەوەتەی سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، سەرنجی سەرەکی خراوەتەسەر پاراستنی پەیوەندی ئەلیکترۆنی دوور ئەندێشەکان کە بەهۆی وایەر یان شەپۆلی ڕادیۆوە دەگوازرێتەوە.

ئەو پەیامانەی بەهۆی وایەرەوە دەگوازرێنەوە دەتوانرێت بەهۆی ڕێگاگرتن لە هێڵەکەوە کە نەهێڵرێت گوێی لێ بگیرێت بپارێزرێت. کێبلی فایبەر ئۆپتیک تەنانەت سەلامەتتریشە، چونکە ئەو ئەو پەیامانەی کە پێیدا دەگوازرێنەوە برینیان زۆر قورسە. هێمای ڕادیۆیی، بەشێوەیەکی گشتی ناتوانرێت بپارێزرێت؛ هەر وەرگرێک دەتوانێت داتاکان وەربگرێت. بەشێوەیەکی سەرەکی پەیامی ڕادیۆیی بەهۆی شیفرەدارکردنەوە دەپارێزرێن. پەیامی نووسراو دەتوانرێت بەشێوەیەکی ئاسایی شیفرەدار بکرێت بەر لەوەی بنێردرێن. لە ڕابردوودا، کاتێکی هێمای ئەنەلۆگ

بەکاردەهات بۆ گواستنەوەی پەیامی دەنگیی، "تەلەفۆنی پارێزراو" بەکاردەهات؛ ئەو تەلەفۆنانە هێمای دەنگی بە شێوازێکی ئاڵۆز دەشیواند. هەر کەسێک بیویستایە ئەو جۆرە شەپۆلانە ببڕێت دەنگیکی شیوینراوی گوێ لێ دەبوو. گەڕاندنەوەی دەنگی سەرەکی و دروست کارێکی قورس بوو. لە ئێستادا، کاتێک دەنگ دەگوازرێتەوە بەشێوازێکی دیجیتالی، میتۆدی پێشکەتووتر شیفرەدارکردن بەکاردێن.

تەلەفۆنی پارێزراو[i] تاڕاددەیەک لەڕووی نرخەوە گرانن، وە بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ گفتوگۆکردن لەسەر زانیاری نهێنیی بەکاردەهێنرین. لەدەرەوەی حکومەتدا زۆر بەکارناهێنرێن و باونین. بەم جۆرەش، زۆربەی پەیوەندییە تەلەفۆنە دوورمەوداکان موعەرەزن بۆ بڕین.

لە ناوەڕاستەکانی ساڵانی هەشتاکاندا، لە ئەمریکا، خەڵکی ئاسایی ئەمەی خستەبەرچاو بەهۆی ئەو گەنگەشەیەی هەبوو دەربارەی شوێنی نوێی باڵیۆزخانەی سۆڤیەت(ئێستاش ڕووسیا) لە واشنتۆن. باڵەخانەی باڵیۆزخانەکە لە گەڕەکی *چیای ئالتۆ* بنیادنراوە کە لەبەرزی چەند پێیەک دەڕوانێتە سەر ناوەندی شار، ژووری نووسینگەی بەرپرسان دەڕوانێتە سەر ناوەڕاستی واشنتۆن وە ڤێرجینیای باکوور؛ واتە، کۆشکی سپی، وەزارەتی دەرەوە، پینتاگۆن، وە زۆربەی باڵەخانەکانی حکومەت دەگرێتەوە. لەم شوێنە و باڵەخانەی فەرمیەکانی تری ڕووسیا لە ئەمریکا (قونسلگەریی و نوێنەرایەتی بازرگانیی لە نیویۆرک، واشنتۆن، و سان فرانسیسکۆ؛ نوێنەرایەتی نەتەوەیەکگرتووەکان؛ وە شوێنی نیشتەجێ بوون لە شاری نیۆیۆرک، وە چەندین شوێنی تر)، قەبارەیەکی

---

[i] secure phone

زۆری پەیوەندییە تەلەفۆنیەکان دەتوانرێت بەئاسانی ببڕدرێن. ژمارەیەکی زۆر کردەی بەرەنگاربوونەوە خراونەتەڕوو بۆ کەمکردنەوەی ئەم لاوازییە. بۆ نموونە، دەکرێت کەسێک تۆڕی مایکرۆوەیڤەکە دووبارە دیزاین بکاتەوە بۆ نەهێشتنی بەستەرەکان کە بە شوێنێکی نزیکی ئەو شوێنەدا تێدەپەڕن، وە ئەمانە لەگەڵ کێبلی ژێرزەوی بگۆڕنەوە. هەروەها بەکارهێنانی فایبەر ئۆپتیک یەکێکی ترە لەو ڕێگایانەی پاراستنی پەیوەندیەکانی گەیاندن. فایبەر ئۆپتیک نەک تەنیا سەلامەترە لە بەکارهێنانی بەڵکو لە نرخیشدا هەرزانترە بەبەراورد لەگەڵ کێبڵەکانی تردا.

## فریودان و دژەفریودان

تائێستا، باسی دژەهەواڵگریی تەنیا شیکردنەوەیەک بوو لەو ڕێگایانەی کە تواناکانی دەزگایەکی هەواڵگریی دوژمن بۆ کۆکردنەوەی زانیاری چۆن بەرەنگار بینەوە. ئەگەر ئەم کارە بە سەرکەوتوویی ئەنجامدرا، ئەوکات دوژمن زانیاری پێویستی نابێت بۆ شیکردنەوەی دۆخەکە کە تووشی دەبێت، تاڕادەیەکی زۆر کوێرانە مامەڵە دەکات، وە کەمتر دەتوانێت ئامانجەکانی خۆی بپێکێت. هەروەک چارەسەرکردنی ئۆپەراسیۆنی سیخوڕیی دووسەرە ئاماژەی پێدرا، کەسێک دەتوانێت بە بەئامانجگرتنی توانای شیکردنەوەی هەواڵگریی خۆی ڕووبەڕووی ئۆپەراسیۆنە هەواڵگرییەکانی دوژمن ببێتەوە- واتە، بەگرتنەبەری ڕێگاگەلێک بۆ هەڵخەڵەتاندنی دەزگای دوژمن.

## فریودان چییە؟

"فریودان" بریتییە لەو هەوڵەی دەدرێت بۆ بەڕێلادابردنی شیکردنەوەی هەواڵگریی دوژمن دەربارەی ئەو دۆخەی سیاسیی، سەربازیی، یان ئابووریەی تووشی دەبێت، بەو واتایەی کە لەسەر بنەمای ئەو زانیارییە هەڵەیە بەشێوەیەک هەنگاو دەهاوێژێت کە خزمەت بە لایەن بەرامبەر بکات نەوەک خۆی. فریودان وەک جۆرێکی دژەهەواڵگریی لەقەڵەم دەدرێت چونکە هەوڵ دەدات بۆ ئامانجی سەرەکی ئۆپەراسیۆنەکانی هەواڵگری دوژمن پوچەڵ بکاتەوە؛ هەروەها، بەزۆری لە میتۆدەی دژەهەواڵگریی پێک دێت، وەک ئۆپەراسیۆنەکانی سیخوریی دووسەرە.

فریودان و شکستی هەواڵگریی لە چۆنیەتی کارکردندا پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە. لە ڕاستیدا، سەرکەوتنی فێڵی لایەنێک بەواتای شکستی هەواڵگری لایەنی بەرامبەر دێت. بێگومان، بەپێچەوانەوە دروست نییە؛ دەکرێت لایەنێک هەڵەی گرنگ بکات لە شیکردنەوەی هەواڵگریی خۆیدا تەنانەت بەبێ هیچ فێڵێک لەلایەن لایەکەی ترەوە. سەرەڕای ئەمەش، دەکرێت، لە حاڵەتی شکستی هەواڵگرییدا، هەندێ هەوڵ دیاریکەین لە فێڵدا لەلایەن لایەنی ترەوە. جا تا چ ئەندازەیەی ئەو هەوڵە بەرپرسە لە شکستەکە ئەمە پرسێکی ئاڵۆزترە.

دەتوانرێت تەکنیکی فریودان لە کاتی جەنگ و ئاشتیدا مومارەسە بکرێت، هەرچەندە، بەهۆی چەندین هۆکاری جیاجیاوە، دەکرێت کەسێک وا لێڵکردن لێکبداتەوە کە زیاتر لەکاتی جەنگدا باوبێت. فریودان لە تەکتیکیەوە بۆ ستراتیژیەت درێژدەبێتەوە. هەر جەنگێک کە بە فێڵێک لەسەر لایەک دەست پێبکات لەکاتێکدا قورسایی هێرشەکە بکەوێتەسەر

یەکێکی تر، ئەوا بە دڵنیاییەوە پێی دەوترێت فریودانی تەکتیکی. نمونەکانی فێڵی ستراتیژیی کەمتر باون بەڵام بەزۆری زۆر گرنگن لەجەنگدا، وەک ئۆپەراسیۆنی فێڵاوی هاوپەیمانانی جەنگی جیهانیی دووەم کە ئەڵمانیای بەلارێدا برد دەربارەی شوێنی جێگیربوونی کەشتیگەلی بەریتانیا لە *نۆرماندی*.

ئۆپەراسیۆنی تەڵەکەسازیی لەکاتی ئاشتیدا زۆر باونییە وە هەندێجار زۆر قورسە دەستنیشانی بکەین. لەنێو نموونە هەر سەرنجراکێشەکاندا ئەوەیە کە بە "متمانە" ناسراوە، کە دامەزراوەیەکی سۆڤیەتی بوو وای نیشاندەدا دژایەتی ڕژێمی نوێی شوعیەت بکات کە لەڕاستیدا لەلایەن کەسێکی دەزگای سۆڤیەتی جارانەوە لە ساڵی ١٩٢١ بۆ ١٩٢٧ دامەزرێنرا و بەڕێوەبردرا. بەکارهێنانی ئەم کۆمەڵە ئۆپێرسیۆنە ساختەیە. سۆڤیەت پەیوەندی دروست کرد لەگەڵ ڕێکخراوە دەرەکییەکانی دژەشوعیەت وە دەزگاکانی هەواڵگری ڕۆژئاوایی، بەم پێیەش زانین و ئاشکراکردنی هەر چالاکیەکی دوژمن کە گیرابوایە بەر ئاشکرا دەکرا؛ وە ناوی هەموو ئەو کەسانەی ئاشکرا کرد کە لەژێرەوە بۆ ئەو ڕێکخراوە کاردەکەن لەدژی سۆڤیەت وە زانیاری هەڵەی بۆ دەرەوە دەنارد دەربارەی دۆزی ناوەخۆی یەکێتی سۆڤیەت.[1]

لەماوەی ساڵانی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکاندا، یەکێتی سۆڤیەت چەندین ئۆپەراسیۆنی تەڵەکەبازیی ئەنجامدا بۆ قەناعەت پێهێنانی ئەمریکا کە یەکێتی سۆڤیەت خاوەنی هێزێکی مەزنتری ستراتیژیەتی هێرشی چەکی

[1] John J. Dziak, *Chekisty: A History of the KGB* (Lexington, Mass.: Heath, Lexington, ١٩٨٨), ٤٧–٥٠, and Andrew and Gordievsky, *KGB: The Inside Story,* ٩٧–١٠٦.

ناوەکییە. هەروەک پێشتر تێبینی کرا، لە بۆنەیەکی نیشاندانی هێزی ئاسمانی سۆڤیەتدا کە تیایدا بیست و هەشت فڕۆکەی شەڕکەری تیادا نمایشکرا ڕەنگە زیاتر لەو ڕێژەیەی کە هەر هەبیوو بەهۆی چەندجار هاتنەوەی هەمان فڕۆکە بۆ نمایشەکە.[1] بەهەمانشێوە، لە کۆتاییەکانی سالانی پەنجاکاندا، سەرکردەکانی سۆڤیەت چەند بانگەشەیەکی زیاد لە پێویستیان کرد دەربارەی بەرنامە ناوەکییەکانی. بەم ڕێگایە، سۆڤیەتیەکان ترسیان لە ئەمریکادا دروست کرد. ئامانجی سۆڤیەت لەم چەندەدا بریتیی بوو لەوەی ڕۆژئاوا ناچار بە کشانەوەی سیاسیی بکات(بۆ نموونە، سەبارەت بە دۆخی بەرلین) کە بەڕێگای تر نەدەکرا ئەم فشارە سیاسییە دروست بکات.

وەک ئاشکرایە ناوەڕۆکی فێڵەکە پشت دەبەستێت بە بارودۆخەکە و ئەوەی کە چۆن کەسێک دەیەوێت دوژمنەکەی کاردانەوەی هەبێت. بۆ نموونە، لەکاتی جەنگدا ڕەنگە دەزگایەکی هەواڵگری بیەوێت هێرشێکی لەناکاو بۆسەر دوژمنەکەی ئەنجام بدات، لەم کەیسەدا ئەرکی سەرەکی هەواڵگریی بریتییە لەوەی کە دوژمنەکەی قەناعەت پێ بهێنێت کە هیچ هێرشێک لەگۆڕێدا نییە. هەندێجار دوژمن بە تەواوی پێشبینی ئەوە دەکات هێرشی بکرێتەسەر، وە کارێکی ئەستەمە کەسێک بتوانێت وایان لێبکات کە هیچ هێرش لەگۆڕیدا نییە. لەم جۆرە کەیسەدا، فێڵکردن هەوڵ دەدات قەناعەتی پێبکات کە هێرشەکە لەکات و شوێن، یان شێوازێکی تر ئەنجام دەدرێت کە پلانی بۆ دانراوە.

[1] John Prados, *The Soviet Estimate: U.S. Intelligence Analysis and Russian Military Strength* (New York: Dial, ١٩٨٢), ٤٢–٤٣.

لەکاتی ئاشتیشدا، کەمتر ڕوونە کە ئامانجی فێڵکردن دەبێت بەرەو ج ئاراستەیەک بێت. دەکرێت دەزگایەک بیەوێت قەناعەت بە دوژمنێک بهێنێت کە دەزگایەک یان وڵاتێک بەهێزترە لەوەی دەردەکەوێت، تەنیا بۆ ئەوەی پاشەکشەی سیاسیی پێبکات کە بەپێچەوانەوە ناچار نەدەبوو ئەو کارە بکات. یان، کەسێک دەیەوێت توانا سەربازییە ڕاستەقینەکانی یەکێک بشارێتەوە بۆئەوەی کات بە لایەنێکی تر بدات کە بەخۆیاندا بچنەوە وە لایەنی بەرامبەر کەمتەرخەم بێت لە بەهێزکردنی هێزە سەربازییەکانی خۆی. ئەگەر بەپێی ڕێککەوتنی کۆنترۆڵکردنی چەک هێزەکانی لایەنێک سنووردار بوون، ئەوەی تر دەتوانێت سەرپێچیکردنی ڕێککەوتننامەکە بشارێتەوە، بەم شێوەیەش وا لەلایەنی بەرامبەر دەکات بەردەوام بێت لە سنووردارکردنی هێزە سەربازییەکانی خۆی.

## مەرجە پێشوەختەکانی تەڵەکەبازی سەرکەوتوو

***بلۆککردنی هێمای ڕاستەقینە وە دروستکردنی هێمای ساختە*** ئەگەر ئێمە سەیری پرۆسەی هەواڵگریی بکەین وەک وەرگرتن و گۆڕینی هێما نێردراو بەهۆی چالاکی ئەو لایەنەی لەژێر چاوەدێریدایە، ئەوکات ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنێکی فێڵاوی خۆی لە بلۆککردن دەبینێتەوە، تا ئەو ڕادەیەی دەکرێت، هێمای ڕاستەقینە وە گۆڕینی بەشێوەیەک کە سەر لە دوژمن بشێوێنێت. بۆ نموونە، لە کەیسی سیخوڕی نووسەرەدا، بەڵگەنامەی ڕاستەقینە لەناو خەزێنەی حکومەتدا دەمێننەوە، وە ئەوانەشی کە بە مەبەستی فێڵ ساختە کراون دەدرێنە سیخوڕی نووسەر

بۆ ئەوە لە ڕێی ئەوانیشە بەو کەسانە بدرێت کە بەرپرسن لە وەرگرتنی زانیاری لەو سیخوڕانە کە سەربە هەواڵگری دوژمنن.
نیوەی یەکەمی کارەکە کێشەی پاراستنە. ئەگەر ژمارەیەکی زۆری هێمای دروست تێپەڕێت، ئەوا قورسە بتوانرێت دوژمن هەڵخەڵەتێنرێت، هەرچەندە دەکرێت سەری لێ بشێوێت بەهۆی تێکەڵبوونی هێمای ڕاستەقینە و ساختە کە ناتوانێت وێنەیەکی دروستی دۆخەکەی دەست بکەوێت. بەم شێوەیەش، یەکەم پێشمەرجی فێڵی سەرکەوتوو بریتییە لە تواناتی بلۆککردنی بەشی هەرەزۆری، ئەگەر هەمووی نا، کەناڵەکان کە دوژمن لێیانەوە زانیاری هەواڵگریی کۆدەکاتەوە دەربارەی چالاکیەکانی لایەنی بەرامبەر. بەشێوەیەکی گشتی، ئەنجامدانی ئەم کارە لەکاتی جەنگدا ئاسانترە بە بەراورد لەگەڵ کاتی ئاشتیی، کە هۆکارێکە (لە چەندین هۆکار) کە فریودانی سەرکەوتوو زیاتر لە کاتی جەنگدا زیاتر مومکینە وەک لە کاتی ئاشتیدا.
بلۆککردنی کەناڵەکانی کۆکرنەوەی زانیاری پێویستی بە زانیاریەکی فراوانی کەناڵەکانی هەواڵگریی هەیە کە بەهۆیەوە دوژمن هێما وەردەگرێت. توانایەکی باشی دژەسیخوڕیی پێویستە، چونکە دەکرێت کەسێک دۆخی دروست بدرکێنێت یان تەنانەت خودی پلانی فێڵەکە ئاشکرا بکات. لە پشت ئەمەشەوە، دەبێت هەواڵگریی زانیاری هەبێت لەسەر تواناکانی کۆکرنەوەی زانیاری هەواڵگری تەکنیکی دوژمن بۆ ئەوەی پوچەڵیان بکاتەوە. بەم شێوەیە، دەکرێت کەشتی و فڕۆکە تەکنیکی ڕادیۆی بێدەنگ بەکاربهێنن بۆ ئەوەی خۆیان لە تەڵەی فێڵ بەدوور بگرن لەلایەن دوژمنەوە. ئەگەر هێزەکانی پیادە پشت بە هێڵە زەمینیەکان

بەستن (پەیوەندی لەڕێی تەلەفۆن یان وایەری تەلەگراف، کێبلی فایبەر ئۆپتیک). جگە لە ڕادیۆ هەروەک هێزەکانی ئەڵمان ئەنجامیاندا بەر لە هێرشی ئاردێنیسی ساڵی ١٩٤٤، دەکرێت هەمان کاریگەریی بەدەست بهێت. بەهەمانشێوە، ئەگەر سووڕگەی سەتەلایتەکانی چاوەدێری فۆتۆگرافی زانراو بێت، دەکرێت چالاکیەکان بوەستێنرێن و کەلوپەلەکان ببرێنەژوورەوە یان فێڵیان لێ بکرێت کاتێک سەتەلایتەکان لەژوور سەرن وە دەتوانن وێنەیان بگرن.

نیوەی دووەمی کارەکە، دروستکردنی هێمای ساختە، بەو شێوەیە پلانی بۆ دادەڕێژرێت کە زانیاری هەبێت لەسەر چۆنیەتی تواناکانی کۆکردنەوەی هەواڵگریی مرۆیی و تەکنیکی. سیخوڕیی دووسەرە دەتوانێت هەرچی بەڵگەنامەی ساختەیە بنێرێت بۆ لایەنی بەرامبەر، تا ئەو کاتەی کە دەتوانن پۆزشێکی قایلکەر بۆ دەست گەیشتن بەو زانیاریانە بدۆزنەوە.

بۆ سەرکەوتنە لەناکاوەکەیان لە پێرل هاربەر، ژاپۆنیەکان تەنیا تەکنیکی ڕادیۆی بێدەنگیان لەسەر کەشتیگەلی هێرشبەر بەدرێژایی دەریای هێمن بەکارنەهێنا. هەروەها، بەکارهێنەرانی تری ڕادیۆی کەشتیوانی سەرقاڵکران بە ناردنی پەیامی ساختە بۆ یەکتر بەبەکارهێنانی پەیوەندی کەشتیگەلی جەنگی بەڵکو ترانسمیتەرەکانیش لەناو یابان هەمان ئەرکیان ئەنجام دەدا. بەم شێوەیەش، ئەگەر هێمای ڕادیۆ ببڕدرابوایە (دیار نەدەبوو کە بڕدراون) وە شوێنی ترانسمیتەرەکانیش دیاریکرابوایە، ئەمریکا دەیتوانی بەو ئەنجامە بگات کە فڕۆکەکانی یابان لەناو ئاوەکانی وڵاتی خۆیاندا تێوەگلاون. بەهەمانشێوەش، چاوەدێری وێنەیی دەکرێت فێڵی لێ بکرێت بە دەرخستنی چەک و ئۆتۆمبیلی ساختە؛ بۆ زانینی ڕێژەی وردی ئەو

چەکە ساختانە بۆ ئەوەی لە هی ڕاستەقینە جیانەکرێنەوە دەبێت بزانرێت کە تا ئەندازەیەک کوالیتی ئەو کامێرایەنە چەندە کە دوژمن بۆ چاوەدێری ئاسمانی بەکاریان دەهێنێت.
گرنگی تێگەیشتن لە تواناکانی کۆکردنەوەی زانیاری دوژمن بەشێوەیەکی ڕوون لەلایەن فێڵێکی بەریتانیەکان لە جەنگی جیهانیی دووەم ڕوونکراوەتەوە. لەسەرەتای مانگەکانی سەرەتای جەنگدا، هێزە دەریاییەکانی بەریتانی سێ کەشتی بازرگانیان پڕکرد لە چەک و تفاقی ساختە بۆ ئەوەی وا دەریان بخات ئەوانە کەشتی جەنگین وە فڕۆکە هەڵ دەگرن. ئامانج لەم کارە بریتیی بوو لە ڕاکێشانی سەرنجی هێرشە ئاسمانیەکانی ئەڵمان بۆ ئەوەی توخنی کەشتیگەلی ڕاستەقینە لە بەندەری *سکاپا فلۆ* نەکەون وە، بەشێوەیەکی گشتیتر، سەر لە ئەڵمانەکان بشێوێنن دەربارەی توانای گشتی هێزی دەریایی پاشایی.

*فیدباک* لەبەئەنجامگەیاندنی ئۆپەراسیۆنێکی فێڵیدا، دەکرێت ڕووبەڕووی چەندین نادڵنیایی گرنگ ببینەوە:

- هەموو هێما ڕاستەقینەکان بلۆککراون؟
- ئایا هێمای دروستکراو گەیشتۆتە دوژمن؟
- ئایا سەرنجی دوژمنیان ڕاکێشاوە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، فێڵبازیی سەرکەتوو هەندێ میتۆد دەگرێتەبەر بۆ زانینی چۆنیەتی خەمڵاندنی دوژمن بۆ ئەو نۆخەی تێی دەکەون. ئەگەر بەشێوەیەکی باش وریا نەبێت بۆ تێبینیکردنی هێما

ساختەکان، یان ئەگەر ئەو هێمایانەی بەشێوەیەکی وا تەفسیر نەکرێن هەڵخەڵەتێنەرەکە ویستوویەتی، دەتوانرێت فێڵی زیاتر بخرێتەناو چالاکیەکە بۆ ئەوەی سەرنجی ڕابکێشێت وە پەلکێشی نێو ئەو تەفسیرەی بکات کە دەزگا هەواڵگریەکە دەیەوێت. ئەگەر دەزگای هەواڵگریی بەرامبەر هەستی بەشتێکی نامۆ کرد لە وێنەی(ساختە) دۆخەکە کە هەواڵگری فێڵباز لە مێشکی ئەودا چاندویەتی، ئەوکات دەبێت هێمای نوێ دروست بکرێت بۆ ئەوەی ئەم نامۆبوونە بڕەوێنێتەوە. ئەگەرهاتوو هێمای تەواو دروست گەیشتنە دەستی دوژمن بۆ ئەوەی وای لێبکات بە دروستی لە دۆخەکە تێبگات، دەکرێت دەزگاکە واز لە هەڵخەڵەتاندنەکەی بهێنێت و پلانەکانی بگۆڕێت.

دەتوانرێت فیدباک بەچەندین شێواز بەدەست بهێنرێت. لە هەندێ حاڵەتدا (وەک تەڵەکەبازی کاتی جەنگ، یان تەڵەکەبازی بۆ پشتیوانی هێرشێکی لەناکاو)، کردەوەکانی دوژمن ئاماژەی باشن بۆ ئەوەی ئایا دەزگاکە هەڵخەڵەتێنراوە یان نا. بەم شێوەیە، نەبوونی هەرجۆرە نیشانەیەکی چالاکی سەربازیی (کە بەئاسانی دەتوانرێت تێبینی بکرێت) لەلایەن کەشتیگەلی ئەمریکا لە هاوای لە یەکەم هەفتەی کانوونی یەکەمی ١٩٤١دا بە یابانیەکانی ڕادەگەیاند کە پێویستە چی بزانن. لە حاڵەتی تردا، فیدباکی کامل پێویستی بە هەواڵگریەکی باش هەیە دەربارەی بۆچوونی لایەنی بەرامبەر لە هەمبەر دۆخەکە؛ لە کەیسی سیستەمی سیخوڕیی دووسەری بەریتانیدا لەکاتی جەنگی جیهانیی دووەم، ئەم فیدباکە بەهۆی سیخوڕەکانەوە دەگەیشتەوە بەریتانیەکان وە ئاگایان لە سەرجەم ئەو فەرمانانە بوو کە لە سەرۆکایەتی ئەو وڵاتە یان دەزگای

هەواڵگرییەوە دەردەچوون لە هەمبەر ئەو پەرچەکردارانەی کە دەبێت بگیرێنەبەر لە هەمبەر بەریتانیەکاندا.

تا فێڵەکە مەودادوور و ستراتیژیی بێت، گرنگی فیدباکی باشی هەواڵگریی زیاتر دەبێت. وەڵامەکانی لایەنی هەڵخەڵەتێنراو بۆ ئەم جۆرە فێڵە کاتێکی زیاتری دەوێت بۆ ئەوەی دیاریبکەوێن؛ بەم پێیەش، ئۆپەراسیۆنەکانی تەڵەکەبازی کاتی ئاشتیی پێویستی بە فیدباکی هەواڵگریی باشتر هەیە بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی لەکاتی جەنگدا ئەنجام دەدرێن. لەکاتی جەنگدا، دوژمن بەخێراتر کاردەکات بەپێی ئەو تێگەیشتنەی کە بۆ دۆخەکە هەیەتی، بەم پێیەش دەکرێت ئەوە ئاشکرا بکات کە ئایا دەزگاکەی هەڵخەڵەتێنراوە یان نا. لەکاتی ئاشتیدا، دوژمن لەژێر فشارێکی کەمتردایە بۆ گرتنەبەری کارێک کە تێگەیشتنەکە ئاشکرا بکات دەربارەی دۆخە گشتیەکە.

ئەمە هۆکارێکی گرنگە بۆچی تەڵەکەبازیی کەمترە لەکاتی ئاشتیدا بە بەراورد لەگەڵ کاتی جەنگدا. هەروەها، لەکاتی جەنگدا، قوربانی ئۆپەراسیۆنێکی تەڵەکەبازیی زیاتر دەکەوێتەژێر فشارەوە بۆ ئەوەی بەخێرایی کاردانەوەی هەبێت؛ بەم شێوەیەش کاتێکی کەمتری لەبەردەستە بۆ شیکردنەوەی دۆخەکە و بەراوردکردنی ئەو هێمایانەی وەرگیراون بەهۆی چەندین کەناڵی جۆراوجۆرەوە؛ بەم پێیەش زیاتر موعەرەزە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی سەرکەوتوو بکەوێتە داوی فێڵبازییەوە.

***هەڵخەڵەتاندن و خۆهەڵخەڵەتاندن***[i] تێڕامانی هەڵەی ئەو دۆخەی کەسێک دەیەوێت دوژمنانی بگرنەبەر دەبێت بەهۆی ئەو کردەوانەی

[i] Deception and self-deception

حوکمی لەسەر بدرێت کە کەسێک دەیەوێت دوژمنەکەی بیگرێتەبەر. سەرەڕای ئەمش، دەبێت تێڕامانەکە قابیلکەر بێت بۆ دوژمن؛ لەڕاستیدا، سەرکەوتن زیاترە فەراهەمە ئەگەر سیناریۆی هەڵخەڵەتاندنەکە لەسەر بنەمای ئەوەی بێت کە دوژمن چۆن لەم کەیسە دەڕوانێت و بیری لێ دەکاتەوە. بۆ نموونە، هەڵخەڵەتاندنی *نۆرماندی* لە بەشێکدا زۆر سەرکەوتوو بوو چونکە *هیتلەر* پێشتر قەناعەتی پێهێنرابوو کە هاوپەیمانان لە *کالێ* دەنیشنەوە، کە تیایدا کەناڵی ئینگلیزی لە هەموو شوێنەکانی تر تەسکترە. بەم شێوەیەش، هێمای دروستکراو دەبوایە ئەم تێڕامانە بەهێز بکات وە ڕێی لێ بگرێت لەوەی لە بایەخی کەم بکرێتەوە بە هەر هێمایەکی دروست کە بتوانێت بهێنێتە ناوەوە؛ ئەمە ئەرکێکی ئاسانترە لە قابیلکەردنی دوژمن بۆ جێبەجێکردنی سیناریۆی فێڵەکە هەر لە سەرەتاوە. بەم شێوەیەش، ڕێکەوت نییە کە زۆربەی سەرکەوتنە سەرنجڕاکێشەکانی هەڵخەڵەتاندن پێکدێت لە پێکهاتەی خود هەڵخەڵەتاندن.[i]

**دژەفریودان**

ئەزموون نیشانی دەدات کە زاڵبوون بەسەر هەموو ئەو هەوڵانەی دوژمن دەیدات لە کاری هەڵخەڵەتاندن زۆر قورسە. تەنانەت ئەوکاتەشی ئەوان سیستەمی سیخوڕیی دووسەرەیان بەڕێوەدەبرد، بەریتانیەکانیش بەهەمانشێوە لەلایەن ئەڵمانەکانەوە فێڵیان لێکرا سەبارەی بە زانیاریە

---

[i] مەبەست لە "خود هەڵخەڵەتاندن" ئەوەیە کە وا لەخۆت بکەیت یان واخۆت نیشان بدەی کە بڕوات بە شتێکە لە کاتێکدا دەزانی کە ڕاست نییە. (وەرگێڕ)

هەواڵگریەکانیان وە ئۆپەراسیۆنەکانیان لە وڵاتی هۆڵەندا. بەدەستپێکردن لە کۆتاییەکانی هاوینی ١٩٤١، لەگەڵ دەستگیرکردنی سیخوڕێکی ئەڵمانی کە کاری بۆ دەزگای هەواڵگری بەریتانیا دەکرد، ئەڵمانەکان توانیان هەموو سیخوڕەکانی دواتری بەریتانیەکان دەستگیر بکەن کە لەلایەن دەزگای هەواڵگری تایبەتی ئەو وڵاتەوە دەنێردران.

بەشکاندنی ئەو سیستەمە شیفرەیەی لەلایەن سیخوڕەکانەوە بەکاردەهات، ئەڵمانەکان پەیامگەلێکیان بۆ بەریتانیا دەنارد کە وانیشاندرابوو لەلایەن سیخوڕەکانەوەیە، کە لەڕاستیدا هەموویان دەستگیرکرابوون. هەندێ لە سیخوڕی دەستگیرکراو هاوکاریان کرد لە ئامادەکردن وە ناردنی پەیامەکان؛ لە کەیسی تردا، کارمەندای ڕادیۆیی ئەڵمانیا خۆیان کردبووە ئەو سیخوڕانەی کە دەستگیرکرابوون وە لەجیاتی ئەوان پەیامیان دەنارد. ئەم پەیامانە بوونە هۆی ئەوەی سیخوڕی زیاتر بنێرن بۆناو ئەو وڵاتە، بەڵام هەموویان دەستبەجێ یەک لەدوای یەک دەستگیرکران. ئۆپەراسیۆنەکە، کە ئەڵمانەکان پێیان دەوت (*Nordpol*) وە (*Englandspiel*)، واتە قوتبی باکوور و یاری لەدژی ئینگلتەرا، بەردەوام بوو لە ساڵی ١٩٤٤ەوە تاوەکو دوو لە سیخوڕی دەستگیرکراو لە کەمپەکە ڕایانکرد کە تیایدا گیرابوون. لەم حاڵە بەدواوە، ئەو ئەفسەرە دژەهەواڵگرییەی بەرپرسی ئەو ئۆپەراسیۆنە بوو بڕیاریدا کۆتایی بە ناردنی پەیام بۆ کەندەن بهێنێت وە لە یەکی نیساندا کۆتایی بە سەرجەم ئۆپەراسیۆنەکە هێنا.

کاتێک سیخوڕەکانی بەریتانیا لە هۆڵەندا پەیامەکانیان شیفرەدارکردن بۆئەوەی بەرەو لەندەن بیاننێرنەوە، دەبوایە ڕێکاری "پشکینی ئەمنی"

بگرنەبەر کە سیستەمێکی تایبەتە بە پاراستنی شیفرەکان. ئەمە وای دەردەخست بۆ ئەو کەسانەی پەیامەکە وەردەگرن کە ئەوان بەڕاستی ئەو کەسانەن کە لەلایەن ئەوانەوە نێردراون وە ئەوان بەشێوەیەکی ئازادانە کارەکانین خۆیان دەکەن وە لەژێر هیچ هەڕەشەیەکی ئەڵمانەکاندا نین. بۆ نموونە، دەکرێت سیخوڕێک ڕێنمایی پێبدرێت بۆ ئەوەی "هەڵەیەک" بکات لە پیتی پانزەیەمی هەموو ئەو پەیامانەی دەینێرێت. ئەگەر ئەڵمانەکان ئەو سیستەمەی شیفرەدارکردنەکان بەدەست گەیشت بەڵام لە پرەنسیپی "پشکنینی ئەمنی" تێنەگەیشتن، هەر پەیامێک کە ئەوان دەینێن وەک ساختە لەقەڵەم دەدرێت، چونکە ئەو هەڵەیەی تیادا نییە کە دەبوایە بکرێت.

لەم کەیسە تایبەتیەدا، بەکارهێنەرێکی ڕادیۆیی ئەڵمانی بە سیستەمی شیفرەکراوی دەستکەوتوو لەڕێگای سیخوڕێکی بەریتانی پەیامەکانی نارد. لەبەر ئەوەی بەکارهێنەرێکی ڕادیۆیی بەزۆری دەکرێت ناسنامەکەی بەشێوازێک ئاشکرا بکرێت کە تیایدا ئەو بەشێوەیەکی جیاواز پەیامەکانی نارد، لەمەوە پەیامی یەکەمی ئەوەی نیشاندەدات کە بەکارهێنەرێکی نوێ لە هۆڵەندا بەکرێ گیراوە چونکە سیخوڕی سەرەکی بەم شێوازە نامەکانی نەدەگواستەوە. ئەم پەیامە هیچ پشکنینێکی تێدانەبوو وە بەمەش دەبوایە وەک ساختە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت لەلایەن بارەگای سەرەکی هەواڵگریی لە لەندەن. هەربۆیە ئەفسەری ستافەکە لە لەندەن، جاڕس ببوو لە شکستی پەیڕەوکردنی ڕێنمایی دروست وە بەمەش دیار بوو کە سیخوڕە سەرەکیەکە لە چ بارێکدایە.

تێگەیشتن لە فێڵ هەنگاوی یەکەمە بەرەو پێشەوە لە زانینی ئەوەی چۆن خۆمان لە فێڵ لێکران بپارێزین؛ بە تێگەیشتنی ئەو هۆکارانەی کە ئاسانکاری دەکەن بۆ فێڵ، هەرهیچ نەبێت دەزگاکە ئاگاداری ئەگەر فێڵەکە دەبێتەوە وە هەندێ لە نیشانە ئاگادارکەرەوەکانی دەناسێتەوە. دەزگایەکی هەواڵگریی بەتایبەتی موعەرەزە بۆ فێڵ کاتێک پشتبەستراوە بە ژمارەیەکی بچووک لە سەرچاوەی زانیاریی وە کاتێک دوژمن ئاگاداری سروشتی ئەو کەناڵانە و شێوازی کارکردنیانە.

بۆ نموونە، پشتبەستنی سەرەکی لەسەر سەتەلایتەکانی چاوەدێریی فۆتۆگرافی، کە ناسنامە و ناسینەوەی شتەکان بەزۆری بۆ ئەوە کەسانە دیار دەبێت کە وێنەکان دەگرن، دەکرێت وا لە دەزگایەکی هەواڵگریی بکات بکەوێتە تۆڕی تەڵەکەبازییەوە. دوژمنەکە، کاتێک دەزانێت وێنەی بارەگاکانی دەگیرێت، دەکرێت کارێکی وا بکات کە چەند شتێکی تایبەت نەبینرێن؛ دەکرێت شتەکان بگوازرێنەوە نێو گەراجەکان یان بشاردێنەوە یاخود بە شتێک داپۆشرێن هەرکاتێک سەتەلایتی چاوەدێری فۆتۆگرافیی بەسەرسەریاندا تێپەڕی. بەهەمان شێوە، دوژمن دەزانێت کاتێک کەلوپەلەکان دەگۆڕین بۆ ئەوەی هەڵی زیادکردنی تێبینیکردنیان زیاد بکەین وە بەلارێیاندابەرین.

بارودۆخەکە تەنانەت کاولتریش ئەبێت (بە بۆچوونی قوربانی فێڵبازییەکە) ئەگەر دوژمنەکە بتوانێت زانیاری پێشوەختەی هەبێت نەک تەنیا کامە شوێن وێنەی دەگیرێت بەڵکو شوێن وێنەی دەگیرێت. بۆ نموونە، ئەگەر دەزگا هەواڵگرییەکە کوالیتی ئەو کامێرایە بزانێت، ئەوا دەزانێت تاچە ئەندازەیەی شتمەکی ساختە ئاڵوگۆڕیان پێکراوە لەگەڵ هی ڕاستەقینە.

بەم هۆیەشەوە، کودەتایەکی گرنگی هەواڵگریی ■■ بۆ سۆڤیەتەکان بۆ ئەوەی نامیلکەی چۆنیەتی کارکردنی سەتەلایەتی چاوەدێریی فۆتۆگرافی ئەمریکی بەناوی (KH-١١) بەدەست بهێنن. ئەوان بە تەنیا سێ هەزار دۆلار لە *ویلیام کامپایلس* کڕی، دوای ئەوەی دەستی لە پۆستەکەی وەک ئەفسەری سەرەتایی سی ئای ئەی لە تشرینی دووەمی ١٩٧٧ بەردا. هەروەها بەهۆی ئەم هۆکارەشەوە بوو کە وێنەی سەتەلایەتی وەک بەشێک لە نهێنیی لەکاری هەواڵگرییدا سەیر دەکرێن. (ئەگەر هەر دەبێت وێنەکان بڵاوبکرێنەوە، دەبێت کوالیتیان نزم بکرێتەوە-ناڕوونتر بکرێن- بۆئەوەی توانا وردەکانی سیستەمەکە بشاردرێتەوە.)
هەرکە دەزگایەکی هەواڵگریی لەو مەترسییەی هەڵخەڵەتاندن تێگەیشتن کە بەهۆی پشتبەستنی توندی یەک سەرچاوەی کەناڵی زانراوەوە تووشی دەبێت، ئەوکات دەزانێت چ ڕێوشوێنێک لەبارەیەوە بگرێتەبەر. باشترین چارەسەر لێرەدا بریتییە لەوەی کە پێی دەوترێت "کۆکردنەوەی زانیاری چاوەڕواننەکراو" وەک گرتنی وێنە لەکات و شوێنی وادا کە دوژمن پێشبینیان نەکات. بەڵێ، ڕوونە کە پێشبینیکردنی سەتەلایەتی چاوەدێری فۆتۆگرافی دوژمن کەمێک ئەستەمە، بەڵام بەدرێژایی سنوور و لێواری دەریایی دوژمن، لەو شوێنەی کە دەکرێت وێنەی ئاسمانیی بگیرێت، ئەرکەکە ئاسنتر دەکات.

## شیکردنەوەی دژەهەواڵگریی

هەروەک لە باسی سیخوڕیی دووسەرە و فێڵدا ڕوونبووەوە، پاراستنی یەکگرتویی ئۆپەراسیۆنەکانی هەواڵگریی دەکرێت زۆر ئاڵۆزبێت، واتە زیاتر

بێت تەنیا لەوەی سیخوڕێک دەستگیر بکەیت. لەڕاستیدا، دەکرێت چەندین کەس پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بەشێوازی جیاجیا بەیەکەوە هەبێت؛ ئەرکی گشتی پاراستنی دەزگایەکی هەواڵگریی لەدژی بەکارهێنان و فێڵکردن پێویستی بە نووسینگەیەکی شیکردنەوەی دژەهەواڵگریی تایبەت هەیە بۆ ئەوەی وەک دەزگایەکی کاریگەر وە ئەم پەیوەندییانە شیبکاتەوە. باشترین ڕێگا بۆ بڕیاردان لەسەر ئەوەی ئایا دەزگایەکی هەواڵگریی بەکارهێنراوە یان نا بریتییە لە بەدەستهێنانی سەرچاوەی ئاستبەرز لە دەزگای هەواڵگریی دوژمن(یان بەکرێگرتنی سیخوڕێک یاخود هەڵاتوویەک). تەنانەت ئەوکاتیش، ئەرکێکی قورس دەبێت ئەگەر سەرچاوەکە بتوانێت هەموو سیخوڕەکانی ناو دەزگایەکی ئاشکرا بکات.
بۆ نموونە، دەکرێت دەزگایەک هەستی بەوە کردبێت کە دوژمن دەستی بەچەند بەڵگەنامەیەکی نهێنیی لەمەڕ بابەتێک دەگات. با وادابنێین کە هەموو ئەو بەڵگەنامانە لە هەمان سیخوڕەوە دەدرێن، ئەوکات دەبێت سەیری ئەو کارمەندە بکەین کە دەشتوانێت دەستی بە سەرجەم بەڵگەنامەکان بگات وە گومانی بخەینەسەر و تا لەدواییدا دەستبەسەری بکەین. یاخود دەکرێت سەرچاوەکە بزانێت کە سیخوڕەکە چاوی بە پەیوەندیەکەی کەوتووە لە شارێکی بیانی دیاریکراو لە ڕۆژێکی تایبەت. بە وردبوونەوە لە تۆماری گەشتەکانی دەتوانین بزانین کە کامە فەرمانبەر کە دەستی بەو بەڵگەنامانە دەگات لەوکاتەدا لەو شارە بووە.
هەروەها، دەکرێت چەند سەرەداوێکی تریش هەبن کە وانیشان بدەن ئەو دەزگایە تووشی دزەکردنی زانیاری بووە. ئەگەر تۆپەراسیۆنێکی کەسێک شکستی هێنا بە ڕێگایەک کە وادیار بێت دوژمن ئاگاداری تۆپەراسیۆنەکە

بووە بەرلەوەی ڕوویدات، گرنگە لێکۆڵینەوە بکرێت کە دوژمن چۆن بەمەی زانیوە. هیچ گومانی تیادا نییە کە لە ئەگەری ئاشکرابوونی پلانی ئۆپەراسیۆنێکدا، دەستی ناوەکی لەناو دەزگاکەدا ڕۆڵی لەئاشکرابوونی ئەو پلانەدا هەیە. ئەگەر زنجیرەیەک لە شکستی یەک لەدوای یەک ڕوویاندا، دەکرێت بژاردەکان تەسک بکەینەوە؛ بۆ نموونە، ڕەنگە تەنیا یەک کەسی دیاریکراو ڕێگای پێدرابێت دەستی بە هەموو زانیاریەکان بگات. لەلایەکی ترەوە، زنجیرەیەک شکست ڕەنگە ئاماژەی ئەوەش بێت کە کەناڵێکی پەیوەندی یان سیستەم شکێنرابێت. بۆ نموونە، لەکۆتاییەکانی ساڵانی شەستەکانەوە تا سەرەتای هەشتاکان، بەرپرسانی هێزی دەریایی ئەمریکا بەشێوەیەکی ڕۆتینی لەناکاو دەیانبینی کە کەشتیەکانی سۆڤیەت چاوەڕوانی کەشتیگەلی جەنگی ئەمریکا دەکەن لەو شوێنانەی کە بەشێوەیەکی نهێنی تەرخانکرابوون بۆ مەشق و ڕاهێنانەکانیان. یەکێک لە ئەدمیراڵەکان جارێکیان وتی، "وەک ئەوە وایە ئەوان نوسخەیەکی پلانەکانی ئێمەیان لابێت." بەڵام دواتر ئاشکرا بوو کە *جۆن وۆکەری* سیخوڕ لەساڵی ١٩٨٥ زانیاری بە سۆڤیەتیەکان داوە وە بەشێوەیەکی پەیامەکانی ناردووە کە بگات بە دەستی سۆڤیەت. لە هەر ڕووداوێکدا بێت، دەبێت ئەو زنجیرە شکستانە وشیارکردنەوەیەک بێت بۆ دەزگای هەواڵگریی لە ئەگەری ئەوەی کە دوژمن لەناو خودی دەزگاکەی سیخوڕێکی داناوە و زانیاریەکانی لێوەوە چنگ دەکەوێت.

کاتێک خیانەتی *ئالدریچ ئەیمیس* بووە هۆی لەدەستدانی ژمارەیەک لە سەرچاوەی هەواڵگریی لە یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٨٥-٨٦، دەزگای *سی ئای ئەی* هەستی بە کێشەیەکی جددی کرد. لەسەرەتادا، گومانەکانی

ئەو دەزگایە لەسەر ئەوە ئەگەرە بوون کە دەزگای *(KGB)* دەستی بە پەیوەندیەکانی دەزگاکەی دەگات یان بەشێوەیەکی بێ سەروبەر ئۆپەراسیۆنەکە بەڕێوەبراوە.

هەنگاوەکانی دواتری سی ئای ئەی بۆ زانینی هۆکاری ئەو شکستانە بەو براویە گەشتن کە چەندین هۆکار کاریگەریان هەیە: ئۆپەراسیۆنەکانی فێڵی *(KGB)*، کەیسی *لۆنتیتری*، وە ئەو گومانەی کە سۆڤیەت توانیویەتی ئامێرێکی بچووکی سیخوڕی لەناو باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە مۆسکۆ دابنێت.

لەکۆتاییدا، سی *ئای ئەی* گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دەبێت سەرنجی سەرەکی بخاتە سەر *ئەیمیس* نەک لە ئەنجامی شیکردنەوەیەکی ژمەوالگریی شکستە یەک لەدوای یەکەکان بەڵکو بەهۆی ئەوەی هاوکارێکی تێبینی کرد وە رایگەیاند کە *ئەیمیس* زیاتر پارە خەرج دەکات بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی بەدەستی دەهێنێت.

چوار بەشەکەی پێشوو باسی جۆرەکانی چالاکی هەواڵگریی وە ئەو پرسانەیان دەکرد کە سەبارەت بەم چالاکیانە بوون. ئێستا لە باسی خودی چالاکیە هەواڵگرییەکانەوە دەچینە سەر پەیوەندی نێوان هەواڵگریی وە حکومەت کە دامەزراوەیەکە لێی وە ئەو پرسیارانەی سەروکاریان هەیە لەگەڵ کارگێڕی هەواڵگیی لەلایەن دەزگا ناهەواڵگرییەکانی سەرووی خۆیان، یان بە واتایەکی تر "بەرپرسە سیاسیەکان."

لە گۆشەنیگای کارگێڕییەوە، هەواڵگریی کار لەسەر دوو پرسی هەرە سەرەکی دەکات. یەکەمیان بریتییە لە نهێنیگەریی کە تیایدا چالاکیە هەواڵگرییەکان بەشێوەیەکی پێویست ئەنجام دەدرێن؛ سەرنجی سەرەکی لەسەر ئەو بارقورسیە تایبەتیەیە کە نهێنیگەریی بۆ بەرپرسە باڵاکانی سیاسی دروست دەکرێت کە کاریان چاوەدێریی و کۆنترۆڵکردنی چالاکییە هەواڵگرییەکانە. دووەمیان بریتییە لە پەیوەندی شلۆقی نێوان شارەزایی و دارشتنی سیاسەت. ئەمە سەروکاری لەگەڵ ئەو کێشانەدا هەیە کە بڕیار لەسەر قورسایی بۆچوونی شارەزایانی هەواڵگریی دەدەن کە دەبێت لەلایەنی کارگێڕییەوە بە هەند وەربگیرێن لە بڕیاردان لەسەر مەسەلە سیاسیەکاندا لەسەر بنەمای لێهاتوویی ئەو کەسانەی لەبواری هەواڵگرییدا کاردەکەن.

## نهێنیکەریی و کۆنترۆڵ

لە حکومەتێکی مۆدێرندا، کە خاوەنی چەندین هەزار فەرمانبەرە، کێشەکی کۆنترۆڵکردنی ژمارەیەکی زۆر چالاکی وە دڵنیابوون لەوەی کە ئەو چالاکیانە لەگەڵ یاسا و سیاسیەکانی سەرووی خۆیانەوە یەک دەگرنەوە کارێکی قورسە. سەبارەت بە دەزگا هەواڵگرییەکان، کێشە بنچینەیی بریتییە لە نهێنیکەریی، سەرچاوە هەواڵگرییەکان، میتۆد، وە نهێنی چالاکیەکان کە بۆ چەند کەسێکی تایبەت زانراو بێت لەناو حکومەتدا.

ئاشکرایە کە لە پرەنسیپدا کۆنترۆڵی چالاکیەکانی حکومەت بە مۆدێلی پلەوپایە رێکدەخرێت، بۆ ئەوەی هەر بەرپرسێک لە کۆتاییدا بەرپرس بێت لە هەمبەر سەرۆکی حکومەتەکەدا. بەم شێوەیە، مەرجی هەرە کەم بۆ کۆنترۆڵکردن بریتییە لەوەی کە هەر سەردارێک مافی ئەوەیەی هەیە هەموو زانیاریەکانی پلە نزمتری خۆی بزانێت. بەگشتی، رەنگە ئەم مەرجە جێبەجێ بکرێت، هەرچەندە بیرۆکەی نکۆڵی قابیلکەر هەندێ پرسیاری گرنگ لەم بارەدا دەورووژێنێت.

دەستگەیشتن بە زانیاری دەربارەی چالاکیەک لەڕووی تیۆریەوە بەس نییە بۆ کۆنترۆڵکردنی بەشێوەیەکی کاریگەر. لە بواری تری چالاکی حکومیدا، کۆنترۆڵی لەسەرەوە بۆ خوارەوەی راستەوخۆ لەلایەن سەردارانەوە بە چەند میکانیزمێکی تر ئەنجامدەدرێت، بەهەردوو شێوەی فەرمی و نافەرمی: لێکۆڵینەوە لەلایەن وردبین و پشکنەری گشتی، تەحەدی و گازەندە لەلایەن ئەو بەشانەی کێبرکێ دەکەن، لێکۆڵینەوەکان دەربارەی دەزگاکانی جێبەجێکردنی یاسا، چاوەدێری تەشریعی، روماڵی رۆژنامەوانیی، وە ئەو گازاندە و گلەییانەی لەلایەن خەڵکەوە دێن.

جێبەجێکردنی ئەم میکانیزمانە لەسەر چالاکیە هەواڵگرییەکان پێویستی بەوەیە زانیاریی دەربارەی ئەو چالاکیانە بڵاوبکرێنەوە. جا تا چ ئەندازەیەک ئەو زانیارییە بڵاوبکرێنەوە لەسەر ئەو میکانزیمە دەوەستێت کە دەگیرێتەبەر، چونکە ئەو جۆرە میکانزیمە دەکرێت تەنیا پێویستی بە ئاگادارکردنەوەی چەند بەرپرسێکی لقی جێبەجێکار بێت؛ یەکێکی تر، ئەندامانی یاسادانان و دەستەکەی؛ وە سێیەمیان، خەڵک بەشێوەیەکی گشتی. لە هەر حاڵەتێکدا، دەبێت هاوسەنگیەک دروست بکرێت لە نێوان ئەو مەترسییەی هەیەتی لە فراوانکردنی بازنەی ئەو کەسانەی دەستیان بەو زانیاریانە دەگات، وە ئەو سوودەی لە فراوانکردنی تواناى سەرلنی سیاسیی دەزگاکانی هەواڵگریی بۆ کۆنترۆڵکردنی کارەکانیان وەردەگیرێت.

## نکوڵی قابیلکەر

لەبەرئەوەی ئەو میکانیزمانەی کۆنترۆڵکردن پێویستیان بەوەیە زانیاری بڵاوبکاتەوە، دەکرێت کەسێک بڵێت کە بەگشتی ناچوونیەک دروست دەبێت لەنێوان نهێنیگەریی و کۆنترۆڵی کاریگەر. لەگەڵ چالاکی هەواڵگرییدا، بەئەنجامگەیاندنی کۆنترۆڵێکی کاریگەر دەکرێت زیاتر ئاڵۆز بێت بەهۆی گرتنەبەری نکوڵی قابیلکەر، کە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە تەنانەت سەردارانی سەری سەرەوەی دەسەڵات دەکرێت بخرێنە خانەی گومانەوە. بەگوێرەی ئەم ڕێبازەوە، هەروەک لەسەرەوەدا باسکرا، ئەو چالاکییە هەواڵگرییانەی کە دەکرێت ببنەهۆی ناڕەحەتی (چونکە یاسا نێودەوڵەتیەکان دەشکێنن، یان بەهۆی هەندێ هۆکاری تر) دەبێت بەشێوەیەک پلانیان بۆدابنرێت و جێبەجێ بکرێن کە سەرۆکی حکومەت

بەشێوەیەکی متمانەپێکراو نکۆڵی بکات کە هیچ ئاگاداری ئەو چالاکیانە بووە یان تەنانەت زانیاری هەبووبێت کە وجودی هەیە. هەروەک تێبینی کرا، ئەم ڕێبازە زیاتر پەیوەستە بە چالاکی پەنهانیەوە، هەرچەندە دەکرێت لەسەر چالاکیەکانی تری هەواڵگریش جێبەجێ بکرێت، وەک سیخوڕیی یان چاودێری ئاسمانی فۆتۆگرافی کە سەرپێچی بەزاندنی ئاسمانی وڵاتی ئامانج بکات.

نکۆڵی قابیلکەر دەکرێت کۆنترۆڵی چالاکییە هەواڵگرییەکان ئاڵۆز بکات لەسەر ئەو شوێنەی جێبەجێ دەکرێت. بۆ ئەوەی ئەو کۆنترۆڵە کاریگەر بێت، تەنیا پێویستی بەوە نییە کە زانیاری چالاکیەکە سنووردار بکرێت بۆ چەند بەرپرسێکی دیاریکراو بەڵکو پێویستی بەوەش هەیە هیچ ڕێوشوینێکی فەرمی نەگیرێتە بەر کە لێیەوە ڕەزامەندی دەرببڕدرێت وە هیچ بەڵگەنامەیەکی فەرمیش بوونی نەبێت کە بەهۆیەوە ڕەزامەندیەکەی پەسەند بکرێت. خودی چالاکیەکە دەبێت بەشێوەیەک ئەنجام بدرێت کە کەمترین تۆماری هەبێت، وە ئەو فایلانەی کە بۆیشی دروستکراون دەکرێت هەر دوای کۆتاییهاتنی چالاکیەکە بەتەواوی لەنێو ببردرێن. ئاشکرایە، ئەمە پێشمەرجێک دروست دەکات بۆ تێنەگەیشتن و نادڵنیایی بۆئەوەی کە ئایا ئەو کردە تایبەتیە هەر ڕێگای پێدراوە یان نا. بەبێ هیچ تۆمارێکی نووسراو، دەکرێت بەئاسانی نکۆڵی لەوە بکرێت کە ئایا ئەو چالاکییە هەر لەسەرەتاوە ڕەزامەندی سەرۆکی حکومەت یان بەرپرسە باڵاکانی ناهەواڵگرییەوە وەرگرتووە یان نا.

ڕەنگە دیارترین نموونەی چۆنیەتی کارکردنی نکۆڵی قابیکەر بەشێوەیەکی کرداریی بریتیی بێت لەو نموونەیەی کە لەلایەن لێکۆڵینەوەی کۆنگرێسی

چالاکیە هەواڵگرییەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٧٥-٧٥ خرایە بەردەست.
کۆمیتەیەکی ئەنجوومەنی نوێنەران، بەسەرۆکایەتی سیناتۆر چێرچ لە هەوڵەکانی سی ئای ئەیان کۆڵیەوە لە ساڵانی سەرەتای شەستەکاندا بۆ کوشتنی *فیدل کاسترۆی* سەرۆکی کوبا. بەگوێرەی راپۆرتی لێژنەکە لە تێوەگلانی سی ئای ئەی لە پیلانی کوشتنەکەدا، "بەڵگەی کەم هەبوو کە لێیانەوە لێژنەکە بتوانێت بگاتە ئەو ئەنجامەی کە سەرۆک *ئازنهاوەر*، *کەنەدی*، یان *جۆنسن*، راوێژکارە نزیکەکانیان، یان گرووپی تایبەتی (گرووپێکە لە پێشنیارەکانی چالاکی پەنهانی دەکۆڵێتەوە) رێگایان بە کوشتنی *کاسترۆ* دابێت."
لە راستیدا، ئەو تۆمارەی لێژنەکە دۆزیەوە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ئاڵۆز بوو دەربارەی رێپێدانەکە. بەرپرسە باڵاکانی سی ئای ئەی وتیان ئەوان هەستیان بە ڕەزامەندی تەواوکردووە بۆ ئەنجامدانی ئەوەی کە کردیان بەڵام ئەم ڕەزامەندییە تەنیا لە چەند وشەیەک تێنەپەڕی، جا چ بەنووسراو یاخود بە وتراو. بەکورتی، لێژنەکە نەیتوانی بگات بە هیچ دەرئەنجامێک کە بیسەلمێنێت ئەو کردەوەیە ڕەزامەندەی بۆ وەرگیراوە.
هیچ یەکێک لە تۆمارە بەردەستەکان نەیدەتوانی سەرۆک *کەنەدی* یان براکەی، *رۆبەرت کەنەدی* داواکاری گشتی (کە ڕۆڵێکی سەرەکی بینی لە نەخشاندنی سیاسەت لە هەمبەر کوبا) لە نکۆڵی قابیلکەری هەر تێوەگلانێک یان زانیارییەکی هەوڵەکانی کوشتنەکە.
هەربۆیە، سەرەڕای ئەو گەنگەشەیەی کە کۆنترۆڵی دەزگا هەواڵگرییەکان لەلایەن سەردارە سیاسییەکانەوە دەکرێت کێشەدار بێت، راپۆرتی لێژنەی کڵێسا لەڕاستیدا ئەوە نیشان نادات کە ئەمە کەیسەکە بووە سەبارەت بە

هەوڵەکان بۆ کوشتنی *کاسترۆ*. لەجیاتی ئەمە، لێژنەکە ئەوە نیشان دەدات کە چۆن ڕێبازی نکۆڵی قابیلکەر کاردەکات بۆ دروستکردنی فەڵفانێکی ئاسنین بۆ ئەوەی سەرۆک لە لۆمە بەدووربێت. ئەمە ئەوە ئەگەرە بە کراوەیی جێ دەهێڵێت کە سی ئای ئەی کۆنترۆڵ نەدەکرا.

## هەواڵگریی کار بۆ کێ دەکات؟

لە حاڵەتی ئاساییدا، هەواڵگریی، وەک ئاشکرایە، کە بۆ سەرووی خۆی کە سەرۆکی حکومەتە کاردەکات بەڵام دەبێت شێوازی کارکردنیشی بگونجێت لەگەڵ ڕێبازی نکۆڵی قابیلکەر، واتە هەر کاتێک چالاکیەک ئەنجامدرا کە پێویست نەبوو سەرۆکی ئەو حکومەتە تێوەگلانی حکومەتەکەی ئاشکرا بکات، دەبێت بەبێ دوودڵی نکۆڵی لە بوونی چالاکیەکی لەم جۆرە بکات. هەواڵگریی وەک کۆنترۆڵی ئاسایی سەرۆکی حکومەت نییە کە فەرمان بە وەزارەت وە بەشەکانی خوار خۆی دەکات لەڕێگای فەرمانی نووسراو، بڕیاری کابینە، یان کەسی، دڵسۆزیی دەزگا هەواڵگرییەکە بۆ سەرۆکی حکومەتەکە، مەرجی یەکەمی بەڕێوەچوونی کارەکانە نەوەک لەڕێگای فەرمان و فەرمانکاریەوە ئەمریان لەسەر بکرێت. لە کۆندا، دەزگا هەواڵگرییەکان بۆ پاشا، دەزگایەکی ئایینی، یان فەرماندار لە دەرەوەی پێکهاتەی ئاسایی حکومیی بوون. بۆ نموونە، *فرانسیس وۆسینگهام*، وەزیری بەهێزی دەرەوەی شاژنی ئەلیزابیسی یەکەمی ئینگلتەرا، پشتگیریەکی کاریگەری لە دەزگا هەواڵگریی کرد لەسەر حیسابی خۆی(وە خەریک بوو موفلیس بێت لەو پرۆسەیەدا).

بەهەمانشێوە، دوقی *مارلبۆرۆ*[1] فەرمانداری گشتی بەریتانی لەکاتی جەنگی جیابوونەوەی ئیسپانیدا، لەسەدا دووی پارەی زیادەی لەسەر موچەی بەریتانیەکانی سوپاکەی دەدا، بۆ ئەوەی دەزگای نهێنیی ئەو وڵاتە سەرکەوێت. ناوبراو ئەم پارەدارکردنەی وەک خزمەتێکی شایستە لەقەڵەم دەدا، بەڵا دواتر لەلایەن ڕکابەرە سیاسییەکانیەوە بەتاوانی دزینی پارە کوژرا. لە هەردوو نموونەکەدا، جیاوازی لە نێوان پارەدارکردنی گشتی و تایبەتی یان چالاکیەکان ناڕوونە. ئەم جۆرە ڕێکخستنە لە حکومەتێکی بیرۆکراتیدا جێگای نابێتەوە، کە تیایدا جیاکردنەوەی نێوان ئەرکەکانی کەرتی گشتی و تایبەتی بەتەواوی ڕوونە.

بەڵام لێرەدا پرسەکە تەنیا پەیوەست نییە بەوەی کێ دەزگاکە پارەدار دەکات. پرسێکی گرنگتر لێرەدا سەرهەڵدەدات لەوەی کە کێ دەتوانێت ڕەزامەندی دەرببڕێت بۆ هەر دەزگایەک بۆ ئەنجامدانی چالاکی هەواڵگریی. ئەمە بەتایبەتی گرنگە لە حکومەتێکی دەستووریی وەک ئەمریکا، کە تیایدا دەسەڵاتەکانی حکومەت دابەشکراون بەسەر لقەکانی حکومەت وە دەسەڵاتدارە سیاسییەکان بەرپرس لە دەنگدەرانیان. سەرۆک دەسەڵاتی ڕەهای هەیە بۆ هەر ئۆپەراسیۆنێکی هەواڵگریی لەسەر بنەمای بەرپرسیاریەتی سیاسەتی دەرەوە و سەربازیی لەژێر دەستووردا. لە هەمانکاتدا، کۆنگرێس جەخت لەسەر نووسراوی فەرمی دەکاتەوە لەلایەن دەزگای هەواڵگرییەکان کە کێ ڕەزامەندی دەربڕیوە لەسەر چالاکیەکانی. بۆیە، کاریگەری گرنگی تەداخولی کۆنگرێس لەم بوارە بریتییە لەوە

[1] "دوق" بەرزترین پلەی کۆمەڵایەتییە لە دەرەوەی بنەماڵەی شاهانە.

چالاکیە هەواڵگریەکانیش بەشێک بن لە کۆنترۆڵی بیرۆکراتی لەنێو بەشی جێبەجێکاری حکومەتدا.

## پسپۆڕیی و سیاسەت

لە برگەی پێشووی ئەم بەشەدا باس لە پەیوەندی نێوان پێویستی بۆ ئەنجامدانی چالاکی بەشێوەیەکی نهێنیی وە بەڕێوەبردنی چالاکیە هەواڵگرییەکان کرا. چەند گرفتێکی تر کە تووشی ئەو چالاکیانە دەبن بریتیین لە پەیوەندی نێوان پسپۆڕیی و سیاسەت- واتە، لە نێوان ئەوانەی کە زانیاری تایبەتیان لایە دەربارەی گرفتێک وە ئەوانی کە دەسەڵاتیان هەیە بۆ یەکلاییکردنەوە و جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی حکومەت دەربارەی ئەو زانیارییە. ئەم پەیوەندییە گرفتێکە لە بەشەکانی تری حکومەتدا، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو بوارە سیاسییەی کە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن.

چەندین گرفت و ململانێ لەنێوان پسپۆڕیی و سیاسەتدا سەرهەڵدەدەن. گرنگترین ئەو گرفتانە بریتین لە پرسی ئەوەی کە دەبێت پسپۆڕیی چ ڕۆڵێک بگێڕێت لە دروستکردنی و فۆرمولەکردنی پرۆسەی سیاسییدا. سنوورەکانی نێوان وەزیفە و بەرپرسیارەتیەکانی شارەزایانی ئەو بوارە دەکەونە کوێ، وە سەرەڕای ئەمەش، ئەی سنوورەکانی داڕێژەرانی سیاسەت دەکەونە کوێی ئەم چوارچێوەیە؟ بێگومان، ئێمە دەمانەوێت سیاسەت بەباشترین زانیاری بەردەست ڕێنمایی بکرێت؛ ئێمە ڕەخنەی زۆر لەو کەسانەی داڕێژەری سیاسەتن دەگرین کە ئەو ڕاستیانەی بەردەستن فەرامۆش دەکەن وە بڕیارە سیاسیەکانیان لەسەر بنەمای بۆچوونە

ناتەندروستەکانیان بنیاد دەنێن. لە هەمانکاتدا، ئێمە دەمانەوێت سیاسەت لەسەر بنەمای ئەو کەسانە دابڕێژرێت کە سیستەمی سیاسیی (بەهۆی هەڵبژاردن یان دامەزراندن) بەرپرسیاریەتی سەرکردایەتی پێداون؛ لە هەر دۆخێکدا بێت، دەبێت ئەو کەسانە بەرپرسیاریەتی تەواو بۆ سیاسەتەکانیان لە ئەستۆ بگرن، بەبێ گوێدانە ئەو زانیاریانەی کە سیاسەتەکانیان لەسەر ڕۆنراوە.

زانستی کۆمەڵایەتی هاوچەرخ بەشێوەیەکی تیۆری ئەم کێشەیە چارەسەر دەکەن لەڕێگەی جیاوازی یەکلاییکردنەوەی دروست و نادروست (fact-value): زانستی کۆمەڵایەتی دەتوانێت ڕاستیەکان دەرخات و بیانخاتە بەردەم حکومەت، بەڵام داڕێژەرانی سیاسەت لە هەڵبژاردنی ئەو ڕێگایەی کە ئەوان جێبەجێی دەکەن ئیختیاریان هەیە.

سەرەڕای ئەمە، ئەم چارەسەرە تیۆرییە لە کرداردا ڕێنماییەکی زۆر کەمی بەسوودی هەیە. بەر لەهەر شتێک، زانستە کۆمەڵایەتیەکان زۆر دوورن لە توانای پێشبینیکردنی کتوپڕ لە هەر ئەگەرێکی چاوەڕواننەکراودا؛ بەتایبەتی سەبارەت بە پرسەکانی ئاسایشی نیشتیمانی کە هەواڵگریی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، ئەم جۆرە توانا پێشبینیکراوە بوونی نییە لەم زانستەدا. دووەم، گفتوگۆکان لە بواری ئاسایشی نیشتیمانیدا زیاتر مامەڵە لەگەڵ دەرئەنجامەکانی سیاسەتدا دەکەن وەک لە جیاوازی سەبارەت بەوەی کامە ڕێگا دەبێت جێبەجێ بکرێت. هەموو کەسێک بەئاسانی دەتوانێت ڕەزامەند بێت لەسەر ئاشتیی، ئازادیی، وە بوژانەوەی ئابووریی وەک ئامانج، بەڵام ئەو ئامرازانەی بەردەستن بۆ بەدەستهێنانیان بەشێوەیەکی بێ کۆتا مشتومڕیان لەسەر دەکرێت. بەپێچەوانەوە، ئەگەر

بەدڵنیاییەوە بوترێت کە جۆرە ڕێگایەکی سیاسیی ئەم ئامانجانە بەدەست دەهێنێت، ڕۆڵی داڕشتنی سیاسەت بە تا ئەندازەی لەناوچوون ون دەبێت. لەبەر ئەوەی شیکردنەوەی هەواڵگریی دەتوانێت تا ئەندازەیەکی باش پێشبینی ڕووداوەکان بە داڕێژەرانی سیاسەتدا بدات لەسەر ئەوەی چی ڕوودەدات ئەگەر سیاسەتمەداران ڕێنماییەکانیان لەبەرچاو بگرن، بەڵام چارەسەری زانستی کۆمەڵایەتی بۆ ئەم بابەتە سوودێکی کەمی هەیە بۆ لەناوبردنی ڕۆڵی هەواڵگریی و سیاسەت. لە پراکتیکدا، هەڵبژاردنەکانی داڕێژەرانی سیاسەت زیاتر پشت بە تێڕامانەکانیان دەبەستێت دەربارەی ئەنجامەکانی سیاسەتەکان وەک لە پشت بەستن بە هەڵبژاردنەکانیان لە ئامانجەکاندا. بەم شێوەیەش، ئەو شتەی داڕێژەرانی سیاسەت دەیکەن بەڕوونی جیاناکرێتەوە لەوە شارەزایان (لەم کەیسەدا، شیکەرەوانی هەواڵگریی و خەمڵێنەرەکان) دەیکەن؛ بۆیە، جێگای سەرسوڕمان نییە کە پەیوەندی نێوان هەواڵگریی و سیاسەت گرژیی بەخۆیەوە دەبینێت. هەر لایەک وادەزانێت ئەوەی تریان سنووری ئەوی تری بەزاندووە.

## "کوشتنی پەیامبەر"

لە تێڕامانی تایبەتی ئەفسەرانی هەواڵگرییەوە، کێشەکانی نێوان هەواڵگریی و سیاسەت بۆ هەڵەی داڕێژەرانی سیاسەت دەگەڕێتەوە. بارقورسییەکان، بە بۆچوونی ئەوان، لەو شوێنەدا سەرهەڵدەدات کە داڕێژەرانی سیاسەت ڕاپۆرتە هەواڵگرییەکان بە هەند وەرناگرن کە پشتیوانی لەو سیاسەتانە ناکەن کە ئەوان دەیگرنەبەر. ئەفسەرانی سیاسەت بەزۆری وابیردەکەنەوە کە داڕێژەرانی سیاسەت زیاتر حەزیان لە

ئەنجامی هەواڵگرییە تەنیا تا ئەو ڕادەیەی بۆ پشتیوانیکردن لە سیاسەتەکانیان بەکاردێت، کە ئەوان گرتویانەتەبەر بەهۆکاری تەولو جیاواز. کاتێک ئەنجامی هەواڵگری پشتیوانی لە سیاسەتەکانیان ناکات، یان ئەوەتا فەرامۆشی دەکەن یانیش هەوڵ دەدەن لە ڕێگای بەکارهێنانی فشاری سیاسییەوە ناوەڕۆکەکەی بگۆڕن.

ئەم تێڕامانە ڕێگای خۆش دەکات بۆ ئەو بۆچوونەی کە گرنگترین تایبەتمەندی هەر دەزگایەکی هەواڵگریی بریتییە لە سەربەخۆبوونی لە داڕێژەرانی سیاسەت. تەنیا دەزگایەکی هەواڵگری سەربەخۆ، بەپێی ئەم تێڕامانە، دەتوانێت لە هەمبەر فشارە سیاسییەکاندا بوەستێت کە داڕێژەرانی سیاسەت هەوڵدەدەن تێڕامانەکانیان زاڵ بکەن بەسەر چالاکییە هەواڵگرییەکاندا.

بەکورتی، ئەرکی سەربەخۆیی ئەوکاتە بریتیی دەبێت لە لەکارخستنی نیشانەکانی "کوشتنی پەیامبەر،" واتە مەیلی لۆمەکردن (یان بەلایەنی کەمەوە فەرامۆشکردن)ی پەیامبەرەکان- شیکەرەوەکانی هەواڵگریی- کە هەواڵی نەویستراو دەهێنن، جۆرە شیکردنەوەیەک کە پشتیوانی سیاسەتی دروست ناکەن. بێگومان، ئەمە لەلایەن داڕێژەرانی سیاسەتەوە بەربەستی بۆ دروست دەکرێت، بەڵام تێگەیشتنێکی واقیعبینانە بۆ ئەم مەسەلەیە هۆکاری سەرکەوتنی دەزگایەکی هەواڵگرییە. ئاشکرایە کە هەر پێشهاتێکی سیاسیی ناخۆش ئەگەر ئاگادار نەکرابێتەوە لەلایەن دەزگا هەواڵگرییەکانەوە، دەکرێت دەرئەنجامی کارەساتبار بەدوای خۆیەوە بهێنێت. هەربۆیە، مەرجێکی سەرەکی سەرکەوتنی کاری سیاسیی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە پێش ئەنجامدانی هەر هەنگاوێک گرنگە لایەنی

هەواڵگریی ئاگادار بکاتەوە ئەگەرنا، لەڕاستیدا، هەنگاوەکانی ئەو سیاسەتڤانە بە نائەقڵانی دادەنرێت.
سیاسەتڤان نابێت بکەوێتە ژێر کاریگەریی ماندەرێکی نائەقڵانی کە حەزبکات رێ لە دەزگایەکی هەواڵگریی بگرێت لە ئاگادارکردنەوەی لە پێشهاتی نەویستراو. لە وڵاتە مۆدێرنە بیرۆکراتەکاندا، هیچ بەرپرسێک- تەنانەت سەرۆکی حکومەتیش- زانیاری هەواڵگریی یان خەملاندن وەرناگرێت لەسەر بنەمای ئەوەی کە بەرپرسە باڵاکانی تریش هەمان شتیان پێنادرێت.
ئاشکرایە، ئەوەی لە بەرژەوەندی داڕێژەرێکی سیاسەتدا بێت ناکرێت لە بەرژەوەندی نیشتیمانیدا بێت. لە دیدگای نیشتیمانیەوە، ئێمە دەبێت هەرچیەک پێویست بێت بخوڵقێنین بۆئەوەی بەباشترین شێواز لە خزمەتی سیاسەتی نیشتیمانیدا بێت نەوەک سیاسەتمەدار. بەگشتی، داڕشتنی باشترین سیاسەت پێویستی بەوە هەیە کە هەموو ئەنجامە پەیوەستدارەکانی هەواڵگریی بەردەست بۆ هەموو ئەو کەسانەی لە چالاکیەکی سیاسیدا بەژدارن بەردەست بن.
دوای نیشاندانی هەموو ئەو زانیارییە بەردەستانە، ئەم جارە کار دەکاتە جێبەجێکردنیان، ئەمەش خۆی لە خۆیدا هەڵگری گرفتێکی ترە؛ هەرکە سیاسەتێکی تایبەت دیاریکرا، دەبێت بەشێوەیەکی فراوان هەموو ئەو ئارگومێنتانەی لەدژیدا خۆیان لە بۆسە ناوە فەرامۆش بکرێن. سەرۆک *لیندۆن جۆنسۆن*، بەم شێوەیە کێشەکەی ڕوونکردۆتەوە: "داڕشتنی سیاسەت وەک دۆشینی مانگایەکی قەڵەو وایە. تۆ دەبینی کە شیر لە گوانەکانی دێتە خوارەوە، وە زیاتر گوانەکانی دەگوشی، هەر کە سەتڵەکە

پڕ بوو، مانگاکە بە کلکەکەی لەو سەتڵە پڕشیرە دەدات و هەمووی دەڕژێنێت. ئەمە ئەوکارەیە کە سی ئای ئەی دەیکات لە هەمبەر داڕشتنی سیاسەت."

## سەربەخۆیی هەواڵگری

بەلەبەرچاوگرتنی ناکۆکی نێوان سیاسەت و هەواڵگریی، دەکرێت بڵێین پرسی سەربەخۆیی هەواڵگریی ئاڵۆز دەبێت. بۆ نموونە، لە فەرماندەیەکی سەربازییدا، ئەفسەری بەرپرس لە هەواڵگریی بەشێکە لە ستافەی فەرماندەیی (واتە لەژێر فەرماندی فەرماندە سەربازییەکەیدایە)؛ هەربۆیە بەهیچ پێوەرێک ناتوانێت بەشێوەیەکی سەربەخۆ کارە هەواڵگرییەکانی ئەنجام بدات. لەڕاستیدا، واتای دروستی ئەو داوایەی کە دەزگایەکی هەواڵگریی "سەربەخۆ" بێت هێشتا یەکلایی نەبۆتەوە و ڕوون نییە. لە پرەنسیپدا، هیچ کەسێک داوای ئەوە ناکات کە دەزگایەکی هەواڵگریی سەربەخۆ و جیابێت لە سەرۆکایەتی حکومەت. سەرەڕای ئەمەش، هەروەک لەسەرەوەدا ئاماژەی پێدرا، بەزۆری خەڵک دەیەوێت هەواڵگریی وەک ناوبژیوانی بێلایەنی جەنگی سیاسەت بەکاربهێنێت نەک تەنیا لەنێو بەرپرسە حکومیەکاندا بەڵکو لە نێوان بەرپرسە حکومیەکان و ڕەخنە یاسایی و ئەو کردەوانەی کە لە دەرەوەی مەزنومەی حکومەتدا دەیکەن. هەروەک باسکرا، ئارگومێنتی سەرەکی بۆ سەربەخۆیی ڕەگەکەی لە نیشانەکانی "کوشتنی پەیامبەر"ەوەیە: واتە، هەواڵگریی دەبێت سەربەخۆ بێت ئەگەر شیکەرەوەکان توانیان ڕاستی هەروەک چۆن هەیە بیڵێن. لەم چوارچێوەیەدا، سەربەخۆیی واتە توانای بەرگرییکردن لە شیکەرەوەکان

لە هەمبەر ئەو فشار و هەڕەشانەی کە دەکرێت تووشیان بێت کاتێک بڕیارێک دەدەن لە بەرژەوەندی سیاسەتڤاناندا نەبێت. بەجۆرێک لە جۆرەکان، ئەم جۆرە سەربەخۆییە دەکرێت لە ڕێگای دروستکردنی دەزگایەکی هەواڵگریی مەرکەزی بەدەست بێت، دەزگایەک کە سەربە سەرۆکایەتی حکومەت بێت نەوەک سەربەو لایەنانەی سوود لە زانیاری هەواڵگریی دەبینن وەک کاروباری دەرەوە یان وەزارەت و بەشەکانی بەرگریی. دەکرێت بڵێین کە خودی سەرۆکایەتی حکومەتیش خۆیان سوود لە هەواڵگریی وەردەگرن، بەجۆرێک کە سوودی هەبێت بۆ پەرەوپێشبردنی شکۆی کەسیی لە سیاسەتێکی دیاریکراودا. لەم حاڵەتەدا، گرفتەکە لە ئاستێکی باڵاتر دووبارە سەرهەڵدەداتەوە. لە کۆتاییدا، تا ئەوکاتەی دەزگای هەواڵگریی بەشێک بێت لە حکومەت، تاکە پاسەوان بریتییە لە ئازایەتی و لێهاتوویی بەرپرسانی دەزگا هەواڵگرییەکە واتە، ویست و توانایان بۆ پاراستنی شیکەرەوەکان لە فشاری دەرەکی. سەربەخۆیی بەتایبەتی لەوکاتەدا گرنگە کە پێویستە واز لە سیاسەتگەلێک بهێنین کە ئەنجام بەدەستەوە نادەن یان کە سوودیان بۆ گۆڕینی دۆخێکی ناهەموار نییە. بۆئەوەی ئەمە ڕووبدات، دەبێت هەندێ میکانیزم بخرێنەگەڕ کە دڵنیایی ئەوە بدەن هەموو زانیارییە وابەستەکان، بە ئەرێنی و نەرێنییەوە، بۆ پێداچوونەوەی سیاسەتەکە بەردەستن بن.

سەرەڕای سوودەکانی سەربەخۆیی هەواڵگریی، بێگومان زیانیشی هەیە. مەزنترین زیانی سەربەخۆیی دەکرێت ئەوە بێت کە کاری هەواڵگریی لە سیاقی سیاسەتدا هیچ بایەخێکی نامێنێت، یان هەر هیچ نەبێت لەلایەن سیاسەتڤانانەوە ئاوا لێکدەدرێتەوە. هۆکاری ئەمە ئەوەیە چونکە

شیکەرەوەی هەواڵگریی نازانێت چ گرفتێک سەرەکیە بۆ داڕێژەرانی سیاسەت یان چ بژاردەیەک لەبەرچاوگیراون بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتانە. جاروبار شیکەرەوانی هەواڵگریی ئەوە ڕەتدەکەنەوە هاوکاربن لە بەئەنجامگەیاندنی سیاسەتەگەلێک کە خۆیان پشتیوانی ناکەن. بەواتایەکی تر، ئەگەر هەواڵگریی تەواوی سەرنجی خۆی بخاتە سەر ڕۆڵی دوژمن، ئەوکاتە کارەکە قورستر دەبێت بۆ خۆی بۆ ئەوەی پشتیوانی جێبەجێکردنی سیاسەتی ڕاستەقینە بکات. ئەگەر هەواڵگریی بیەوێت پشتیوانی لە سیاسەت بکات، ئەوا دەبێت هەموو هەوڵی خۆی بەگەڕبخات بۆ ئەوەی زانیاری پەیوەست بە جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە دیاریکراوە بدۆزێتەوە. هەر بۆ نموونە، کاتێک دەبینین گروپێکی تیرۆرستی نێودەوڵەتی پشتیوانی لۆجیستی و دارایی لە وڵاتێک وەردەگرن، دەبێت هەواڵگریی بەدوای میکانیزمێکدا بگەڕێت کە چۆن بەرپەچی بداتەوە. لە پشتیوانیکردنی جێبەجیکردنی سیاسەتدا، دەبێت دەزگایەکی هەواڵگریی بیەوێت تەنیا جەخت لە تێڕامانی خۆی نەکاتەوە لەوەی بۆچی سیاسەتەکە بەهەڵە ئاراستەکراوە یان هەڵەیە.

## هەواڵگریی و "چەرخی زانیاریی"

پێشڤەچوونی خێرا لە بوار تەکنەلۆژیای تایبەت بە بواری پەیوەندیی و گەیاندن وە شیکردنەوەی داتاکان-تەکنەلۆژیای سەرەکی کە لە چەمکی هەواڵگرییدا پێی دەوترێت "چەرخی زانیاریی"- بۆتە هۆی گۆڕانکاری مەزن لەو شێوازانەی کە دەزگاکان مامەڵە لەگەڵ زانیاریدا دەکەن. تەنانەت لەمەش گرنگتر، بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە سەرچاوەی کراوەی

زانیاریش بۆتە دەروازەیەکی تری کاری هەواڵگریی. سەرەڕای بەکارهێنانی ئینتەرنێت، کەوتنی کۆمۆنیزمی سۆڤیەت دەکرێت بە تاکە هۆکاری سەرەکی زیادبوونی سەرچاوەی کراوەی زانیاریی هەژمار بکرێت.

بەشێوەیەکی گشتیتر، پرۆسەی بەناو "جیهانگەرایی" بۆتە هۆی زیادکردنی شەپۆلی زانیاری لە هەموو وڵاتەکاندا وە چەندان کەناڵی نوێی زانیاری دروست کردووە. جیهانگەرایی چەمکێکی ئاڵۆزە؛ دەکرێت بڵێین گرنگترین وەزیفەی بریتییە لە زیادکردنی بازرگانی نێودەوڵەتیی و کرانەوەی سنوورەکان، کە بووە هۆی بڵاوبوونەوەی تێکەڵیی مرۆڤەکان لەسەرتاسەری جیهان. سەرەڕای بازرگانی و بەریەککەوتنی مرۆڤەکانی لە سەرتاسەری جیهان، بڵاوبوونەوەی کەناڵەکانی هەواڵ بۆ سەرتاسەری جیهان تایبەتمەندیەکی تری ئەو جیهانگیرییە بوو(بۆ نموونە، هەبوونی کەناڵی سی ئێن ئێن وە چەندانی تر لە میوانخانەکانی سەرتاسەری جیهان).

تەنانەت بەرلە گەیشتنی سەردەمی زانیاریی، بڕێکی زۆری زانیاری دەگەیشتە داڕێژەرانی سیاسەت لە دەرەوەی کەناڵە هەواڵگرییە تەقلیدیەکانەوە. سەرەڕای ئەمەش، گۆڕانکاری لە ژینگەی سیاسیی نێودەوڵەتی وە ئەو تایبەتمەندیانەی پەیوەندیان بە "شۆڕشی زانیاریی"یەوە هەیە پێمان دەڵێن کە لە داهاتوودا زانیاری زیاتر لە دەرەوەی بازنەی هەواڵگرییدا بەردەست دەبن.

هەرچەندە بوون و زیادبوونی سەرچاوەکانی زانیاری لە دەرەوەی کەناڵەکانی هەواڵگری تەقلیدی دەرفەتی گرنگ نیشان دەدەن بۆ

داڕێژەرانی سیاسەت، بەڵام چەند گرفتێکیش دەمێنیتە ڕۆژەڤی ئەو بوارەوە:

- چۆن شوێنی ئەو سەرچاوانە دیاری بکەین
- چۆن بڕواپێکردنیان هەڵسەنگێنین
- چۆن ئەو زانیاریانە شیبکەینەوە کە وەریان دەگرین وە بیانبەستینەوە بەو زانیاریە بەردەستانە لە ڕێگای کەناڵە هەواڵگرییەکانەوە
- چۆن نهێنییان بپارێزین سەبارەت بەو پرسانەی کە تیایدا سیاسەتمانان بایەخی پێدەدەن.

لەکاتێکدا ئەم پرسانە تاڕاددەیەک نوێن، ئەو پرسیارە قیت دەبێتەوە کە ئایا ئەو گۆڕانکارییەی چەرخی زانیاری هێناویتیە گۆڕێ پێویستیان بە ج میکانیزمێک هەیە بۆ ئەوەی بە شێوازێکی تەندروست مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت. بەتایبەتی ئەو پرسەی کە ئایا داڕێژەرانی سیاسەت پێویستیان بە "شارەزایەکی زانیاریی" هەیە بۆ ئەوەی هاوکاریان بکات بۆ دڵنیاییکردنەوەی ئەو هەموو سەرچاوە کراوانەی کە بەبێ هیچ دەزگایەکی هەواڵگریی بەردەستن؟ لە ئێستادا، ئەمە بە سێ ڕێگای سەرەکی ئەنجام دەدرێت:

- لەلایەن خودی داڕێژەرانی سیاستەوە
- لەلایەن ستافەکانیانەوە
- لەلایەن شیکەرەوە هەواڵگرییەکانەوە.

هەریەک لەمانە هەڵگری سوود و زیانی تایبەتی خۆی هەیە. بێگومان، دارێژەرانی سیاسەت بەرپرسی سەرەکی کردەوەکانیان وە دەبێت متمانەیان هەبێت کە ئەو زانیاریەی وەریان گرتووە بەتەواوی تێی گەیشتوون. بەم پێیەش، بەلایەنی کەمەوە دەبێت هەندێ لە شیکردنەوەکان بەخودی خۆیان ئەنجام بدەن. هەروەها، هەروەک پێشتر باسکرا، دەکرێت دەستیان بە سەرچاوەگەلێکی زانیاری بگات کە کەسانی تر دەستیان پێناگات: پەیوەندی گەیاندنی باڵا لەگەڵ حکومەتەکانی تر، بۆچوون و پلانی خودی بەرپرسە باڵاکانی حکومەتەکەی خۆی وە هەندێک لە کارەکتەر گرنگە ناحکومیەکان (وەک بازرگانە دەوڵەمەندەکان). سەرەڕای ئەمەش، هەندێ لە دارێژەرانی سیاسەت ئەزموونی فروانتریان هەیە لە بواری سیاسەتدا بە بەراورد لەگەڵ شیکەرەوەی هەواڵگریی یان ستافەکەیان.

لەلایەکی ترەوە، دارێژەرانی سیاسەت لەوە سەرقاڵترن کە خۆیان خەریک بکەن بە کۆکردنەوەی زانیاریی و شیکردنەوەوە، تەنیا مەگەر ڕۆژنامە و چەند بابەتێکی گرنگ بخوێننەوە کە پەیوەندیان بە دارشتنی سیاسەتەوە هەیە. زۆربەی ئەو زانیاریەی لەلایەن هەواڵگریی یان ستافەکەیەوە بەو کەسانە دەگات، بێگومان، پێشتر شیکراونەتەوە، جا چ لە ڕێگای زارەکی پێی ڕاگەیەنرابێت یاخود بەشێوەی نووسین پێشکەشی کرابێت.

بەپێچەوانەی بەڕێوەبەرەکانیانەوە، ئەندامانی ستاف کاتیان هەیە بۆ کۆکردنەوە شکردنەوەی زانیاریگەلێکی زۆر و زەوەند کە بۆ پرسێکی تایبەت پێویستە. لەبەر ئەوەی ئەو کەسانە لە پرۆسەی دارشتنی سیاسەتیش دەستیان هەیە، دەبێت بزانن کامە پرس بەکەڵک دێت،

بەدوای چ ئامانجێکدا دەگەڕێن. جگە لە چەند پرسێکی هەستیاری گرنگ، ئەوان بەڕاستەوخۆ تێوەگلاون لە پەیوەندیەکانی بەڕێوەبەرەکانیانەوە لەگەڵ حکومەتەکانی تر یان خودی حکومەتی خۆیان. بەگشتی، متمانەی گەورەکانیان بەدەست هێناوە؛ هەرچەندە هەندێ حاڵەت هەیە کە بەرپرسەکان دەیانەوێت هەندێ کار بەبێ ئاگاداری ستافەکانیان ئەنجام بدەن. سەرەڕای ئەمەش، سەرنجی سەرەکی ستافەکە لەسەر داڕشتنی سیاسەت نییە بەڵکو زیاتر کار دەکات بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و شیکردنەوەیان. بە واتایەکی تر، ستافەکان بەگشتی ئەو بەرپرسیارەتیەیان لەسەر شان نییە بۆ بنیادنانی سیاسەت، وە ئەو شارەزاییەشیان نییە لەو بوارەدا. لەکۆتاییدا، شیکەرەوە هەواڵگرییەکان سەرنجی تەواویان لەسەر ئەرکی زانیارییە وە دوورن لە بەرپرسیاریەتی ڕاستەوخۆ لە شێوازی هەڵبژاردنی سیاسەت. پیشەی سەرەکەی ئەمان هەر لەنێو گۆڕەپانی زانیاریدا قەتیس دەمێنێتەوە.

## هەواڵگریی و دیموکراسیی

### دیموکراسیی و نهێنیکەریی

هەروەک پێشتر باسکرا، هەواڵگریی کێشەیەکی مەزن دروست دەکات بۆ کۆنترۆڵی دەزگا هەواڵگرییەکان لەلایەن سەردار و دەسەڵاتدارە ناهەواڵگرییەکانەوە. پێویستی شەرعی بۆ سنووردارکردنی زانیاری دەربارەی ئۆپەراسیۆنەکان کەمترین ئەو کەسانەت لەنێو بازنەکەدا ڕەنگە هۆکارێک بێت لە ئاسانکردنی کردەی ڕێگاپێنەدراوی شاراوە، و بەمەش، دەسەڵاتدارە ناهەواڵگرییەکان ناتوانن لە پەی بەو چالاکیانە ببەن.

لە وڵاتێکی دیموکراسیدا، نهێنیگەریی کێشەیەکی تریشی هەیە: دەبێت شەرعیەتی سیاسیش لە چوارچێوەی دەزگایەکی هەواڵگرییدا لەبەرچاوبگیرێت. ئەگەر دیموکراسیەت نەک تەنیا بۆ حکومەت بێت بەڵکو بۆ خەڵک و لەوانیشەوە سەرهەڵبدات، ئەوان جێگای سەرسوڕمان نییە کە ئەو دەزگاکەیان بەشێوەیەکی فراوان پشت بە نهێنیگەریی دەبەستن دەبنە کەرەستەی بێ متمانەیی لەلایەن خەڵکەوە. ئەم گومانە تەنیا سنووردار نییە بۆ دەزگا هەواڵگریەکان. بەڵێنەکەی سەرۆک *ودرۆ وڵسن* کە پرسە نێودەوڵەتیەکانی ماوەی دوای جەنگی جیهانیی یەکەم چارەسەر دەکرێت بەهۆی "ڕێککەوتنێکی کراوە،" بووە هۆی ئەوەی گومانی خەڵک بە دبلۆماسیەتی نهێنیی زیاد بێت.

لە پێنج بەشی پێشوودا باسی پێکهاتەکانی هەواڵگریی و هەندێک پرسگەلی تایبەت بە پەیوەندی نێوان هەواڵگریی تەواوی بەشەکانی تری حکومەت و کۆمەڵگا کرد کە بەشێکە لەو مەنزومەیە. ئێستا سەرنج دەخەینە سەر پرسێکی گشتیتری سروشتی هەواڵگریی، لە بەراوردکردنی ئەوەی پێی دەوترێت تێڕامانی "تەقلیدی" هەواڵگریی (کە جەخت لەسەر بەدەستهێنان، پاراستن، وە بەکارهێنانی زانیاری نهێنی پەیوەستدار دەکاتەوە بۆناو ململانێی نێو نەتەوەکان) لەگەڵ ئەو تێڕامانە ئەمریکیە نوێیەی هەواڵگریی کە لەکاتی جەنگی جیهانیی دووەمەوە دروست بووە. مێژووی تێڕامانی "تەقلیدی" دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی زۆر کۆنی بەر لە زایینی، کە لە نووسینەکانی کلاسیکی پەرتوکێکی چینی بەناوی "هونەری جەنگ"، شەش سەدە بەر لە زایین لەلایەن بیرمەندی سەربازیی سون تزو داهێنرا.[i] ناوبراو بەم شێوەیە گرنگی سەرکردەی تێگەیشتوو دەخاتەڕوو:

---

[i] (سون تزو) بە پێشڕەوی سیخوڕی چینی دەژمێردرێت، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە چین پێش ساڵی ٥١٠ پ.ز سیخوڕیان نە زانیوە، بەڵکو تەمەنی سیخوڕی لە چیندا نزیکەی ٢٥٠٠ ساڵە، بەڵام (سون تزو) وەک یەکەم سەرکردە دادەنرێت کە بەشێوەیەکی تایبەتی گرنگی بە هەواڵگری داوەو یەکەم تیۆری هەواڵگری لە چین پێکهێناوە، کتێبێکی بەناوی (بنەماکانی شەڕ) هوە داناوە کە بە کۆنترین کتێب دەژمێردرێ لەبارەی هونەری شەڕەوە بەگشتی کە تا ئەمڕۆ لە ئەکادیمییە

سەربازیەکاندا خوێنەری هەیە، سەرکردەی بەناوبانگی شۆڕشی چینی (ماو سی تۆنگ) لەڕێپێوانە دوورو درێژەکەیدا کەڵکی لەم کتێبە وەرگرتووە، یابانیەکانیش پێش هێرش بردنە سەر دوورگەی (پێرل هاربەر) سودیان لە بنەما جەنگییەکانی ئەم کتێبە وەرگرتووە، ئەم کتێبە کتێبێکی هەمەلایەنی بەسوودە بەرادەیەک سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانی پاش وەرگێڕانی ئەم کتێبەی لە (سیلان) بەسەر ئەفسەرەکانیدا دابەش کردووە لە کاتی شەڕی دووەمی جیهانی تا سوودی لێ ببینن. کتێبەکە سەرچاوەیەکی باشە بۆ ڕوونکردنەوەی گرنگی سیخوڕی و سیخوڕەکان بەسەر پێنج بەشدا دابەش دەکات کە ئەمانەن: ١- سیخوڕەکانی ناوخۆی سەر بە دەوڵەت: ئەو هاوڵاتیانەن کە لەبەرامبەر زانیاریدا پارە وەردەگرن. ٢ — سیخوڕەکانی ناوخۆی سەر بە دوژمن: ئەو خۆفرۆشانەن کە لە ڕیزی دوژمندان. ٣-سیخوڕە هەڵگەڕاوەکان : ئەو بەکرێگیراوەیە کە ڕازیکراوە کار بۆ لایەنێکی بێگانە بکات.

٤- سیخوڕی لە ناوچوو : ئەو بەکرێگیراوانەن کە زانیاری هەڵە دەگەیەنن و کە ئەگەری کوشتن و لەناوبردنی دەکرێت. ٥ — سیخوڕی بەردەوام: ئەو سیخوڕەیە کە ڕاهێنراوە لەو کارەی کە پێی سپێردراوە و جێگای متمانەیە. (سون تزو) لە یەکێک لەو ویلایەتانە لەدایک بووە کە دەکەوێتە ئەو شوێنەی کە ڕووباری زەرد تێکەڵاوی دەریا دەبێت. زۆربەی ژیانی لە خزمەتی (هو_لو) پاشای ویلایەتی (وو) هاوسنوری بەسەر بردووە، کە فەرماندەیی سوپاکەی دەکرد و شاری (ینگ)ی پایتەختی ویلایەتی (تشوو)ی داگیر کرد، پاشان ڕووی لە باکور کرد سوپای هەردوو ناوچەی (چی) و (چین) ی ڕاوناو شکاند، (سون تزو) لەو بڕوایەدا بووە کە هەڵگیرساندنی شەڕ بەرێگایەکی ئابووری و بەرگری کردن لە وڵات پێویستی بە سیستمێکی سیخوڕی بەردەوامە تا چاوەدێری جموجوڵی دوژمنان و هاوسێکان وەک و یەک بکات و ئەو دابەشکردنەشی زۆر بەلاوە گرنگ بووە و کاری سیخوڕیشی بەکارێکی شەریف زانیوە تێبینی ئەوەشی کردووە ئەو کرێگرتانە بەردەوام لە

سەرکردەی دانا و مەزنی سەربازیی ئەوەیە.. دەزانێت چۆن سوود لە خەسڵەتەکانی شوێنەکان و باروبۆخەکان بەباشی وەردەگرێت، یاخود شوێن و باروبۆخی شیاو بۆ خۆی دەخوڵقێنێ، نەک هەر بەتەنێ پشت بە وزە و توانای سەربازەکانی ژێر فەرماندەیی خۆی ببەستێت.

سیخوڕیی کلیلی تێگەیشتنی هەواڵگرییە. بەلەبەرچاوگرتنی پەیوەندیەکی نزیک لە نێوان زانینی نهێنیەکانی دوژمن و سەرکەوتن بەسەریدا، سەرکەوتن نزیکە، بەڵام پاراستنی ئەو نهێنیانە (دژەهەواڵگریی) بەقەد بەدەستهێنانی نهێنی دوژمن گرنگە.
ئامانجی سەرەکی ئەم سیخوڕییە بریتییە لە تێگەیشتن لە ستراتیژیەتی دوژمن بەشێوەیەکی وا چاک کە بتوانرێت ئەو ئامرازانەی ئەوان هەیانە لە دژیان بەکاربهێنرێت وە لە کۆتاییشدا بە کەمترین تێچوو شکستیان پێ بهێنرێت. لە ڕوانگەی سون تزو، کە پێی وایە بەزاندنی ستراتیژیەتی دوژمن گرنگترە لە بەزاندنی سوپاکەی، پێکهاتەی هەواڵگریی وەک پێکهاتەی سوپایی گرنگە:

---

سەرکردە سیاسیەکان و فەرماندە سەربازییەکان نزیک بکرێنەوە، (سون تزو) لە کتێبەکەیدا ئەوەی ڕاسپاردووە کە دەبێ بەکرێگیراوە هەڵگەڕاوەکان بەباشی لەگەڵیاندا هەڵسوکەوت بکرێت، خانوی باشیان پێبدرێت، جارجارەش پارەی چاکیان لە باخەڵ بنرێت، چونکە دەبێتە هۆی پابەند بوونیان بەفەرمانەکانەوە، هەوڵی ئەوەش بدرێت کە بەرپرس و فەرماندەکان بۆ ناو تۆڕە سیخوڕیەکان ڕابکێشرێت.

> ئەوەی زۆر گرنگە لە جەنگدا هێرشکردنە سەر ستراتیژیەتی دوژمنە؛ پاشان پەککەستنی گەیشتنی هاوکاری لە هاوپەیمانەکانیەوە؛ دواتر هێرشکردنە سەر سوپاکەی باشترین چارەسەرە.

جەنگی هەواڵگریی بەقەد مەیدانی جەنگ کار و خەباتی دەوێت؛ تەنها جیاوازیەکە ئەوەیە کەرەستە بەکارهێنراوەکان لە هەردوو جەنگەکەدا جیاوازن.
لە وتارێکدا کە داوای "پێشکەوتنی سیستەمێکی هەواڵگریی ئەمریکی دەکات،" *ویلیام کۆلبی* بەڕێوەبەری پێشووی سی ئای ئەی بەم شێوەیە وەسفی هەواڵگریی دەکات:

> بۆماوەی چەندین سەدەدە، هەواڵگریی بچوک بوو، تایبەت بوو بە شانشینەکان و جەنەراڵە سەربازییەکان. سیخوڕی سەربازیی و حکومەی نهێنی هێزەکانی تریان بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی بە بتوانن بەسەر دوژمندا زاڵ بن. هەواڵدۆزی نهێنی فێڵیان بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی دوژمنێک لاواز بکەن یان پشتیوانی نەیارانی ناو خودی هێزەکەیانیان دەکرد. سیخوڕەکە نموونەی دیسپلینی ئەم "هەواڵگریی"یە تەقلیدیە بوو.

لە شوێنێکی تردا، *کۆلبی* بەم شێوەیە پێناسەی هەواڵگری تەقلیدی دەکات: "هەواڵگری تەقلیدی بریتییە لە بەدەستهێنانی پلانی نهێنی دوژمن و پێدانی بە پاشا بۆ ئەوەی بتوانێت جەنگێک بباتەوە." ناوبراو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەزموونی ئەمریکا لە ماوەی جەنگی دووەمی

جیهانیدا بۆچوونێکی نوێی هەواڵگریی بەخۆیەوە بینی کە بەرەنگاری بۆچوونی "تەقلیدی" بووەوە لە چەندین ڕووەوە. لەماوەی دوای جەنگدا، ئەم تێڕامانە بەردەوام بوو لە پەرەسەندن لە هەردوو هەواڵگری ئەمریکا وە لەناو هەندێ قوتابی ئەکادیمی ئەو بوارەدا. ئامانجی ئەم برگەیە ئەوەیە گفتوگۆیەکی تێروتەسەل لەبارەی ئەو تێڕامانە نوێیە بداتە دەستەوە و بەراوردی بکات لەگەڵ تێڕامانی "تەقلیدی".

## پەرەسەندنی مێژوویی تێڕامانی ئەمریکی

ئەو دۆخە نالەبارەی بەهۆی دەستپێکردنی جەنگی جیهانیی دووەم و چوونی درەنگی ئەمریکا بۆناو ئەو جەنگە بووە هۆی زیادبوونێکی بەرچاو لە سەرچاوەکان کە ئەمریکا بۆ هەواڵگریی تەرخانی کرد. هەروەها بووە هۆی پەرەسەندنێکی نوێی بیرۆکراتی، واتە دروستبوونی دەزگای هەواڵگریی ناوەندی کە ئامانجی کۆکردنەوە، شیکردنەوە، وە هاوپەیوەندی زانیاری و داتای ئاسایشی نیشتیمانی بوو. سەرەڕای بڕیارەکەی سەرۆک *فرانکلین ڕۆزڤێلت* لە تەمموزی ١٩٤١ بۆ دروستکردنی ناوەندێک بۆ بەستنەوەی زانیارییەکان، هیچیان هێشتا دروست نەببوون تا کانوونی یەکەمی ١٩٤١، کاتێک شکستی پێشبینیکردنی هێرشی ژاپۆنیەکان بۆ سەر پێرڵ هاربەر ڕوویدا کە هۆکاری سەرەکی نەبوونی هاوپەیوەندی و شیکردنەوەی هەواڵگریی بوو، چونکە بڕێکی زۆری زانیاری هەواڵگریی لەوکاتەدا کۆکرابوونەوە.

## ناوەندێتی شیکردنەوە

دەزگای هەواڵگریی ئەمریکا هەرچەندە نەیتوانی ئامانجی سەرەکی خۆی لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا بپێکێت، بەڵام لەساڵی ١٩٤٧دا دەزگای هەواڵگری ناوەندیی (سی ئای ئەی) دروستکرا. ئامانجی ئەم دەزگایە بریتیی بوو لە کۆکردنەوە زانیارییەکان و شیکردنەوەیان لەژێر یەک چەتری کۆکراوەی ناوەندیدا کە هەموو زانیارییەکانی پەیوەستدار بە دەرەوەی ئەمریکای تیادا کۆبکرێتەوە و هەر لەوێشدا شیکردنەوە و دەرئەنجامەکەی بخرێتەڕوو بۆ ئاراستەکردنی سیاسەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە. بێگومان، یەکێک لە هۆکارەکانی دروستکردنی ئەم دەزگایە بریتیی بوو لە دەربازبوون لەو فۆرمە تەقلیدیە هەواڵگرییەی کە ئەو وڵاتە هەی بوو بۆ فۆرمێکی نوێتر. ئەم تێڕامانە نوێیە سەرنجی کەمتری لەسەر نهێنیگەریی و ئامرازەکانی سەرکەوتن بەسەریدا بوو وە زیاتر بایەخی بە وەزیفەی شیکاریی، وە تەڵەکبازیی دەدا.

ئەم تێڕامانە هەر یەکسەر دوای جەنگی جیهانیی دووەم لەلایەن *شێرمان* کێنت‌ەوە هێنرایە ڕۆژەڤی هەواڵگرییەوە. پەرتووکە بەناوبانگەکەی لەژێر ناونیشانی "هەواڵگری ستراتیژیی بۆ سیاسەتی جیهانیی ئەمریکی" جەختی سەرەکی لەسەر تێگەیشتن لە هەواڵگریی وەک میتۆدێکی زانستی (لە زانستی کۆمەلایەتی) دەکاتەوە، ناوبراو لە بەشێکی پەرتووکەکەیدا دەڵێت:

> توێژینەوە تاکە پرۆسەیە کە بتوانێت ئێمەی تەقلیدی لە جیهانێکی هەواڵگریی کۆنەوە بگوازێتەوە بۆ دەرخستنی ڕاستیی جیهانی هەواڵگریی مۆدێرن، زیاتر نزیکمان دەکاتەوە لە ڕاستی، بە بەراورد لەگەڵ ئەو حاڵەی ئێمە ئیستا تێی کەوتووین لەدەست هەواڵگریی

> کۆن... ئێمە پێ لەسەر ئەوە دادەگرین، کە چەندین ئەوەی یەک لەدوای یەکە هەر ئەم کارەمان کردووە، کە هەر لە ڕێگای توێژینەوەوە کە بەهۆی میتۆدی سیستەماتیک ڕێنمایی کراوە، دەتوانین بە ڕاستیەکان بگەین. بەڵێ، تەنیا لە زانستەکانی کۆمەڵایەتی دەتوانین دەستمان بەو میتۆدە بگات. ئەم میتۆدە زیاتر وەک میتۆدی زانستی فیزیایە. هەمان میتۆد نییە بەڵام سەرەڕای ئەمەش میتۆدێکە.

گومانی تیادانییە کە زانستی کۆمەڵایەتی ناتوانێت ببێت بە هەموو هەواڵگریی، سەرەڕای ئەوەی کە بە دڵی هەواڵگریی دادەنرێت. دەبێت داتا هەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت کاری خۆی بکات. لەکاتێکدا دەزانرێت کە دەبێت هەندێ داتا بەڕێگای کاری نهێنییەوە بەدەست بهێنرێت، کێنت جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە تێڕامانی دیاری هەواڵگریی وەک مامەڵەکردنێکی سەرەکی لەگەڵ نهێنیدا تەنیا ئەفسانەیەکە. بۆ بۆچوونی ناوبرا، لەجیاتی ئەم شیکردنەوەی هەواڵگریی دەتوانێت پشت بە زانیاری نانهێنی وە بەردەست ببەستێت، بە ژمارەیەکی کەمی زانیاری نهێنی وەرگیراو لەڕێگای کاری نهێنییەوە. ناوبراو لە نووسینەکانیدا ئاماژە بەوەدەدات کە "هەندێک لەم زانیارییە دەکرێت لەڕێگای کاری نهێنییەوە بەدەست بێت، بەڵام زۆرینەی هەرەزۆری دەبێت لەڕێگای چاوەدێری کراوە و لێکۆڵینەوە بەدەست بهێنرێت.

## سیخوڕیی و کۆکردنەوەی زانیاری تەکنیکی

گرنگ نییە کە تا چ ئەندازەیەک پرۆسەی شیکردنەوەی بۆ دەزگایەکی هەواڵگریی جێی بایەخ بێت، دەبێت زانیاری سەرەتایی بۆ شیکردنەوە لە شوێنێکەوە بهێنرێت. لەکاتێکدا هەندێ لەم زانیارییانە لەڕێگای سەرچاوەی کراوە (پەرتووک، ڕادیۆ وە تەلەفزیۆن، گۆڤارەکان) بەدەست دێن، هێشتاش ئەو ڕاستیە وەک خۆی دەمێنێتەوە کە هەندێ نەتەوە ڕاستی سەرەتاییش لە بارەی هێزە سەربازییەکانیان یاخود سەرچاوە ئابوورییەکانیان ئاشکرا ناکەن کە پشتیوانیان دەکەن. بەم پێیەش، تەنانەت ئەگەر تێڕامانی کێنت دەربارەی گرنگی ڕێژەیی سەرچاوەکانی کراوە و نهێنی ڕاستبوایە بۆ دەوڵەتێکی ئاسایی، ڕوونە کە ڕاست نییە بۆ وڵاتێک کە هەموو زانیاریەکانی هێزە سەربازییەکانی وڵاتەکەی ئاشکرا بکات.

ڕێوشوێنە توندە ئەمنیەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران، لە دوای جەنگی جیهانیی دووەم، کارەکەی بۆ ئەمریکا و هەندێ وڵاتانی تری ڕۆژئاوا قورس کرد سیخوڕی بەکاربهێنن بۆ بەدەستهێنانی زانیاریی سەبارەت بە هێزە سەربازییەکانی سۆڤیەت. هەروەک پێشتر باسکرا، ئەم گرفتە بەشێوەیەکی سەرەکی بەهۆی پەرەسەندنی ئەو وڵاتانەوە لەڕووی کۆکردنەوەی زانیاریی هەواڵگری تەکنیکیەوە چارەسەرکرا کە جۆرە ئامێرێکیان بەرهەم هێنا دەیتوانی بەسەر ئاسمانی سۆڤیەتدا بفڕێت سەرەتا فڕۆکەی (U-٢)، پاشان سەتەلایەتی چاودێریی.

ئەم ئامرازە تەکنیکیانە نەک تەنیا لە سیستەمی بەرگریی سۆڤیەت چاکتر و پێشکەوتوو تر بوو بەڵکو کێشەی تری سیخوڕیشی چارەسەر کرد. ئەو

سەرنجە سەرەکیەی کە بەر لەم دامێنانە دەخرایە سەر سەرچاوەی مرۆیی و مەترسیەکانی، بەهاتنی ئەم ئامێرانە ئیتر کێشەکە بنبڕکرا. لە هەمانکاتدا، دەستکەیشتن بە شوێنێکی دیاریکراو لە ڕێگای وێنەگرتنەوە چیتر وەک ئەفسانە نەما. هەربەم هۆیەشەوە، هەواڵگری تەکنیکی زیاتر متمانەی پێکرا بە بەراورد لەگەڵ کۆکردنەوەی زانیاری بەهۆی سەرچاوەی مرۆییەوە.

ئەنجامی ئەم جۆرە هەواڵگرییە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەرە، بە هۆکاری ئەم پێشەکەوتنەش بەزۆری دەدرێتەپاڵ ئەمریکا کە توانی لە دوای جەنگی جیهانیی دووەمەوە بەتەواوی کەموکورتیەکانی کۆکردنەوەی زانیاری لە سەرچاوەی مرۆییەوە داپۆشێت. ئەمە وای کرد هەواڵگریی لە بەرگێکی زیاتر زانستیدا خۆی ببینێتەوە، نەک تەنیا لەبەر ئەوەی چونکە پێویستی بە دوایین و پێشکەوتووترین تەکنەلۆژیا بوو بەڵکو لەبەر ئەوەش بوو کە چونکە زانیاری مرۆیی بەئاسانی دەتوانرێت پێچەوانە بکرێتە لەدژی دەزگایەکی هەواڵگریی یان تەنانەت لەدژی خودی ئەو دەزگایەش بەکاربهێنرێت (لەڕێگای سیخوڕی دووسەرەوە).

## کەمبوونەوەی گرنگی دژەهەواڵگریی

یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی تێڕامانی نوێی هەواڵگریی بریتییە لە کەمکردنەوەی گرنگی بایەخی دژەهەواڵگریی بەشێوەیەکی گشتی، بە فریودان و دژەفریودان بەشێوەیەکی تایبەتیی. ئەمە نزیکە لەو بیرۆکەیەی کە هەواڵگریی جۆرێکە لە زانستی کۆمەڵایەتی، کە لە وڵاتانی بیانی دەکۆڵێتەوە. هەرچەندە کاری هەواڵگریی لەچەند ڕوویەکەوە جیایە لە

زانستی کۆمەڵایەتی، هەردوو هەوڵەکە، بەپێی ئەم تێڕامانە، بە یەکسانی دەمێننەوە.

جیاوازیی هەردوو تێڕامانەکە خۆی لە گرنگی نهێنیکەرییدا دەبینێتەوە سەبارەت بەوەی کە پێناسەی هەردووکیان بۆ هەواڵگریی چییە. بەگوێرەی تێڕامانی تەقلیدی، ئەگەر هەواڵگریی بەشێک بێت لە هەوڵی ڕاستەقینە لەگەڵ دوژمنانی مرۆڤ نەوەک تەکنیکی، ئەوا دەتوانین بڵێین کە بەگوێرەی ئەم تێڕامانە، هەواڵگریی، وەک زانست بەشێوەیەکی گشتی، بریتییە لە پرۆسەی دۆزینەی ڕاستیەکان دەربارەی جیهان (یان سروشت) کە تەنیا بە خوازراوی پێی دەوترێت هەوڵدان. بەواتایەکی تر، لەکاتێکدا چەندین نهێنی سروشتی هەن، بەڵام وەک زانیاری شاراوە هەژمار ناکرێن؛ بەڵکو ئەمانە تەنیا زانیاریگەلێکن کە هێشتا نەماندۆزیونەتەوە. سەبارەت بە دۆخی داهاتووی ئابووریی یان کۆمەڵایەتی، هێشتا هیچ نهێنیەکی دروست ناتوانرێت بەدەست بهێنرێن، چونکە خودی دوژمنەکە هێشتا دڵنیانییە لەوەی کە لەوکاتەدا چی دەقەومێت، یان چ بژاردەیەکی لەبەردەست دەبێت وە تووشی چ دۆخێک دەبێتەوە.

## کۆتایی

<u>**وەرگێڕ لە چەند دێڕێکدا:**</u>

لە ساڵی ١٩٨٦ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دایکبووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە شاری سۆران تەواو کردووە. لە ساڵی ٢٠١٠ کۆلێژی زمان، بەشی ئینگلیزی، زانکۆی سەلاحەددینی تەواو کردووە، هەڵگری بڕوانامەی ماستەرە لە پەروەردەی ئینگلیزیدا.

بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی:

- *دووڕگەی گەنجینە* (٢٠١٢)
- *جووڵەکەکانی کوردستان، مێژووی ژیان و پەیوەندییان لەگەڵ کوردەکاندا*. دەزگای ئاوێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات. هەولێر٢٠١٥
- *ترس لە مردن، حەقیقەت یان خەیاڵ؟* دەزگای ئاوێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات. هەولێر ٢٠١٦.
- *بەهاری کوردی، نەخشەیەکی نوێی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست*. دەزگای ئاوێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات. هەولێر ٢٠١٦.
- *داعش، دەوڵەتی تیرۆر*. دەزگای ئاوێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات. هەولێر ٢٠١٧.
- *لۆبی ئیسرائیل و سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا*. دەزگای ئاوێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر ٢٠١٧

خاڵی پەیوەندی:

ئیمەیل: Serwanbiyaye@gmail.com

فەیسبووک: Serwan H. Biyaye

**تێبینی**: بەشێک لەو ڕوونکردنەوە کوردیانەی لە پەراوێزەکاندا خراونەتەڕوو، سەرچاوەکەیان لە (پێگەی هەواڵگریی و جیهان)ەوە هەڵقولاوە.

# ئیندێکس

## ئا

زوور سپاس بو به
رێزسیروان وه
رگێری ئه م کتێبه
بو وته جوانه
کانت

**Serwan Biyaye**

مادام کردتانه پی دی ئێف دهستتان خۆش بێت، هەرچەندە زۆر
ماندوو بووم به وەرگێرانەکەی، بەلام دهستتان خۆش بێت

ئەم پەرتووکە:

"باشترین سەرچاوەیە بۆ ئەو خوێنەرانەی کە تازە دەست دەکەن بە فێربوونی جیهانی راستەقینەی کاری هەواڵگریی."

ڕۆبن وینکس، مێژوونووس و دیپلۆماتکاری ئەمریکی.

"چەندین نهێنیی لەخۆدەگرێت... بەڕاستی، شایەنی خوێندنەوەیە."

ڕەی کلاین، جێگری پێشووی بەڕێوەبەری (CIA)

چاپی یەکەم ۲۰۱۸





AWER 431

ئۆفیسی ئاویر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە